مێرزا محمد امین – مەنگوڕی

# بەسەرهاتی سیاسی کورد

## لە ١٩١٤ وە هەتا ١٩٥٨

## بەشی یەکەم

چاپی دووەم

سلێمانی/ ٢٠٠٠




ناوی کتێب :بەسەرهاتی سیاسی کورد لە ١٩١٤-ەوە هەتا ١٩٥٨-بەشی یەکەم

ناوی نووسەر :میرزا محمد أمین مەنگوری

بەشی یەکەم

چاپی یەکەم :سوید-١٩٩٩

چاپی دووەم :سلێمانی-٢٠٠٠/ لەسەر ئەرکی بەڕێز دارا مەجید خان چاپکراوەتەوە

ژمارەی سپاردن : بەپێی بڕیاری وەزارەتی رۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان ، ژمارە ( ١٥٤ )ی ساڵی ٢٠٠٠ پێدراوە.

چاپخانەی روون-سلێمانی

چاپی یەکەم/ سوید/ ١٩٩٩

چاپی دووەم/ سلێمانی/ ٢٠٠٠

# میرزا محەممەد ئەمینی مەنگوڕی وئەم بەرهەمەی

مەحمود مەلاعززەت
ئاگوستی ١٩٩٩- سوید

کەم کەس هەیەئاشنای بوارەکانی نوسین وبەرهەمی میرزامحەممەد ئەمین مەنگوڕی بێت. چونکە لای هەندێک وەک شاعیرناسراوە، لای هەندێکی تروەک چیرۆک نوس یان ئەکتەری سەرشانۆ. یاتۆمارکاری بیرەوەری وگەلێ ڕوداوو دیاردەی سەردەمی کۆماری مەهاباد و ڕۆژگاری ڕوخاندنەکەی وکارەساتەکانی. وەیاخود وەک مێژونوس ناسراوە. بەتایبەتیی زۆر لە نوسینەکانی هەروا بەدەستخەت ماونەتەوە، ئەوانەشی کەڕوناکییان بینیوە لەسنورێکی تەسکدا بڵاوکراونەتەوە.

ئەزمونەکانی ژیانی کولتوری وکۆمەڵایەتی وسیاسیی، هاوبەشیکردنی لەگەڵەک ڕوداوی گرنگی وەک کۆماری کوردستان وشۆڕشی ئەیلول، تێگەیشتنی هەندێ لایەنی کۆمەڵگەی کوردەواری وگرفتە کۆمەڵایەتییەکانی.. ئەوانە هەوێنی کۆبونەوەی ئەو بەهرانە بون لای میرزا.

سەرەڕای ئەوانە ناوبراو مرۆڤێکی کۆمەڵایەتیی، دنیادیدە و دڵ تەڕ و جوانیی پەرست بو. بەپەرۆش بو بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی وسەرفرازبون و نەهێشتنی دەرد و کێشەکانی گەلەکەی..ئەو خواست وحەزانەش بونە دەردەسەری وسەرئێشە و دورخستنەوە لەماڵ ومنداڵ و جێگەی خۆی بان گرتن و زیندانیکردن و کەوتنەبەردەم هەڕەشەی کوشتن.

میرزا "محمد امین احمد -مەنگوڕی "لەساڵی ١٩١٠ لەشاری قەڵادزە

لەدایک بووە. لەحوجرەی مەلامحەمەدی دیلۆی خوێندویەتی. پۆلی شەشەمی سەرەتایی لە خوێندنگەی (نموذج السعادة) لەسلێمانی تەواوکرد. لەتەمەنی حەڤدە ساڵیدا دەستی بەنوسینی شیعرکردووە.

لەساڵی ١٩٣٠دا کاری نوسینی نوسینی بۆمامەندئاغای سەرۆکی عەشیرەتی ئاکۆ دەکات، هەربەو بۆنەیەشەوە مامەندئاغا نازناوی میرزای لێ دەنێت. ساڵی ١٩٣٢بەقۆڵچیی نیستیهلاک لەگوندی خدران لەناوچەی بیتوێن دادەنرێت. هەر لەو ساڵەدا دەچێتە سلێمانی و بەپۆلیس دادەمەزرێت. لەو ڕێکخراوە سیاسییانەی لەسییەکاندا دامەزرێنران، هاوبەشی کردووە، بەتایبەتی لە"برایەتی"دا.

ساڵی ١٩٣٧ یەکەمین بەرهەمی لەژێرناوی(هەنگاوێک بۆ سەرکەوتن) بەناوی (م.م. پشدەری) بلاوکردەوە. (نوسخەیەکی ئەوکتێبە لەکتێبخانەی گشتیی لەسلێمانی دەستدەکەوێت) لەسەر ئەو کتێبە شەش مانگ زیندانیی و یەک ساڵ چاودێری کراوە ولەکاری پۆلیسیش دەردەکرێت. ئینجابوە بە فەرمانبەر لە شارەوانی ودوایێتر لەئاو و کارەبای چوارتا..

لەئەزموونەمێژوویەکەی مەهابادا "١٩٤٦" هاوبەشییەکی چاوێنیی کرد. ئەم جێگەی متمانە و نوسەر و هەندێک جاریش جێگری جەنراڵ حەمە ڕەشید خان بوکەفەرماندەی هێزی بۆکان ومەنتیقەی بو لەسەرلو یەکێ بو لە کاربەدەستە سەربازییە بەهێزەکانی سوپای کۆماری کوردستان. هەر لەبەر ئەوەش بوکەزوربەی هەرەزۆری نامەکانی حەمەڕەشید خان وفەرماندەیەتییەکەی بەدەست وخەتی میرزامەنگوری نوسراون هەروەک لە هەرسێ بەرگەکەی دەوڵەتی جمهوری کوردستان کەلەساڵانی(١٩٩٢ ،١٩٩٥ ١٩٩٧) بەچاپم گەیاندوون، دەردەکەوێت.

-ساڵی١٩٧١کتێبی(گەشتی ئەستێرەی مەریخ) بلاودەکاتەوە.

لەسەرئەوکتێبەدوچاری چەرمەسەرییەکی زۆرکرا، لەقەلادزە دەرکرا و بۆ تەوێڵە

دورخرایەوەودەست بەسەرکتێبەکەشدا گیرا و ماڵەکەیان بەردەباران کرد. بەوانەش لەکوشتن سەرفرازبو، چونکە هەندێ مەلاپەرولخید تاوانباریان کرد.

- لە١٩٧٤دالەنوێیەوەی شەڕی نێوان کوردوبەعسدادەچێتەچیا و ئینجا لەنۆردوگای سەریاس کات بەسەردەبات. دوای هەرەسەکەی شۆڕشی ئەیلول (ئازاری ١٩٧٥) دەگەڕێتەوە سلێمانی.

- لەگەڵێک کۆڕوکۆبونەوەداهاوبەشیی کردووە، یەکێک لەوکۆڕانەکە بۆسێ ڕۆژ درێژەی هەبو، ئەومیهرەجانەبوو شیعریەبوکە یەکێتی نوسەران لەهاوینی ساڵی ١٩٧٨دا لە سلێمانی سازی کرد،کەبو بە خۆپیشاندانێکی نیشتمانیی ئەوتۆکەشاعیرانی هاوبەش تێیدا نەترس و ئازایانە و زۆر بەئاشکرا و بەبەرچاوی لێپرسراوانی بەعسەوە،کەبۆ میهرەجانەکە دەعوەت کرابون،بەچەکی وشەی ڕەسەنی کوردیی بەرەنگاری ڕژێم دەبوونەوە ودەچوون بەگژ کار و کردەوە فاشیستانەکەیدا. من بۆخۆم کەلەهەرسێ ڕۆژەکەدا وەک گوێگرێک هاوبەش بوم،وام لێکدەدایەوە کەنەک هەر کڵۆرخاوەن شیعرەکان بەڵکو زۆرکەس لەگوێگرەکانیش توشی گرتن و چەرمەسەری دەبن. لەڕاستیشدا ئەوجۆرە میهرەجان وکۆڕوکۆبونەوە شیعری و چیرۆک و شانۆگەرییانە،کە بەرهەمی قەڵەمە نەترسەکان بون، لەدوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول، ڕۆڵێکی زۆرگەورەیان لەهۆشیارکردنەوە و بەرێنکردنی گیانی بەربەرەکانیی دژ بە هێرشی ڕاگواستن و بەبەعسی و بە عەرەبکردن بینی کەئەوانە بۆخۆیان لایەنی یەکەمی شۆڕشی جەماوەر و ئاوێنەی مەزنیی خەباتی ئەوسەردەمەبون.

میرزامەنگوری لە شەوی۱۲-۱-۱۹۸۸کۆچی دوایی دەکات و لەگردی سەیوان دەنێژرێت. لە۱۹-٦-۱۹۹۲ لەسەر ڕاسپاردەی خۆی تەرمەکەی بەچیای کێوەڕەش دەسپێرن.

میرزا مەنگوڕیی سێ ژنی هێنا، لەدوای خۆشی (ڕابیعە)خانی ژنی و٤ کوڕو ۹ کچی لەژیاندا بەجێ دەهێڵێ

بۆ پێشکەشیی ئەم بەرهەمە مێژوییەی میرزا محەمەد ئەمین مەنگوڕی"بەسەرهاتی سیاسی کوردلە ۱۹۱٤وە هەتا ۱۳تەموزی ۱۹٥۸- بەرگی یەکەم" جگەلە پێشچاوخستنی کورتەیەک لەژیانی و بەر هەمە چاپکراو و چاپ نەکراوەکانی، دەبو بەسەرکردنەوەیەکی گشتیی بەرهەمەکە و نرخاندنێکی زانستیانەش بکرایە، تا ڕوناکیی بخرایەتە سەر لایەنە پۆسەتیڤ و نەوکەمی و بۆشاییانەش کە لە بەرهەمەکەدا دەبینرێن.

بەڵام لەبەرئەوەی لەو باسە دوورودرێژەی بۆ بەرگی سێیەمی دەوڵەتی جمهوری کوردستان (ئێستۆکهۆڵم (۱۹۹۷)م نوسی. لەهەندێک ڕووەوە بەرهەمەکەی نوسەر بەسەرکراوەتەوە و ڕوناکیی خراوەتە سەرهەندێ لایەنی کتێبەکە (بڕوانە ل.:٦۸۳-٦۸٤،٧۲٦-٧۲۹،٧۳۱ -٧۳٦ ).

لەبەرئەوانە بە پێویستم نەزانی ئەو زانیاریانە دووبارە بکەمەوە. وە ئەو کارەش بۆ پسپۆڕانی تری مێژوی کۆماری کوردستان بەجێ بهێڵم. ئەوەندە نەبێ کە لێرەدا بڵێم: لەو یاداشت و بیرەوەرییانەدا لەسەر ئەزموونەکەی مەهاباد، میرزا گەلێ لایەنی گرنگی بەسەرکردۆتەوە: سیاسیی، سەربازیی، کۆمەڵایەتی، ئابوری، کولتوریی، ناکۆکییەکان، کەموکورتی و بۆشاییەکان، کە زۆریان جێگەی مشتومڕو لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنن کە تیایاندا دروست و نادروست، لەبار و

ناڕاستەکان جیابکرێنەوە و بابەتی و زانستیانە بنرخێندرێن..

## چۆن ئەم کتێبە بە چاپ گەیەنرا..؟

لەسەردانێکمدا بۆ لەندەن (ئاگۆستی ١٩٩٦) لەباس وخواسی ڕووداوەکانی لەمەڕمەهاباد لەگەڵ کاک نەوشیروان مستەفا، باسی ئەوکتێبەی مەنگوڕی هێنایە پێشەوە کە ئەگەرسوودی لێ وەردەگرم را دەتوانم وەری بگرم. کەپەرەپەرەم کرد بابەخی نوسینەکەم مەزنە کرد و گوتم لەگەڵ خۆم دەیبەم. گوتی ئەگەر حەزدەکەیت باهەرلای خۆشت بمێنێتەوە، خۆئەگەردەرفەتێک ڕەخسا و پێت باش بو وا دەتوانیت بەچاپکردنیشی بگەیەنیت. ئەوەی لام ناخۆش بو باسی قەوتانی بەرگی دووەمیشی کرد.

بەڵام لە سەردانەکەی هاوینی ساڵی "١٩٩٧"م دا بۆ سلێمانی و سەردانی بنەماڵەکەی مەنگوڕی، لەگەڵ زۆر بەرهەمی شیعر و مێژوودا، بەرگی دووەمی ئەم کتێبەشیان پێشان دام کەکاتی خۆی شێرکۆ وای زانیبو کەفەوتاوە. هەروەک بە نەوشیروان دەڵێت و لەیەکێک لەنامەکانیشیدا هەر بەو جۆرە چارەنوسی ئەو بەرگی دووەمە بۆ منیش باس دەکات. هەر بەو هۆیەشەوە بووکە لەبەرگی سێیەمی د.ج.ک داچارەنوسی ئەوبەرگی دووەمەم بەوجۆرە خستبووە پێش چاو. ئیترشێرکۆ دلسۆزانە کۆپییەکی ئەوبەشانەی بەرگی دووەم کەپەیوەندییان بەڕووداوەکانی مەهاباد و ڕوخاندنەکەیەوە هەیە، لەڕێگەی "لەندەن"ەوە و بە هۆی کاک فەرەیدون عەبدولقادرەوە گەیاندە دەستم کە بەداخەوە بواری ئەوە نەڕەخسا لەگەڵ ئەم بەرگی یەکەمەدا کۆمپیوتەر بکرێت و بکەوێتە تەک ئەم بەرگی یەکەمە.[1]

---

[1] لەم دواییەدا بیستم کە شێرکۆ ئەو بەرگی دووەمەی لە سلێمانی بە چاپ گەیاندووە. لە ڕاستیدا دەمرو لە مێژووە ئەم بەرگی یەکەمە ڕوناکی بینایە، بەڵام کێشەی چاپ و چاپخانە

کارەکەی وا دواخست.

میرزا مەتگوڕیی خاوەنی بەرهەمێکی زۆری شیعر و مێژووە کە زوربەیان

بەدەستخەت ماونەتەوە

ئەوانەی تاتیستا ڕوناکییان بینیوە:

| | |
|---|---|
| ١-هەنگاوێک بۆ سەرکەوتن | ١٩٣٧ |
| ٢-چیرۆکی ماهراکۆ | ١٩٧١ |
| ٣-چیرۆکی زێرینا نامێدی | ١٩٧١ |
| ٤-گەشتی ئەستێرەی مەریخ | ١٩٧١ |
| ٥-چیرۆکی فەرۆزخانی پشکۆ | ١٩٧١ |
| ٦-چیرۆکی بوکێکی ناکام | ١٩٧١ |
| ٧-بەسەرهاتی ئەرمەن | ١٩٩٢ |
| ٨-کۆنگرێسی دوڕوندەو ئاژەڵ | ١٩٩٢ |

٩- بەسەرهاتی مەنگوڕی کە بە دە ئەڵقە لەڕۆژنامەی کوردستانی نوێ -سلێمانیی- بڵاوکراوەتەوە.

لەبەرهەمە چاپ نەکراوەکانیشی:

١-جیهانێکی ئازاد - شیعر

٢-بەهەشتی دلداری - شیعر

٣-بەسەرهاتی سیاسی کورد ١٩١٤-١٩٥٨ بەرگی دووەم، ١٩٥٨-١٩٨١

٤- مێژووی کوردو کوردستان لەئیسلامەوە تا١٩٧١

٥-دەستوری ژیان - شیعر

٦-جیهانێکی بەپێکەنین - شیعر

٧-چیرۆکی ناران پور

٨-چیرۆکی بەسەرهاتی نەریمان بەختیاری

٩-بەسەرهاتی ناسوری

١٠-نەلسەفەی بەسەرهاتی نارات پورر

١١-شەوێک لە عسبەالامم - شیعر

١٢-خالیق وخەلیقەت

١٣-خەونی چونەبەهەشتی مەنگوری

٤

میرزا مەنگوری لەهەڵبەستدا، زیاتر لەبوارەکانی تر، نەسپی خۆی تاوداوە و
بەرهەمە دەستنوسانەی لەدوای خۆی بەجێهێشتووە.
ئەمانەش نمونەیەکی شیعرەکانیتی:

(شیعری دلداری: ١)

مای تیری هەناسەی من، وەلاچوروهەوری زولفانی

لەتورەی(مەسجد الاقصی)درەخشا سوبحی خەندانی

بە(سبحان الذی یسری)لەمەعبەدگاهی سەرکولمی
دڵم ڕوی کردە (ئەوسێن) برۆی تا تیری موژگانی

بەپەیکانی سەری پەنجە شکاندی حورمەتی موسی
بەلێوانی (نەسخ) کرد ئایەت و ڕەوتی موسڵمانی

لیلەی نەخشی سەرسنگی بە هەشتی کرد بە وێرانە
لەهەرسێ قیبلە ڕووم لادا کەدیم مەمکی درەخشانی

بەشمشێری برۆی شەق بێ سەری مەنکوڕ نەکەر نەختێ
لە قانونی عیشق لادا ، نەکا دینی بەقوربانی

٥

بۆ میدیای زەندی- ٢٥-٧-١٩٧٤

دڵەتۆراوەکەم

دڵێکم بوو ئەویش ڕای لەدەستم
فڕی بۆ باوەشی دڵداری نەستم
بەهەرتەرزێ بەسەریادێم ئەتۆرێ

نەڵێن ئاهێنمەوە لەم ژینە بەستم

هەتاماوم لەباڵای سەرووی دڵبەر

هێلانەی پڕ لەدڵداری نەبەستم

بەناڵی لێو و کوڵم و چاوی کاڵی

نەکەم دەرمانی دەردی پڕلەهەستم

لەناو باغی بەهەن و سێوی مەمانا

خودا و مەیدیا و دڵداری پەرستم

ئیتر بۆ بێمەوە مەنگوڕ بۆلای تۆ

لەکرماشانە قیبلەی گشت مەبەستم

بەشێک لە شیعری: ئاغا وەرەگجەمر: ساڵی ١٩٤٦:

ئاغاگیان لێ بێ ہاتیت گەبەنم

زاخاوی دڵمت بۆ هەڵ ڕێژێنم

چیتر بەهیوا نیمی بت ڕێژێنم

ئەورۆژە ڕێی سوجدەت بۆ بێنم

هەر جرگەت لێ بێ بەخوا نەفرێنم

من بۆتۆ چیتر خۆم ناپەسێنم

پەنجەم بۆ بێنی دەستت نەشکێنم

بۆ دەنکە جۆتی چاوت دەردێنم

ئەو ڕۆژە ڕێی بەهۆی زەبری شان

زەوی هەڵکۆڵم بەهێز و تەکان
بیکەم بەگەنم تۆش کانی خەرمان
کوێخا بنێری بەهەڵەداوان
لەگەڵم بەشکا خۆم دەستە و وەستان
منداڵم بۆ نان ڕوو بکەنە دەرگات
پەنجەم بۆ بێنی دەستت نەشکێنم
بۆ دەنکە جۆیێ چاوت دەردێنم

٦

ئەم بەرهەمەی مەنگوڕی و بەرهەم ونوسین وهەڵبەستەکانی تری، ڕەنگدانەوەیەکی بێگەردی بیروبۆچون و ژیانی میرزا مەنگوڕی و چەندلایەنێکی کۆمەڵگەی کوردەوارییێن لەسەردەمێکی مێژوویی دیاردا. هەمەتیی ئەو ڕەهێلاکی نەزانین و بێئومێدیی لە بەچاپگەیاندنی نوسینەکانی و نەدۆزینەوەی یارمەتیدەرێک، ئەوانەلەچالاکی وتوانا و هیوا و نوسینی مەنگوڕییان کەم نەکردەوە.. بۆیەکەپیا وچاری بەو هەمو بەرهەمە چاپ نەکراوانەیدا دەکەوێت، ئەوراستییانەی بۆدەردەکەوێت..

چاپکردنی دەقی ئەم بەرگی یەکەمەی بەرهەمەکە ،کوتومت هەروەک چۆن میرزامەنگوڕی نوسیویەتی وام بەچاپ گەیاند، تانرخی ئەرشیفیی جۆری نوسین و بەکارهێنانی زمانەکە لەگرامەتیک و ڕێنوس و وشەسازی و ناستی نوسینی کوردی لەسەردەمی نوسینی کتێبەکەشدا بپارێزرێت. کە بۆئەوە لە پێداچونەوە و بەراوردکردنی دەقی تایپکراوەکە لەگەڵ کتێبەکەدا دووچاری ماندوبون و

زەحمەتییەکی زۆر بوم، چونکە دەبوایە وشە بە وشە و ڕستە بە ڕستە وەک خۆیان کۆمپیوتەریکرێن و بەوجۆرە کتێبەکە بکەوێتە ژێرچاپەوە. لەبەرئەوە پێم وایە ئەوکارە بێ هەڵەنەبێت، بۆ ئەوە وەهەرکەموکورتییەکی ترکە لە بەچاپگەیاندنی ئەم بەرهەمەدارویداوە، هەرخۆم لێیان بەرپرسیارم و داوای لێبووردن لەهەموولایەکیش دەکەم.

بڕوام وایەئەم بیرەوەری و یادداشتکردنی ئەو ڕووداو و دیاردانەی ئەزمونەکەی مەهاباد کەڵکێکی زۆر بەلێکۆڵەر و توێژەرەوەی بوارەکانی ئەو مێژووە دەگەیەنێت وجێگەی خۆی لەکتێبخانەی کوردیدا دەگرێت. "١"

دوا وشەشم بۆ سوپاسی ئەوبرایانەیە کەیارمەتییان دام بۆ لەچاپدانی ئەم بەرگە، بەتایبەتیی:

کاک ئەحمەد سەعید قادر سەرپەرشتکاری چاپخانەی کۆمەڵەی گەلی کوردستان کە بەهۆی چاپکردنی بەرگی سێیەمی د.ج.ک-وە بەڵێنی چاپکردنی ئەم کتێبەشی پێدام وکارەکەی بەم جۆرە ئەنجامدا.

کاک حەمەی قازی کەئەرکی بەشی زۆری نرخی کۆمپیوتەرکردنی کتێبەکەی گرتەئەستۆ.

کاک شێرکۆ مەنگوڕی کە گەلێ هەڵبەست و زۆر لە زانیارییەکانی لەسەر میرزا مەنگوڕیی باوکی گەیاندە دەستم و بوون بەیەکەم سەرچاوەی ئەم پێشکەشییە..

---

"١" هەروەک کاک جەعفەر حەسەنپوور بۆ تێزی دوکتوراکەی لە بواری جۆری نوسینی کوردی و جیاوازییەکانی شێوەی نوسین، وەک نمونە ناوی بردووە. دیسان خانم د. شەهرزاد موجاب کە لەگەڵ لێکۆڵینەوە لەسەر ژنانی کورد خەریکە، ئەو باسەی کە پەیوەندیی بە ژنانەوە هەیە لەم کتێبەدا، کۆپییەکەی بۆ نێردرا تا سودی لێ وەرگرێ.

٧

## دەرفەتێک بۆ ڕێزلێنان

شێرکۆ میرزامەنگوری

لە وتەیەکی پێشینانی خۆمانەوە کەدەڵێ: (نرخی زێڕ لای زێڕنگەرە) دەمەوێ دەرفەتێک بدۆزمەوە بۆ ڕێزلێنان وستایش کردنی کەڵەپیاوانی کورد،کە توانیان بەهەوڵ وکۆشش ڕۆڵی جوامێرانەیان. ئەم بەرهەمەسەنگینە لەدەیجۆری لا لێ نەکردنەوە، لەمەترسیی فەوتان بگەیەننە دوا هەوارگەی بلاوبوونەوە. کەنەک هەر بەتەنهاکتێبخانەی کوردیانی پێ دەوڵەمەند دەکات، بەڵکو قۆناغێکی گرنگ و پڕلە ڕووداوی کاریگەر لەمێژووی خەباتی نەتەواکەمان، مێژووی یەکەمین کۆماری کوردستان، لەکوردستانی ڕۆژهەڵات بۆ نەوەکانی ئەمڕۆ ڕۆشن دەکاتەوە.

کتێبی بەسەرهاتی سیاسیی کورد، ئەگەرچی تۆمارێکی گرنگی مێژوویی بەرخۆدانی قۆناغێک دەگێڕێتەوە. کە پێشتریش ژمارەیەک لە مێژو نووسانی کورد و گەلانی تر بەقەڵەمە بەبڕشتەکەیان ڕوودلوەکانی ئەم سەردەمەیان لە دوو توێی کتێبی بەنرخدا هەڵسەنگاندوە و بەچاپیان گەیاندووە، بەڵام ئەم بەرهەمە، لەبەرئەوەی دانەرەکەی(مەنگوڕی) بەشدارییەکی بەرچاوی هەبووە لەو ڕووداو و گۆڕانکاری یانە بەتایبەتیش (کۆماری مەهاباد)،کە (مەنگوڕی) جگەلە پێشمەرگەیەکی کۆمارەکە، شاهیدێکی هاوچەرخی سەردەمەکەبوو، تایبەتمەندیەتی خۆی هەیە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بەرهەمە بەدەرنییە لەکەم وکوڕی کە ڕاستکردنەوەشیان دەکەوێتە ئەستۆی مێژووناسان و ڕۆشنبیرانی نەوەی نوێی

لەلەکەمان، کە بەچاوێکی ڕەخنەگرانەی بنیات نەرانەوە پێیدابچنەوە و، لەناست
بۆچوون وگێڕانەوەکانی (مەنگوڕی)دا هەڵوێستە بکەن.

وەلێ ئەوەی کە بەلای ئێمەوە گرنگە، بەچاپ گەیاندنی کتێبەکەیە، چونکە
ئەرکی پاراستنی لەفەوتاندن لەئەستۆی ئێمەدابووە، چاپکردنیشی دەکەوێتە
ئەستۆی ڕۆڵە تێکۆشەرەکانی نەتەوەکەمان. کەلەڕاستیشدا بەڕێز نەوشیروان
مستەفا، یەکەم بەڕێزبوو کەبەدەنگ ئەو دڵخوازییەمانەوە هاتوو، ڕۆڵی بەرچاوی
بینی لەبەدی هێنانی ئاواتەکەی (مەنگوڕی)دا. کاتێک کە بەرپەری هەست
بەڵێبڕسینەوە ودڵسۆزییەوە بەڵێنی پێداین کە بەهەر شێوەیەک بێت ئەم کتێبە
لەفەوتان ڕزگاردەکات، ئەوبوو کە لەساڵی(١٩٩٥)بەڕێزی گەڕایەوە بۆ دەرەوەی
وڵات، بەرگی یەکەمی کتێبەکەی لەگەڵ خۆیدا بردوو، تابەئەمانەتەوەگەیاندی بە
دەست ماموستای بەڕێز مەحمودی مەلاعززەت کە بەڕێزیشی قوڵ ومەچەکی
مەردانەی لێ هەڵماڵی و بەشەونخونی وماندووبوونێکی بێ هاوتاو و چاپێکی
دڕێژ (بەسەرهاتی سیاسی کورد)ی بەو پێشەکی بە بەنرخە بەچاپ گەیاند،
کەبەڕاستی دڵسۆزییەکی وای نواند کەنەک هەرگیانی(مەنگوڕی)شادومان کرد،
بەڵکو خزمەتێکی نەتەوەکەمانی کرد کە هەرگیزا و هەرگیز لەیاد ناکرێت.

ماڵێکی تریش بەتوندی دەستی بەڕێزان نەوشیروان مستەفاو ماموستا مەحمود
مەلاعززەت دەگوشم بۆ ئەوجوامێرییەی کەنواندیان، هەربژین بۆ کوردوکوردستان.

* * * *

لەلەکەمان، کە بەچاوێکی ڕەخنەگرانەی بنیات نەرانەوە پێیدابچنەوە و، لەئاست بۆچوون وگێڕانەوەکانی (مەنگوڕی)دا هەڵوەستە بکەن.

وەلێ ئەوەی کە بەلای ئێمەوە گرنگە، بەچاپ گەیاندنی کتێبەکەیە، چونکە ئەرکی پاراستنی لەفەوتاندن لەئەستۆی ئێمەدابووە، چاپکردنیشی دەکەوێتە ئەستۆی ڕۆڵە تێکۆشەرەکانی نەتەوەکەمان. کەلەڕاستی پێشدا بەڕێز ئەوشیروان مستەفا، یەکەم بەڕێزبوو کەبەدەنگ ئەو دڵخوازیەمانەوە هاتوو، ڕۆڵی بەرچاوی بینی لەبەدی هێنانی ئاواتەکەی (مەنگوڕی)دا.کاتێک کە بەوپەڕی هەست پەلپەرسینەوە ودڵسۆزیەوە بەڵێنی پێدایین کە بەهەر شێوەیەک بێت ئەم کتێبە لەفەوتان ڕزگاردەکات، ئەوەبوکە لەساڵی(١٩٩٥)بەڕێزی گەڕایەوە بۆ دەرەوەی وڵات. بەرگی یەکەمی کتێبەکەی لەگەڵ خۆیدا بردوو، تابەئەمانەتەوەگەیاندی بە دەست مامۆستای بەڕێز مەحمودی مەلاعززەت کە بەڕێزیشی قۆڵی ومەچەکی مەردانەی لێ هەڵماڵی و بەشەوونخوتی وماندووبونێکی بێ هاوتاو و چاپێکی درێژ (بەسەرهاتی سیاسی کورد)ی بەو پێشەکی بە بەنرخە بەچاپ گەیاند. کەبەڕاستی دڵسۆزیەکی وای نواند کەنەک هەرگیانی(مەنگوڕی)شادومان کرد، بەڵکو خزمەتێکی نەتەوەکەمانی کرد کە هەرگیزا و هەرگیز لەیاد نەکرێت.

هارێکی تریش بەتوندی دەستی بەڕێزان ئەوشیروان مستەفاو مامۆستا مەحمود مەلاعززەت دەگوشم بۆ ئەوجوامێریەی کەنواندیان، هەربژین بۆ کوردوکوردستان.

* * * *



میرزا محەمەد ئەمین مەنگوڕی

١٩١٠-١٩٨٨

وەتەن گەر هات و من مردم ئەتۆ دیت تەرزی ئەم حاڵە
بە ڕۆڵەی کورد بڵە لاشەم دەرێنن بەسمە ئەم چاڵە
لە سەرچاوەی زەڵم دامنێن لە ناو خونچە و گوڵی ژاڵە
دووبارە تەڵقینم دادەن بە کوردێکی پەتی پاڵە
ئیتر مەم نێژنەوە مادام نەماوە شیوەن و ناڵە

میرزا مەنگوڕی ـ ١٩٤٤

## بە ناوی خوای گەورە و میهرەبان

***

**بەسەرهاتی سیاسی کورد لە ١٩١٤وە هەتا ١٩٥٨**

هاوخوێنانی بەڕێز

ئیمە گەلێکین کە پێ مان ئەڵێن گەلی کورد. وە بە نیشتمانەکەش مان ئەڵێن کوردستان. بە مانا [جی نشینی] کورد.

دانیشتوانی کوردستان لە ٢٠ ملیون تێ پەڕ ئەکات. وە گەلی کورد لە ڕەگەزی مادو ـ ئاری ـ پێک هاتوە. و علاقەیکی نەتەوایەتی لەگەڵ ـ کەیانی ـ ئەشکانی ـ ساسانی ـ هەیە هۆزی کورد. کەوتوتە ئێرانی ـ روس ـ تورکیە ـ فارس ـ عراق ـ سوریە ـ وە بەشیکی کەمیشی لەناو حکومەتی ئەفغان ـ بلوچستان ـ لوبنان ـ دا هەیە.

پێنج هەزار ساڵ پێش ئەمرو کورد لەم شوینانەدا ژیاوە کە ئیستا تیا ئەژیت؟

بە هەزاران جەنگی خوینینی لەسەر ئەو نیشتمانە لەگەڵ مللەتانی ئەخامنشی ـ سومری ـ کلدانی ـ بابلی ـ ئاشوری ـ کیانی ـ ئەشکانی ـ ساسانی ـ روم ـ و مەقدونی ـ بنی ئومیە ـ عباسی ـ بزنتینی ـ سلاجقە ـ مغول ـ تاتار ـ صفوی ـ قاجار ـ پەهلەویدا کردوە.

چەند دەولەتی گەورە وە ئمپاراتی خاوەن دەسەلات و زور جار مللەتانی بەهیزی بیگانە ئەو کوردستانەیان پی شیل کردوە وە بە سەر لاشەی کوردا تی پەریون.

بەلام بە هەول هەلو روناکایی دا. بەلاماری دوژمنە زوردارەکەکانی خویان داوەتەوە. وە تولەی خویان لی ساندونەتەوە.

بەسەرهاتی [گەزتەفونی - یونانی لە ٤٠١ پ م دا. کە لە گەل [کورشا] هاتونەتە سەر کوردستان و بابل - دەوری ئەخا کە کورد لە تولە ساندنەوەدا دەستیکی بالای میژویی هەیە.

لە پیشی ئسلامیەتا هوزی کورد خاوەنی ئەو وینە حکومەتانە بوە. وە بەسەر بەخویەتی خوی ژیاوە -

١- لولو - ٢٨٠٠ سال پیش میلاد لە ناوچەی قەراخ و سلیمانیدا دەولەتی کورد بوە.

٢ - گوتی - ٢٦٠٠ سال پ م
٣ - کاشینی ٢٢٢٥ " "
٤ - میتانی ١٤٥٠ " "
٨ - میسری ٩٢٣ " "
٩ - کیانی ٥٤٦ " "
١٠- ساسانی ٢٤١ " "

هەتا پەیا بونی اسلام هوزی کورد لە ناوچەکانی ئیستای خویانا زور دەوری بالایان دیوە. دەستی سیاسەت یان خستوتە ناو ئیشو کاری وەلاتانی بیگانە.

وە لە پەیا بونی ئیسلامیەتیشا. دیسان کورد بەربەرەکانی لەگەل مللەتی عەرەبا کردوە وە لە گەلیا جەنگاوە. وە بە بی کوشتن مەیانی بو عرەب چول نەکردوە. کە دەست کاری ئاین و رەووشتی بکات. هەتا [زیرینا] ی کچی شیروخانی - ئامیدی لە سالی ١٦ هـ کە ریکەوتی ٥٩٦ م ئەکات بە لشکریکی زورەوە چو بو [قادسیە] بە هاواری یەزدوگوردی ئوردەشیری بابکی ساسانی [کسرا] - وە لە مەلبەندی قادسیەوە. - هەتا ئەگاتە ناوچەی - ولن -

[illegible] عرەبەکان جەنگاوە. کە لە کتێبێکی تای بەتی باسی ئەو کچە کوردە ـ [illegible]ەوە.

تا هیچ کاتێک کورد سەری خزمەت کاری بو وەلاتانی بیگانە شور نەکردوە. وە لە هەل و رێکەوتا پەلاماری ئەو کسانەیان داوەتەوە کە دەست کاری رەوشت و دیانەتو ئازادیان کردنی. وە بە زیادەوە حەقی خویان لی وەرگرتونەتەوە. لە کاتی پاشایەتی خلیفەکانی (بنی ئومەیە) و عباسیە ـ کانا چەند شورشی گەورەیان بو رزگاربونیان لە ژیر دەسەلات داری عرەبا ناوەتەوە.

لە ناوچەکانی ـ خوزستان ئەهواز ـ کرماشان ـ اصفهان ـ شیراز ـ خراسان و ئازربایجان ـ حکاری نصیبین ـ شارەزور ـ دا. دیسان لە دەوری حکوماتی (بیزنطینی) و سلاجقە ) و عثمانی) زور جار ئاژاوە و شورشیان ـ بو رزگار بونیان لە ناو تورک و فارسدا ـ ناوەتەوە.

هەندی جار شان بە شانی ـ هوزی ئەرمەن ـ ئاسوری ـ لە دەولەتی عرەب و تورک و فارسیان ـ داوە.

زور جاریش هوزی ئەرمەن و ئاسوریان ـ خستوتە ژیر پی خویانەوە. وە بە سەریانا بازداوە.

بو بی هیز کردنی دەسەلاتی فارس و تورک ـ کە هەردوکیان دوژمنی راستەقینەی کورد بوون. هەندی جار لاین گری یەکیک یان لەو دەولەتانە کردوە.

وە بو پەرەساندنی هیز و دەسەلات ئەو دو دەولەتە گەورەیان داوە بە گژ یەکا. وە بەو ناوە ئەمارەتیک یان بو خویان پیک هیناوە.

بەلام زروفی سیاسی وە پارچە پارچەیی کوردستان بوتە هوی ئەوەی کە کوردەکان لە هەمو کاتیکا نەیان تواتیوە بە یەک دەنگ و بیر پەلاماری دوژمنی نشتمانی خویان بدەن.

حا لەبەر هوی لیک پچرانی ـ نیشتمانی کورد و تایفەکانی کورد دوژمنەکانیان توانیویانە زور بە ئاسانی لە هەندی وختا ئەمارەتو سەربەخویەتەکانیان لی تیک بدەن.

کوردەکان لە پەیابونی ئیسلامیەتا هەتا ئەم تاریخە توانیویانە ئەمارەتانە دروست بکەن.

١ ـ رەوادی ـ لە ئازربایجان دامەزراوە لە ٢٣٠ هجری هەتا ٦١٨هـ
٢ ـ سالاری ـ لە ٣٠٠ هـ هەتا ٤٢٠ هـ
٣ ـ حسنەوی ـ هەمەدان ٣٣٠ ـ هەتا ٤٠٥ هـ
٤ ـ شدادیە ـ نیرەوان نەخچەوان تفلیس ـ قرەباخ ـ لە ٣٤٠ هەتا ٤٦٨ هـ
٥ ـ دوسکی ـ مروانیە ـ دیاربکر ٣٥٠ هەتا ٤٧٦
٦ ـ عنانی ـ حلوان ـ لە ٣٨٠وە هەتا ٥١٠
٧ ـ شوانکارە ـ فارس لە ٤١٢ هەتا ٦٥٨ هـ
٨ ـ ئەتابکی لوری گەورە ـ لورستان ٥٥٠ ـ ٨٢٧ هـ
٩ ـ لوری بچوک لە سالی ٥٧٠ وە هەتا ١٢٥٠ هـ
١٠ـ ایوبی ـ لە مصر و شام لە ٥٦٧ وە هەتا ٩٥٠ هـ
١١ـ ئاردەلانی ـ مکریان. شارەزور ٦١٧وە هەتا ١٢٠٢هـ
١٢ـ ملکی ـ خراسان لە ١١٦٧وە هەتا ١٢٠٢ هـ
١٣ـ نادرشاە ـ نادر قولی ایران سالی ١٦٨٨ هەتا ١٧٤٧م
١٤ـ زەند ـ موکریان و سنە ـ ١١٦٧ هەتا ١٣٠٠ هـ
١٥ـ براخوی ـ بلوچستان ـ ١١٧٢ هەتا ١٣٠٠هـ

لەناو حکومەتی تورکیادا

١- جزیرەی دیرسم ٢- خزان ٣ـ شیروان ٤ـ بتلیس ٥ـ صاصون
٦ـ سویدی ٧ـ بازوکینی ٨ ـ مەردیس ٩ـ جمشکزک

ئەماراتی نیوان جزیرە و گەلی

١ـ حسن کیف ٢ـ سلیفان ٣ـ زریکی ٤ـ گلی

ئەماراتی نیوان جزیرە و خوی

١ـ هکاریە ٢ـ حمودی ٣ـ بنیامیش ٤ـ دنبلی ٥ـ برادوست ٦ـ مکری

٧ـ استونی

**لەمارەتەکانی حکاری جنوبی**
١ـ بادینان ٢ـ داسنی ٣ـ رەواندزی سوران ٤ـ بابانی فقەاحمد ٥ـ بانە
٦ـ گلباخی ٧ـ کلهر

**لەمارەتەکانی روژهەلاتی ایران**
١ـ سیاه منصور ٢ـ جکنی ٣ـ زەنگەنە ٤ـ فوجان

**لەماراتی جبل لبنان**
١ـ مشایخ العمادی ـ دورزی امراء سیف الاکراد.

ها کوردەکان بە دەست دەولەتانی تورک و ایران و عەرەب زور بەسەرهاتی ئالەباریان دیوە. هەتا هەرای گشتی لە ١٩١٤دا زوربەی کوردەکان بۆ مەبەستی سیاسیانەی تورک و ئیران بەکار هێنراون

بەلام لە هەرای گەورەی جیهانیەوە کوردەکان چاویان بڕیوەتە ئازادی و سەربەخویی. وە بەرامبەر بە هیزی دوژمنی راوەستاون و زور جەنگی قورس یان لەگەل ئیستعماری عەرەب و تورک و فارس کردوە.

جا ئەوا بەسەرهاتی ئەو قارەمانانەتان بو ئەگیرمەوە کە لە چەرخی بیستەما بەرامبەر بە هیزی دوژمن میدانی کارزاریان گەرم داهیناوە. و دەوری پالەوانانەیان بو رزگاری کورد و کوردستان گیڕاوە.

هیوادارم کە سود و عیبرەتیکی هەرە تەواوی لی وەر بگرن. وە ئەو شتانەی کە بونەتە هۆی لەناوچونی تی کوشانی قارەمانەکانی کورد. جاریکی تر لە بەسەرهاتی کوردا رو نەداتەوە. وە ئەو هەلەیانەیان ببیتە نەخشەیکی ئاموژگاری لەمەولا. ئیتر بژین بە خوشی.

میرزا محمدامین مەنگوری

## بەشی یەکەم

ـ لە بەسەرهاتی ئیستعمار ـ لە خاکی کوردستانا لە مەودای ٤٠٠ ساڵا

چوارسەت ساڵە دەولەتەکانی ڕوژهەلات وە ڕوژئاوا بو پەرەپی ساندنی نفوز و دەسەلات داری خۆیان وڵاتی کوردیان خستوتە بەر چاو. وە بۆ بردنەوەی مەبەستی ئەساسی خۆیان جار جارە لەگەل یەکترا ڕیک کەوتوون وە دەولەتە پاشکەوتوەکانی ئاسیایان لەگەڵ خۆیان خستوە.

بەلام هەتا ئیستا هیچ کامیکیان بە پێ داخواز و مەبەستی خۆیان نەیان توانی وە ئاسیا بگرنە باوەشی خۆیان وە قوتی بدەن.

جا بو ئەوەی کە ئەهمیەتی عراق و ئیران و تەماداری وەلاتانی ئیستعمار ڕون بکەینەوە ئەوا هەندی وەسائلی میژویی دەولەتە تەماع کارەکانی ڕوژهەلاتو ڕوژئاواتان لە خوارەوە پیشکەش ئەکەم:

لە ساڵی ١٦٢٥م دا دەولەتی ئنگلیس بە هوی شرکەتیکی هیندیەوە لەگەل شای ئیرانا ڕیک کەوت بو دەرکردنی پرتەغالیەکان] پینج کەشتی گەورەی ناردە مینای [هورمز]

لەوی لەگەل سەربازەکانی دەولەتی پرتغالی ـ کەوتنە جەنگەوە (سر ولیام بافن) ئەمیرالی ئنگلیس لەو ڕوداوەدا کوژرا.

شای عجەم نیوەی وارداتی بەندەر عباسی ـ دا بە ئنگلیس لە جیاتی خوینی ئەمیرالی ناوبراو

وە هەر بەم پی یە لە ساڵی ١٧٦٣ دا دەولەتی ئنگلیس ئلیکی شەریکەی لە بەندەر [بوشهر] کردەوە. بەرە بەرە نفوزی سیاسی و تجاری لە فارس نزیک کردەوە.

لە ساڵی ١٧٦٥ دا شوینی کە پی ئەلین [شیخ شعب] کەوتە دەست ئنگلیس وە لە ساڵی ١٧٦٦دا وەلاتی قەنصور ـ کوبانی ـ لە ئیران زەوت کرد

ﯾ له ۳ ۱۸۰ دا خلیجی فارسی خسته ژێر باڵی خۆیەوه، وه له ۳ کانونی دووهمی ۱۸۵۷دا [جیمس نوترام] هاته سەر ایران محمره ـ ئەهواز ـ حویزەی داگیر کرد.

له سالی ۱۸۹۰دا شەریکەی کەشتی وانی [لنج ئەخوان] له محمره دامەزرا و هەتا ئەندازەیکی زور هیزی سیاسەت و ئیقتصادیاتی انکلیس له ایران کەوته کارەوه.

دەم پیاتانی گەوەکانی ئیستعماری به سودی عراق و ئیران

لورد لاسندن ـ له سالی ۱۹۰۳دا له کونگرەی پەرلەمانی ئنگریزا ووتویەتی دەولەتی انکلیس له خلیجی فارسدا نابی چاوپوشی له هیچ وینه هەولیکی سیاسی ئەدەبی کومەلایەتی ـ وەلاتان بکا بۆ پاراستنی ریگای نەوت و بازرگانی خۆمان ئەبی هەموو وینه ئازاریک بچێژین

پالمرستون ـ سەروکی وەزیرانی انکلیس له ۱۸۹۰ دا له بارەی هێلی ئاسنی ـ عراق و ئەلمانیەکان ووتویەتی هەر ۵۰ مەتر هێلی ئاسنی بغدا بۆ ئیمە بەرامبەر یەک کەشتی گەورەی زەریایه.

کولونێل جسنی ـ سەرکردەی لیژنەی چون یەتی عراق له سالی ۱۸۳٤ دا له راپورەکەیا ووتویەتی. پی ویسته کەمەندی نفوزی انکلیس له جەبەل طارقەوه رابکشی بۆ استرالیا ـ وه بۆ پاراستنی خەتەری هیندوستان ئەبی زور باش ئاگامان له بەسەرهاتی [موصل] هەبی. چونکه هیندوستان دلی مللەتی بریطانیایه. وه به ئەخوشی موصل ئازار پەیدا ئەکات.

بسمارکی ئەلمانی ـ له دەوری خویا ووتویەتی انکلیس بۆ پاریزگاری هندوستان و مصر پی ویستی به عراق هەیه.

هەر وەکو که مرۆف به نان ئەژی انکلیسیش ئاوا به هیندوستان ئەژی، وه ژیانی هندوستانیش به عراق هەیه.

نوسەری سیاسی ئەلمان ـ پاول روهرباخ ـ ووتویەتی سیاسەتی دەولەتی بریطانیا ئەوەیه وەلاتی عرەب و عجەم بەیەکەوه ببەستی و بیکا به ئاڵقەی

پەنجەی ئەمپراتوریەتی هیند. بو ئەوەی کە نفوزی ئنگلیس بە سیاسەتی وەلاتانی بیگانە شکستی نەهێنی.

لورد کرزن ـ وزیری دەرەوەی ئنگلیس لە سالی ۱۹۰۲دا ووتویەتی وەلاتی هیند گیانی ئەمپراتوریەتی ئنگلیسە لەسەر هێزی بریطانیا پێ ویستە کە هیند و رێگاکانی لە هەموز تەنگ و چەلەمەیکی بێگانە دور بخاتەوە.

وە ئەو هێل و کوسپانەی کە کەتونەتە نێوانی روسی و بریطانیا لە نیوان هەلی یکری بو ئەوەی کە رۆس رێگای پەلاماردانی عراق و ئیران و ئەفغانی ئەمی نیتەوە.

جا بە تەولوی رون بوتەوە کە سنوری جغرافیای کورد زور خەراپ وە نالەبان کەوتوە. هەر دەولەتیک کە بیەوی پەلاماری عراق و ئیران و تورک بدات. لە پێش هەمو شتێکا ئەخشەی ئوردوکەشی بەناو خاکی کوردا پر ئەکاتەوە. وە پەنجەی فێل و سیاسەت بۆ خافلاندنی کورد ئەخاتە ئیشەوە.

چاو برکی دەولەتانی بێگانە لەگەل عراق و ئیرانا

مستر وو. کی. دارکی لە ۱۹۰۱ دا ئیمتیازی شەریکەی نەوتی قصری شیرینی لە شای عجەم وەرگرت وە لە ۱۹۱۲دا شەریکەی پالاوتنی نەوت چۆ بۆ عبادان ـ وە لە ۱۹۳۳دا پەیمانی لەگەل رزاشای پاشای ئیرانا بەست. هەر کاتیک شەریکەی ئنگلیس لە ئیران کەوتە مەترسیەوە. ئنگلیس بتوانی بۆ پاریزگاری خۆی هیز بریتە ئیرانەوە.

دەولەتەکانی تریش وەکو ئنگلیس بیری کورد خواردن یان بوە. لە سالی ۱۵۱۵ دەولەتی برتغال ـ بە چەند پاپوریکەوە گەیشتە مینای هورمز ـ چونکە وای بو ساغ بوبوە کە عراق ئلیمی ئەنگوستیلە ـ ئەموستیلەی ـ جیهانە. بە هۆی داگیر کردنی عراق ئەتوانی پرکیشی وەگەورەی بەسەر جیهانا بکەن.

لە سالی ۱۷۵۲دا هولندیەکان بە تەماعی ئیستعماری عراق کەوتنە پەلە قاژەی نفوز بلاوکردنەوە.

لە سالی ۱۶۷۹دا فرانسا رئیس کرملین! یان بەناوی قنصلی گشتی

پالیوزی ـ له بغدا دامه‌زران له زه‌مانی نوپسی ١٤ هه‌ما وه له سالی ١٧٩٩دا لیژنه‌یکی سیاسیان نارد بو بغدا له ژیر سه‌رکردایه‌تی [مسیو ژان پاست] ناوا بو وه‌رگیرانی نیتجاهی عراق بو لای خۆیان.

ناپلیون ـ زور نه‌هه‌میه‌تی به رازی کردنی شای ئیران داوه بۆ ئه‌وه‌ی که له شاکی روسه‌وه. وه یا له سه‌رزی [موصلـه‌وه له‌شکر کـه‌شی بـکات بۆ هیندوستان.

شای ئیران بو ئه‌و باسه به ته‌واوی له‌گه‌ڵ ناپلیونا ریک که‌وت به‌لام پیه‌رهاتی سیاسی و عه‌سکری نه‌خشه‌کانی ناپلیون تیک دا ته‌ی توانی که به‌م ئاماهه بکات.

هه‌ر له‌سه‌ر ئه‌م ریک که‌وتنه بو که روسه‌کان. له پاش شکاتی ناپلیون ـ ولاتی ئازربایجانیان له ئیران پچکری وه به‌م سزایه تمنبی یان کرد.

داخواز و ئاواتی روس له ئیرانا

له سالی ١٨٣٩دا روس بریاریکی سیاسیانه‌ی له‌گه‌ل ده‌وله‌تی انکلیسا به‌ست. بو دابه‌ش کردنی وه‌لاتی تورک و باکوری ـ شمالی ئیران.

به‌لام انکلیسه‌کان که زانیان بلاوبونه‌وه‌ی نفوزی روس خه‌ته‌ریکی گه‌وره بو سیاسی ئه‌مپراتوریه‌تی به‌ریتانیا دروست ئه‌کات له‌و بریار و ریک که‌وتنه په‌شیمان بونه‌وه.

له سالی ١٨٥٤دا روسیا به ناوی هه‌لگرتنی ناخوشی نیوانی مه‌زهبی کاتولیکی ـ و آرسودزکی ـ ویستی بچیته ناو بالقانه‌وه. به‌لکو به‌م ناوه تورک بخوات وه له‌ویشه‌وه باز بداته عراق و ئیران.

به‌لام انکلیس و فه‌رانسه له‌و بیره دلسوزانه و خوا په‌رستانه‌ی مام روس ئاگادار بون. وه روس یان گیراوه بو دواوه. لاشه‌ی نه‌خوشی تورکیان له‌م په‌رشکبو سه‌ریه‌رشتی روسیه پاراست.

له سالی ١٨٧٤ بلغاریا له‌سه‌ر هاندانی روسه‌کان له یه‌کیه‌تی نفوزی تورک جیا بونه‌وه. به‌لام انکلیس و فرانسا له ترسی بلاوبوونه‌وه‌ی نفوزی روس

ئەو دەوڵەتە هەژارەیان بە زۆر خستەوە باوەشی تورکیا. وە ڕوس یان ناچا[illegible]
کنارەگیری کرد لەم ڕوداوەدا.
غلیوم ـ ویلهلم ـ ئەمپراطوری ئەڵمانیا ـ بە هیوای داگیر کردنی عرا[illegible]
ئیران وهندوستان ـ لە سالی ١٨٩٠دا زیارەتی دەرگای بەندی بابی عا[illegible]
ئەستەنولی کردەوە بە هەر فروفێلێک بو سلطان عبدالحمیدی ـ هێنایە ژێر د[illegible]
سیاسیانەوە.
انگلیسەکان بەم پێشکەوتنی ئەڵمانیا زۆر تەنگاو بون. هێنایان پەیما[illegible]
سالی ١٨٣٩یان لەگەل ڕوسیا دا زیندو کردەوە وە بەم ژەیانی [ بەچک[illegible]
گورگەیە تورکیان لە باوەشی ئەڵمان دور خستەوە.
وە لە سالی ١٩٠٢دا ژاپونیش لە ترسی ڕاپەڕینی روس پەیمانی یەکی[illegible]
لەگەل دەوڵەتی انگلیسا مور کرد.
وە فرانساش لە ترسی هێرشی ئەڵمان لە ١٩٠٧ دا خۆی خستە [illegible]
زنجیرەی یکیەتی انگلیس و ژاپۆن.
وە ڕوسیش ـ بە هیوای خاکی ئیران و عیراق و تورک پەیمانی سازنو[illegible]
لەگەل انگلیس بەست وە بڕیار نامەی سایکس بیکو و سان ژان ـ لە نیو[illegible]
انگلیس و فەرانسا مور کرا. خولیای بلاوکردنەوەی نفوز و دەسەلات دا[illegible]
جیهانی. هەرای گەورەی لە ١-١-١٩١٤دامەزراند وە لە ١١/١١/١٩١٨[illegible]
دوایی پی هێنرا. وە ئەو بەڵێنیەی کە بە روس درابو لە ئەرازی کوردستان [illegible]
ئەرمەنستانا بە ناوی [بولشویکی] شورایەوە مبادی کارل مارکس ـ یان [illegible]
ڕوس کرد بە بیانوی ئەوەی کە بە هیچ جوری ڕوس ری ئەو داخواز و پەیمانە[illegible]
نەبی کە داوای بەش و میراتی لاشەی مردوی تورکو ئیرانیان لی بکات.
وە هەڵە و پەیمانی بی وەختی تورکیش لەگەڵ ئەڵمانیا دا بو بە هوی ئەوەی
کە هەمو وەلاتی جزیرة العرب یان لە چنگ بچی. و نفوزی سیاسی و
عسکریشیان لە ئاسیادا نەمینی.
وە کوردەکانیش دەرخواردی مللەتی عەرەب بدرین لەسەر ئەو پەیمانەی کە
انگلیس لە ١٩١٦دا لەگەل ملک حسینا بەستبوی کە هەمو عناصریکی غیرە[illegible]

...ی بو عەرەب بتوێ نەرێنەوە.

بەرەبەرەکانی دەسەلات لە پرانەوەی هەرای گەورەدا ـ ١٩١٨
شکانی دەولەتی ئەلمان و ئاژاوەی بولشەویکی لە روسیادا. نە بۆ بە
...ساسکی ئارا کە ئەو دەولەتانە چاپۆشی لە تی شکانی خۆیان بکەن.
هەندی روداوی بلیمەتی سیاسی و عەسکری وە بەسەرهاتی هێزداری
...ی سەنطور لە جیهانا بو بە هوی ئەوەی کە پەیمانی ـ فورسا ـ فورسایل ـ
ئەلمانیا و بریاری ـ سیوەر ـ ی تورکیا لەگەل هەندی نەخشە و بەندی ـ
...یسکی ـ و تروتیسکی ـ ئیشتراکی لە روسیادا ـ بی نرخ بی نێتەوە.
سەر لە نوێ ـ سەروکی ئەو دەولەتانە بکەونەوە سەر بیر و لیک دانەوەی
...ی جیهان بە ئەرزیکی تازە بە تازە و لە جاری پێشو بە ئازارتر.
روسیا ـ لە ژیر کوششی بەرزی لنین ـ کالنین ـ ستالین ئەلمانیا لە ژیر
...ی هتلر ـ ئیطالیا بە ئەواناى ـ دوتشی ـ موسولینی ـ
تورکیای نەخوش کەوتو ـ لە ژیر خوێنی گەرمی مصطفی کمال سەر لە نوێ
...یان لە جیهانا نایەوە. وە بو تولە کردنەوەی جەنگی ١٩١٤ دوبارە جیهان
...ەوە ژیر ئازار و برسیایەتی لە ١/ ایلولی ١٩٣٩دا هتلر لەگەل دەولەتی
پولونیا ـ دا کەوتە جەنگەوە.
دەولەتی انکلیس فرانسا ئەمریکا روس هەتا ٨/٥/١٩٤٠لەناو ئاگری
لەو جەنگەدا ئەتلانەوە. وە بە شکانی ئەلمان و ژاپون و ئیطالیا ـ دوایی یان
بەم جەنگە خوینینە هینا کە ٧ سالی خایاند. وە بۆ بە هۆی پەیدا کردنی بومی
اناتوم ا وە چەند وینە شتیکی بەد لە چەکی یەکتر کوژیدا.
بەرەبەرەکانی بلاوکردنەوەی نفوز لە دوای هەرای هتلریدا لە ١٩٤٥ پاش
ماوەی ئەو جەنگە خوینینە ٣ دەولەتی هەرە گەورەی وەکو انکلیس و امریکا و
روس ـ لە جیانا دروست کرد. وە ئەو دەولەتانە هیچ کامیان بە پی ئارەزوی
ئیستعماریەتی وە زەرەرمەندیان. تامین گەورەی و پیشکەوتنی خۆیان نەکردوە.
وە هەر سێیک یان بەرام بەر بەم رەنجەی کە لەم جەنگەدا کیشاویانە خۆیان

به مفدور نەزانن

جا ئەو ٣ دەولەتانە ئەیانەوی بو بەراووردی نفوز و دەسەلات داری جیها[n]
گیریەتیان. هەرایکی گمورەتر دابزرێننەوە

جا بوم ئەوەیەوە سەرزەمین کراوە بە دو [ئوردوگای گەورە یەکیک یان بەنا[وی]
ئوردوگای شیوعی ـ دوهەم یان ئوردوگای ئیستعماری ئەطلسی ـ

وە هەر دو ئوردوگا چاویان بڕیوەتە خاکی کوردستانەوە وە لە هەر وەختیـ[ک]
کە ئەو دو لشکایە بە یەکا بین کورد بە پارێزاوی نا مێ نێتەوە.

بی گومان بەسەرهاتی جیهان کورد ناچار نەکات کە خوی بخاتە [ن]
کومەگی یەکیک لەم دو هیزە گردارانە. وە بە پرنجیکی یەکیک لەم دو ناگ[ر]
خوی بسوتی نی.

جا بو ئەوەی کە کورد بەراووردیکی نیشی خوی بکات وە چاویک [بە]
زەمیر و دلسوزی ئەو دەولەتانە ـ دا بخشینی کە تا چە ئەندازەیک بو سو[د]
استعماری خویان وەلاتان رانەکیشنە ناو گڕ و تاوی خویانەوە.

هەزاران گەنج و لاو و پیر و منال ـ نەخەنە ژێر پی. بو هەندی پیشکەوتن[ی]
سیاسەتی خویانەوە. ئەبی گەلی کورد لەوە ئاگادار بی کە دەولەتانی استعمار[ی]
ئەو خوینەی کە ئەی ریژن بو سودی وەلاتانی پاشکەوتو نیە. وە بو رزگاری
هوزانی ژیر چەپوک ئەو خوینە ناریژن.

بەلکو خوین رژانی دە ملیون کوردیان ـ بەقەد دو گالون [ئەوت] بەلاو[ە]
مەبەست نیە.

جا بو ئەوەی کە بە رابوردوی کردەوەکانی انگلیس و روس ـ گەلی کورد
ناگادار بکەمەوە کە لە ١٩١٤ەوە هەتا ١٩٥٨ئەو دەولەتە ئیستعماریانە چیان
بەسەر کوردی هەژار هیناوە وە چۆن بەناوی ئازادی وە مافی سەربەخویەتی یان
توشی چەند ویتنە کوژران و سوتان و تالان و بەدبەختی یان کردون.

ناچار ماوم کە بە پی رواداو بەسەرهاتی روسەکان لە ئیرانا بو برایەکانی
کوردم بگیرمەوە.

کە من خوم هەتا دوایی تشکیلاتی کوردستان ئەندامیکی ـ زیندوی ئەو

وە لەوە بووم لە مهاباددا. وە لە هەمو روداو و بەسەرهاتیکی سیاسی و
لە ارەی سەربازی ـ ئەو دەولەتەدا هاورێ و نیش کەریکی دلسوز بووم.
وە ئێستا باسی ئەو تشکیلات وە حکم داریە ئەکەم کە دەولەتی بریطانیا
لە برابەرەی هەرای گەورە لە سلیمانیە بەناوی شیخ محمودەوە بوی
دامەزراندبێ
وە لە پاش پیک هاتنی ئامانجی سیاسیانەی خۆیان چۆن ئەو سەربەخۆیەتی
یەیان لەناو بردبێ.
جا لەو دو باسە ئەکەم بە نمونە و ئیسباتی ئەوەی کە کوردەکان چیتر خویان
هەلەی بە کالای بێگانە. وە بە هاشە و هوشە و درو و دەلەسەی بێگانە فریو
نەخون وە لەمەولا روشتەی زانین بە هێندی سویند و پاکانەی سیاسیانە
نەبەستن.
مادام خاکی کوردستان هەوینکی هەمو وێنە هیوایکی وەلاتانی بیگانەیە.
محال وا بە کە بە بی احترامانە داخلی کومەگی هیچ لایکی استعماری ببن.
وە لە پیش دابین کردنی پاشە روژیکی روناک ناور لە هیچ کامیک یان
نەبینەوە. سیاسەتی بێگانە بەزەی بە ئیمەدا ناهێت ئەبی ئیمە خومان بەزەی
مان بە سشمانەکمانا بیێت
هوشەوبستنی انگلیس ئەوە بو شیخ محمودی بو دروست کردنی دلسوزی
پێش ئەوە بو قاضی محمدی بو بە خنکان دابین دل سوزی و بیر و باوەری
سیاسیانەی هەر دو لایان مان بەچاوی خومان دی کە هەرگیز لەو تشکیلات و
دل نەوارەیەباندا هیچ مەبەستیکی کوردستان دروست کردن یان نەبووە
حکومەتەکەی شیخ محمود بو ئەوە بو کە انگلیس لوای موصلی چنگ بکەوێ
وە نەوتەکەی کرکوکی پێ ببرێ.
و ئازادکرانی کوردستانی ئیرانیش. بو ئەوە بو کە روسەکان بەوناوەیە
بیواس سەر بە ئیران شور بکەن دەولەتی ئیران ناچاری ئەوە بکەن کە بەی
مانی نەوت دەرهێنانی لە شمالی ئیرانا لە گەلا ببستی وە لە باوشی انگلیس
دوری بخاتەوە.

جا بو ئەوەی کە برایانی کوردم لە بەسەرهاتی ڕوس و تشکیلا[illegible]
کوردستانی قاضی محمد لە مهابادا ـ ئاگادار بکەمەوە. ئەوا بە دوور و در[illegible]
لە ریکایکی بی تەرەفانە و لاین گری بەسەراتی کوردستانی قازی محمد
دەولەتی روس تان ئەخەمە بەرچاو. بو ئەوەی کە کورد لەمەولا باوەڕ بە ب[illegible]
وە وادەی سیاسەت نەکا. وە هەر ئیشیکی کە بیکا لە ژیر تبظیم وە باوەڕی[illegible]
ڕاستەقینەدا بی. نە وەکو هەروا بە ووتەی =لام سەلایی) ـ کورد بخری[illegible]
میدانی کارزار و سوتانو تالانو کوچ و ڕەو بوچی. بو مەبەستی سیاسیان[illegible]
استعماری بولشویکی وە یا سویند خورەکانی پەیمانی ئەطلس.

ئامانجی روس لە داگیرکردنی جیهانا

دەولەتی روس ـ لە دامەزراندنی وەجاخ زادەیی وە خانەدانی ڕومانوف[illegible]
بیری شاهەن شایەتی جیهانی کەوتوتە کەللەوە. دەولەتەکانی ئەوروپاش [illegible]
مەبەستەی روس ئاگادار وە ووریا بونەتەوە
خەیالەکانی روس یان بە تەرازوی سیاسەت و زانیاری کیشاوە. و هەمیش[illegible]
تەوازونی روسیان پیوانە کردوە وە نەیان هیشتوە روس لە زەریای ـ رەش ـ [illegible]
بینیتە دەری.
روسیش لەوە گەیشتوە هەتا گیانی ئەلمان انگلیس ـ ئەمریکا. فرانسا. [illegible]
جیهانا بی نی بە ئاواتی جیهان گیری خوی ناگا جا بو هەل گیرساندنی بازاری
ئاشوبی. وە تیک چونی نیوانی ئەو دەولەتانە هەولی داوە. و شورش [illegible]
ئینقلابی گەورە گەورەی لە جیهانا پیک هیناوە. وە هەندی جار بە هاوڕیی
یەکیک لەو دەولەتە گەورانە چوتە ناو ڕیسمەی گورانی ئەخشەی جیهان. و[illegible]
پەنجەی بو شورش و غموغای ناو ئەو چوار دەولەتانە خستوتە کارەوە.
بەلام لە مەودایکی وا دور دریژدا نەی توانیوە لە غیرەز هەندی ناوچەی
شەرقی ئەمرزە روم وە. جزیرەی قرم. و بەشیکی کەم لە وەلاتی ئەرمنستان ـ و
قەوقازی ئازربایجان ـ لە گەل ناوچەی بخارادا ـ شتیکی تری چنگ بکەوی.
وە لەسەر غلەتەکەی ئیران لەگەل ناپلیونی فەرانسادا لە سالی ۱۸۱۳ و

١٨٢٨ دا بەناوی پەی مانی ـ گولستان و تاریەچای ـ ئازربایجانی قەوقازیان لە ئیران ساند وە هەمو جاریک بە هیوای ئەوەی کە لە ماندوبونی دەولەتە هەرا هەل گیرسێنەکانی جیهان شتیکی چنگ بکەوی.
خوی کردوە بە هاوری یەکیک لە شەرکەرەکانی روژئاوا لە ١٩١٤بە هیوای بلاو پی کردنی دەسەلاتو نفوز چوناو پەی مان وە زنجیرەی هەرای جەنگی ئەلمانی،
بەلام پیش ئەوەی کە سود لە بریار و پەی مانە نهینیەکەی بکات کە لەگەل سویند خورەکانیا بە سری بەستبوی. انکلیس پەلجەی خەیانەت و جاسوسی ـ سیخوری ـ بو خستە نیشەوە.
بە ئاگری شیوعی تەخت و تاجی خیزانی رومانوف و قیصر و قیصرچەی ـ یا سوتا. چە جای ئەوەی کە سود لە میراتی جەنگ وەربگرن. مستعمرەکانی خوشیان لە دەست دەرچو. وەکو ئستوانیا ـ لاتفیا ـ فنلندە ـ سوید ـ لتوانیا ـ لەگەل تورکەکان لەو کاتەدا لە دژی انکلیس نەجولایانەوە نەیان توانی زور بە ئاسانی سواستبولە ـ قرم ـ ئەرمنیا و روژهەلاتی ئەرزەروم ـ وەربگرنەوە.
بەلام روسەکان لە ترسی ئەو بیرە پیش دەستیان کرد بە هەندی کەلوپەلی ـ بازاری چەک و خواردن پەی وەندیان لەگەل مصطفی کمالدا ـ گرت وە خویان لە مەترسی دوژمنایەتی تورک هیندی کردوە. ئەو ریگایەیان بە چولی بەهیشتوە کە انکلیس بتوانی بە هوی مصطفی کمالەوە قەپالیک لە گیانی بەهوشی روس دابگری.

راپەرینی بولشویکی لە ١٩١٧
روسیا لە اکتوبری ١٩١٧بەولاوە کەوتە سەر بلاوکردنەوەی پروپاگندەی شیوعی. بو لەناوبردنی یاسا و رەووشتی نازی ـ فاشستی ـ ئەمپریالیزمی ـ ئاریستوکراتی ـ کەوتنە تەلاشەوە.
ستالین ـ و دەستەو داترەی کرملین ـ کەوتنە سەر نەخشەکیشانی ئەوەی کە ئاژاوەیک لە جیهانا بنینەوە. دەوریکی برسیایەتی دابین بو ئەوەی کە بازاری

شیوعی رەواج بستینی.

هتلر و هتلرخواهەکانیان خستە سەر غروری وەیا هی بوونیکی وەها کە شیرازەی جیهان بۆ روس پس پس بکەن. وە لە پاش مانەوو بونی دەولەتانی روژئاوا بەش و میراتیکی باشی چنگ بکەوی وە تولەی زەرەرمەندی هەراکەشتی لە دەولەتەکانی روژئاوا بکاتەوە.

کە بە نیتیفاقی سایکس بیکو لە ١٥ و ١٧ مایی ١٩١٦دا بەناوی سەر ماک سایکس ـ بەناوی دەولەتی بریطانیاوە. مسیو جورج بیکوش ـ بەناوی دەولەتی فرانساوە. کە ئەرازی شام و حلب و موصل یان لە خویان دابەش کردبو بە دزی روسەوە بەناوی ناوچەی [ آی] و ناوچەی [بی]

روس وەختی بەم فیلەی زانی کە کار لە کار ترزاوە. خوا خوایەتی ئەرازیەکەی روسیاش بەسەر خویانا دابەش نەکەن. جا لەسەر ئەو نەخشە پیلانەیە روسیا لە ٢٣ آبی ١٩٣٩پەیمانی [عدەمی تعدا] ـ پەلاماری یەکتر نەدانی لەگەل ئەلمانیادا بەست.

هەر چەندە کە رەووشت و یاسای نازی و شیوعیەت لەوکاتەدا وەکو ئاگر و باروت وابو. بەلام ناچاری سیاسەت ئەو ئاگرو باروتەی بە یەکەوە لکاند.

لە هەمان کاتا. هەر دو تەرەف بو لەناو بردنی یەکتر خویان ئامادە کردبو. وە بو رابواردنی وەخت یەکتریان بە ناوی ئەو پەیمانە ئەخافلاند.

چەند ئیعترافیکی سیاسیانەی هتلر بەرام بەر بەم یەکیەتیە

هتلر ـ لە ریخشتاخ ـ لە ٢ مانگی سبتمبر ١٩٣٩دا وتاریکی بلاوکردەوە. کە دوپاتەی ئەکەمەوە کە روس هیچ نیازیکی خراپی نیە لەگەل دەولەتی ئەلمانیادا هیچ هیوایک نیە کە جاریکی تر روس و ئەلمان لە دژی یەکتر راوەستن لە ١٩ سبتمبر ١٩٣٩دا دیسان هتلر لە دانزیغا ـ بلاوی کردەوە کە ئیمە و روس لەمەولا هیچ کاتیک لەبیر و باوەری یەکتر دەرناچین.

لە ١٦ اکتوبری ١٩٣٩دا تهلر لە ریخشتاخ دیسان بلاوی کردەوە کە یەکیەتی ئیمە و روس تەنها بو ئاشتی و سلامەتی جیهانە. هیچ بیریکی

پەلاماری یەکترمان نیە.
ڕیبنتروپ وەزیری خارجەی ئەلمانیا لە ١٤ ئکتوبری ١٩٣٩دا ووتی دوستی ئێمە و ڕوس هەتاهەتایی ی.
مۆلۆتۆف ـ لە ٢٤ سێپتەمبری ١٩٣٩دا ووتی ئێمە بە ڕەووشتی ئیشتراکی وە پێ ـ سەلامیش بە پاسای شیوعی ئەژین. ڕیک کەوتنی ئێمە هیچ مەبەستێک بە پەلاماری یەکتر ناگەینی. ئێمە لەو ڕیک کەوتنەدا هیچ مەبەستێک مان نیە تەنها لە ناوبردنی انکلیس نەبی.
لە پێ بە پێ چەوانەی ئەو هەمو وادە و بەڵێنانە لەکاتی ٨ ئەلرلجی ڕوژی ٢٢ / حوزەیرانی ١٩٤١ئەڵمانیا پەلاماری ڕوسیای دا.
لەو جەنگە سامدارە خوێناویەی لەگەڵ ئەو دوستە خوشەویستەیا کرد کە لەمەوبەر لە لێزگەکانی ئەڵمانیادا بە ناز و خو هەڵ کیشیەوە هەڵکی پی دەیا لەکردەوە. جا ڕاستی ئەو بەسەرهاتەی نێوانی ڕوس و ئەلمانەکان مان هەتا ئیستا بە تەواوی بو ڕون نەبوتەوە کە تاوانی ئەو پەیمان شکان و بەڵێن بەجێنەهێنانە کام لایان بوون د ـ تەنیا وثائقی تای بەتی ئەو باسەمان، مذاکراتەکەی نازی کە لە لایەن میکایل اوفی روسەوە لە مستشاریەتی ئەلمانیاوە چنگ کەوتون. وە لە چاپخانەی ئیعتمادی بغدا لە لاین دکتور تقی الدین هلالی وە لە سالی ١٩٤٨ دا چاپ کراوە.

بیرەوەرییەکانی هتلر بەرام بەر بە تاوانی جەنگی روسیا
مەبەست لە پەی مانی بەرلین ـ روما ـ توکیو ـ بی هیزکردنی بلشویکی بو.
ئەلمانیا ئەیەویست کە انکلیس و فرانسا بچنە ناو ئەو یەکیەتیەوە بو ئەوەی ڕوس لەناو هەڵبگری.
بەلام دلادیە ـ سەروکی جمهوریەتی فرانسا ئەترسا باوەری بەم پیشنیارەیەم بەنەکرد
لەبەر کەسی کە لەگەل منا پەلاماری بەرگری شیوعی کرد موسولینی ـ سەروکی وەزیرانی ئیطالیا ـ بو

چونکە لەسەر روداوی حبشە ـ ئیطالیا لە لاین فرانسا و انگلیس
ترسهنەرابو. لەو ترسانە لەگەل ئەلمانیا دا بوبو بە دوستیکی باوەر پی کراو
هەتا مسیو لاڤال ـ رئیس الوزرای فرانسا و سیر حمونیل هور ـ وەز
دەرەوەی انگلیس داوایان کرد کە پارچەیک لە ئەرازی حبشە ـ بدری بە ئیط
بلکو بەم ناوە ئیطالیا ـ لە باوشی منا دەربی تن. وە بیکەن بە هاودە
خزیان

بەلام بیر وباوەری پەرلەمانی بریطانیا لە دژی ئەو بریارە بو. و هەر لە
ئەو نظریە سیر حمویل هور ـ لە وەزارەت دەرکرا. و میستر ئیدن لە جیگای
کرا بە وەزیری دەردوە.

من هەمیشە بە لامەوە وابو کە دوستایەتی لەگەل انگلیس زور بە کەلک
چونکە انگلیس خاوەنی وەلاتیکی زور فراوانە. وە لە هیزی زەریایو پارەشا
دەسەلات دارە.

و ئەلمانیاش زور خاوەن کارخانە و تەوانایە. ئەگەر ئەو دو گەلە بەراس
دۆستایەتی یکتر بکەن. گەلەکانی تر ناتوانن کە ئارام و خوشی سەرزم
بشیوینن.

هەتا لە مونیخ ـ بە چمبرلاین سەروکی وەزیرانی انگلیسم وتوە ئەگ
دەولەتی بریطانیا لەگەل ئەلمانیا دا پەی مان ببستی. ئەلمانیا ئامدەیە
بەشی کەشتی خزی لەگەل ١٢ فرقە سەربازی خزی بخاتە بەردەستی انگلیس
بو پاریزگاری ئەمپراطوریەتی بریطانیا و پاریزگاری کنداش ا ئەگرینە ئەست
خومان ـ ح چمبرلاین ئەو پیش نهادەی منەی خستە لیژنەی پەرلەمان بە
حزبەکەی چەرچل لەگەل چەرچلا ـ مخالفی ئەم داخوازەم وەستا بون.

## ١٩٣٩
## وینەی ریک کەوتنی ئەلمان و روس لە ٢٣ آبی ١٩٣٩دا

لە کاتیکا کە لە دوستایەتی انگلیس ناهومید بوم. لەگەل روسیا کەوتم
باس و خواستی ریک کەوتنی زەرەر بە یکتر نەگەیاند ـ ئیتفاقی عدەمی تعدی
ـ لە هەمان کاتا انگلیسیش مستر ایدنی لگل دەستەیکی لە بەما

سیاسیەکانی خۆی ناردبو بو موسکو - بو ریک کەوتن لەگەل روسیادا بەلام - ریبنتروب - وەزیری خاریجەی ئەلمانیا لەگەل مولوتوف وەزیری - دەرەوەی روسیا زور پەی مانی شەرنەکردن لە نیوانی روس و ئەلمانیان بە تەواوکردن لەپاندبو من و ستالین بەلین مان بەیەکتر دا هەتا هەردوکمان بی نین هیچ هەراپەمان بو یەکتر نەبی

لەو بریارە بەولاوە هیچ باسی توسعی نفوز و ئەرازی بەش دانم بە ستالین نەداوە کە لی هەل گەراب مەوە وە درۆم لەگەلا کردنی. ئەوەش رونوسی ئیتفاقەکەمانە.

دەولەتی رایخ ئەلمانی و یەکیەتی روس بەپەری داخوازەوە تی ئەکوشن بو پاریزگاری ئاشتی لە نیوانی ئەلمانیا و روسیادا لەسەر تەنظمەی ئەساسی نیسانی ١٩٢٦

١ - دەستبەر ئەبین بو قەدەغەکردنی بەکارهینان هیزی هیزداری و هیچ فەرمانیکی دوژمنایەتی و هیچ وینە پەلاماردانیک چە بە تەنها وە چە بە هوی کومەلی دەولەتانی ترەوە.

٢ - هەردو لامان دەستەبەر ئەبین کە دەولەتیکی ٣هەم ئامادە بو کە جەنگ لەگەل یەکیک لەم دو تەرەفانە بکات. هیچ کامیک مان حقی ئەوەمان نەبی لەسەر یەک هەل بدەینی.

٣ - ئەو دو دەولەتە - بی لاین گر ئەمیی ئەوە. بە لی کولینەوە و مشاوەرەت یەکتر ئیقناع ئەکەن بچونە ناو فەرمانیک کە سودی هەر دو لای تیا بی بە رو.

٤ هیچ کامیک لەم دو دەولەتە پەلاماری هیچ فەرمانیکی تاک تیکی بادەن لە دژی یەکتر بە هیچ جوریک.

٥ لە رودانی ناخوشی طرفین - ئەو دو لایە ئەو روداوە بوخته حەل ناکەن. بەبی گورانەوەی بیر و باوەری هەر دو لا نەبی. وە ئەممش لیژنەی حکمی پی لی ئەهیی ئەگەر بە پی ویست بزانری.

٦ ئەو پەی مانی عدم تعدیە - دە سال مەودای هەیە ئەگەر لە پیش

تەواوبونی ئەو مەودایە بە ساڵێک ئاگاداری یەکتر نەکرابو تازەکردنەوەی ئەو پەیمانە وە یا هەڵ وەشاندنی ئەو پەیمانە پێنج ساڵی تر لەسەر شێکلی ئوتوماتیکی دەوام ئەکاتەوە.

٧- ئەو پەیمانە لە نزیک ترینی کاتا لە برلین بە مورکراوی تەواو ئەبی و لە پاش مورکردن ئیشی پی ئەکری.

١٩٣٩

مولوتوف ٢٣/ آبی ١٩٣٩ وەزیری دەرەوەی ڕوسیا

رونبتروب وەزیری دەرەوەی ئەلمانیا

مور - ئیمضا

بو پەلاماردانی بولونیا پێشنیشارەم بە ستالین کرد. ستالین بڕیاری لەسەر ئەو نەخشەیەم دا. بە مەرجی هەندی ئەرازی لە خاکی بولونیا - بەدریتی کە گەر پێ ویستی پێ هەبو منیش بەڵێنم دایی کە بەشی بدەم.

روژی ١/ایلولی ١٩٣٩ ئیعلامی جەنگم لەگەل بولونیادا کرد. و انکلیس و فرانساش لە ٣/ ایلولی ١٩٣٩ لەسەر بولونیا هاتنە جواب و ئیعلانی شەڕیان لەگەڵ کردم دەوڵەتی بولونیام - بە ٧ ڕوژ لەناو هەلگرت ڕوسیا بە بی شەڕ و هیچ زیانێک بەسەر لاشەی یەک کەوتوی پولونیای - ڕوژهەلات نیشتەوە.

مەبەستی ڕوس بەرام بەر بە ئەڵمان بە پی ئیعترافەکانی هتلر

بۆ گرتنی فرانسا و بریطانیا ئیشارەی عەسکریم لە ستادی لشکری گشتی داوا کرد. و تیم گەیاندن ئەگەر ئیمە وەخت ئەوەندە دور بخەینەوە.

لەوانەیە - هولندە - سویسرە - لوکسنبرغ - بچن بە دوستی دەولەتانی ڕوژئاوا.

لە ئاکاما فەرماندەکان ڕەزامەندی خویان نیشاندا کە پەلاماری ئەو دەولەتە بیلاینە گریانە بدەم وە مەرزیان تیک بشکینم. تەنها [ براوخیج ] ئەبی بەم پیش نیارەم ڕازی ئەبو و وتی جاری بام لەو فکرە بەری پێ هەتا حسابێک بو ڕوس ئەکەین. هیچ گومان نیە لە ڕوس کە گەڵمانا ئەکەویتە شەڕ. لە کاتیکا بلاومان بە هیزەکانمان کرد.

روس بیری پەلاماردان وە تی پەری نی هەیە بو ئەوروپا. خەیالیکی خلیجی فارس وە بالطیک وە بالقانی ـ هەیە وە ئەو شوینانەش نامالجی تای پەلی نیمن.

ئەو کاتەی کە ئەرازی فەرانسام تەواو کرد ئەم توانی بچم بو گرتنی ـ زورگە ـ جزیرەی بەریتانیا. بەلام لەم ناوەدا حسابیکی قول و وورد هەبو کە ئەم گرد. ئەوەش مەترسی پەلامارداتی روس بو.

چونکە لە کاتیکا کە من لەگەل انگلیس و فەرانسا لە جەنگا بوم. روس رووپای کردەوە کە غرفەیک عسکر بو کومەگی ئەلمانیا ئەنیری کە لەگەل فرانسا و انگلیسا شەر بکات بەلام من وەلامی ستالینم ـ دایەوە کە پی ویست بەم زەحمەتە ناکات. لشکری ئەلمان بو لەناوبردنی هیزی فرانسا و انگلیس ئەواناى تەواوی هەیە.

بەلام بە پی ویستی ئەزانین کە روس جبهەیکی شەر بکاتەوە لە ئاسیادا. پەلاماری ئیران تورک خلیج فارس ئەفغان چین هندوستان بدات هەتا ئەگاتە ئەوری زاپون.

وە مەبەستیشم ئەوە بو کە روس هیزەکانی بەم وەلاتانەوە سەرگەرمی شەر بکات بو ئەوەی ئەتوانی بە هیزەکەی ئەوروپا و ئیمە تهدید بکات. هەتا حسابیکی بو ئەکەم.

بەلام ستالین ـ وەلامی دامەوە کە ئیمە ئیش مان بە روژهەلاتی ناوەنجی یە چونکە پی ویست مان بە [ ئەوت ] نیە و کەلوپەلی وازادیش مان نیە کە بەم وەلاتە هەزارانەی بفروشین لە ناکاما لەگەل ستالین ریک کەوتین کە لە روژهەلاتو روژئاوادا هەندی ئەرازی بەش بدەم.

بەلام ستالین ـ هەر گرەگری ئەوەی بو کە لشکرەکەی بخاتە ناو ئەوروپاوە و شەری پی بکات.

هەر سی کوشانی کە بو راگرتنی ئەو بیرەی ستالینم بەکار هینا بی سود بو. وە لە ژیرێشەوە انگلیس و روسیا کەوتبونە مذاکرەی ریک کەوتن. چونکە روسەکان وا تی گەیشتون هەر لە فرانسا بومەوە پەلاماری روسیا ئەدەم

بەم هۆیەوە لە سەرزی فنلندە ـ و پولۆنیا ـ لشکریکی زور قورس یان لەسان دا بو.

بو بەراووردی هێز و معنویاتی روس چەند فەرماندەیکم نارد بو روسیا. و راپۆری ئامادەی وە خۆ کوکردنەوەی روسیایان دامی.

ئەمجا هێنتیکی عسکریم بۆ ریک کەوتن نارد بو روسیا بو دابەش کردنی ئەو ئەرازیانەی کە داگیرمان کردبون.

روسیا وەلامی ئەو لیژنەیەی دایەوە کە پۆلۆنیا و فنلندە چیکوسلوفاکیا هنگاریا بلغاریا یوغوسلافیا ترکیا ئیران رومانیای بە تەواوی ئەوی.

منیش وەلامی هێنتی داوبراوم دایەوە کە دەولەتی (رومانیای لی دەرچی ئەو بریارەیان لی قبول بکەن و ئەم داخوازە بکەن بە نەخشەی دابەش کردن.

روسیامان ۳ مانگ بەم فیلە خاواند. بەلام کە (دانکارک) فرانسا گیرا. ستالین کەوتە پەلە پەل. لای وابو جەنگ کوتاهی هاتوە.

بە پەلە داوای تصدیقی دابەش کردنەکەی لی کردم. لە دژی ئەوەی کە هەتا ئەو حەلە بە بی شەر لە بالتیک و بسارابیا و بیکوفینای رومانیا. فنلندە بولونیا ـ چەند پارچەیکی باشم پی دابو.

ئەمجا ناچار بوم ـ هیرهیسم ـ نارد بو انگلترا لە ۱۰ / آزاری ۱۹٤۱ لەگەل انگلیسەکان کەوتە وتوویژ. بەلام وەلامی انگلیسەکان ئەوە بو. کە ئەلمانیا لەگەل روسەکان نیەلاتی جەنگ بکات. جا ئەو کاتە انگلیس لەگەل ئەلمانیادا ریک ئەکەوی

لەبەر ئەوەی کە موقفی ئەلمانیا زور گرنگ وە جی مەترسان بو مولوتوفی ـ وەزیری دەرەوەی روسم بانگ کردە بەرلین ـ مولوتوف ـ پی ووتم ئەبی باقی ماندەی دەولەتی ـ فنلندەمان ـ بخریتە دەست. وە پاشایەتی ـ رومانیا ـ ش لەناو بچی. و بخریتە ژیر چنگی ئیمە. و نەخشەی ئەرازی دابەش کردنەکەش بە پەلە ئەبی مور بکری.

لەسەر ئەم داخوزە پر مەترسیە لە روژی ۲۲حزیرانی ۱۹٤۱ پەلاماری روسیام دا.

جا هتلر بەم داخواز و داوتەڵەبانە ـ روسیا تاوان بار ئەکات بۆ ئەو خوێنەی که له نێوانی هەردوکیانا له ماوەی ٧ ساڵا رژا.

بەڵام ستالین له ٣ تموزی ١٩٤١ هاوارێکی به گەلی روسیادا راگەیاند. هیچ باسی ئەو تاوانانەی تیا نەکرد که هتلر ستالینی پێ تاوان بار کردوە. و هیچ هەڵێکی به درو نەخستەوە لەو تاوانانەی که داهێنی به سەرشانی ستالینا.

ستالین تەنها ئەوەندەی بڵاو کردەوە. که لەوانەیە پێ مان بڵێن بۆچی ستالین ـ ئیتفاقی لەگەڵ هتلر و ریبنتروپ ـ دوڕندە کردوە.

بەڵی روسیا ناچارە بۆ ئاشتی و سودی هاو جەماوەری لەگەڵ هەمو دراوسێ یەکی خۆی بەندی ئاشتی و دوستایەتی بەستێ هەر چەند که دراوسێکەمانیش دڕندە و خوێن مژ بێ.

هتلر بەرامبەر بەو بەڵێن و تامیناتەی که به ئیمەی دابو ناپاکی نیشاندا له ناکاو به ١٧٠ فرقە سەربازی ئامادەی جەنگی پەلاماری ئیمەی دا. وه پەیمانی هەمو ئەمەی ـ شکاند. به بێ حرمت و ریزەوە ناو ئەرازی ئیمە کەوت.

بەڵام مادامێکی ـ ئیحترام و ریزی یاسای دەولەتی نەگرتوە بەسەرهاتی ئەویش وەکو بەسەرهاتی ناپلیون ـ ئەبێ له روسیا.

ئای بی ئێن

ئەڵمانیا که دارای گیانێکی ئاوا خەیانەت کارانە بو بەرامبەر به روسیا ئەلعەبو بەم پێ یە پەلاماری دەولەتێکی ئاوا حەساوەی سەرکێش بدات. خۆزایه به هەر ئەساع و فێڵێک که گونجا بایە ناوچەی جەنگی بو روسیا دروست بکرایە. و ئوردوەکەی بڵاو کردبایەوە به ناو جیهانا. و لشکرەکەی به شەڕی وڵاتان ماندو بکردایە.

ئەوجا له ساتی ماندویەتیدا پەلاماری بدایە. ئەو وەختی هرهیس ناردبو ئینگلترا که پیلانەکانی هەمو ئاشکرا بوبون. فێڵەکانی ئەڵمان و روس له لاین ئینگلیسەکانەوە رون بوبونەوە.

بەڵام لەبەر ئەوەی که هەردولایان به گیانێکی ناپاکانە لەگەڵ یەکترا

ئەڤیان. هیچ یان بڕوایان بە یەکتر نەئەکرد کە بە پەیمانی یەکتر بڕون بەرپە
هەموو وتوویژێکی یەک تریان بە درو ئەزانی بویە هەتا ئاخر پلەی دوستایە
هیچ هنگاوێکی حسابیان بو یەکتر دانەنا.

تەماع و خیانەتی هەر دو لایان بو بە هوی تیاچونی ئەلمان وە ئەمخو
کەوتنی روس بو مەودایکی دور. وە لە ناوچونی زور دەولەتەکانی لاین گ
هەر دو لا ـ وە خوش بەختی ئەمەریکا لە جیهانیکی برسی و سەرگەردانیدا.

لە پیش جەنگی هتلریدا خەلک وای ئەزانی کە روسیا هیزی عسکری
جنگاوەری زۆر بی هیزە.

وایان ئەزانی کە پەمزی شیوعیەتەوە ئاژاوە وە ناڕزایەتیکی زۆر
روسیادا هەیە. ڕوسیا ناتوانی لە هیچ جەنگیکا سەر بکەوی. چونکە روس
هەندی فروفیلی عسکری لەناو دەولەتی ئەسپانیا ـ لە ١٩٣٦دا وە لەنا
فنلندە ـ لە سالی ١٩٤٠دا بەکار هینابو. بەتەواوی بیروباوەری خەلکی برد
سەر ئەو بارە کە روسیا لە هیچ جەنگیکا سەر ناکەوێ

تومەز ئەو شکان و هەلاتن و تسلیم بونەی لەناو ئەو دو دەولەتەدا فیلیک
تاک تیکی عسکری ـ بو کە هەندی دەولەتی زوردار بە هەلە بەری بو گۆڕان
حساب وە تەوازونی سەربازی.

بەلام لە جەنگی هتلریدا دەری خست کە نظامی بولشویکی شتیکی هەر
بە پیز وە خاوەنی تەوانا و بەرگری یە. وە سەربازەکانیشی بلیمەت تری
سەربازن لە گوتاو و ڕوی جنگاوەری وە قارەمانیەتی لشکرکەشیدا.

بە کوژرانی ١٠ ملیون سەرباز وە ویران کردنی ٧٥ شاری گەورە وە ٧٠
هەزار دی و لەناوچونی ٣٠ ملیون ئاژاڵ ـ روسیا مقدرەتی عسکری خۆی
نیشانی جیهاندا.

بەلام بەرام بەر بەم گەورەی وە گیانی پتەوی سەربازیەیان لە ١٢ لاو
دەلاکەیان ـ خستە لاشەی روسیاوە کە هەتا مەودایکی زور ئەو نیشانانەیان
هەر پی وە بی نی تەوە وە هەموکەس بتوانی حسابی سیاسەت و مقدرەت
یان لەگەلا بکات.

١ - سەرکەوتنی ئەوروپایان ئابیتە بەڵگەی ئەوەی کە روسیا هەمیشە سەرکەوتو نەبی. چونکە روس ٢٥ سال بو خەریکی ئەو کوکردنەوەیە کە لەم جەنگەدا بەکاریان هینا.

٢ - کاتی روس ئیعلامی جەنگی لەگەل ئەڵمانیا دا کرد. ئەڵمان ٣سە ساڵ بو لە گرمەی جەنگا بو. سەربازە وەرزش کراوەکانی بە زوری یا کوژراو یا بیندار کرا بون.

٣ - ئەلمانیا بەهوی پەیمانی عدم تعدی ـ لە هەندی پیلانی پەلاماردان و پیلانی جەنگی بەرامبەری و ئاگاداری محلی ناوخویی ـ بی ئاگا مابووە. و لە کاتیکیدا نەی توانی ئەو هویانە پر بکاتەوە.

٤ - بە هوی قەدەغەی زەرباکان ئەڵمانیا لە زور شتی پێ ویست ناهومید بو.

٥ - روس جەنگی لەگەل دەولەتیکا نەکرد کە ئەو دەولەتە لە معلوماتی ناوچە و مەڵبەندی ئەو دەولەتە بی ئاگا بو. وە روسیش بە هەمو کەلو پەلیکی ناو خویا شارەزا بو. ئەی زانی هوی سەرکەوتنی لە لە باریکەوە بو ییک دی.

٦ - روس بەرگر بو نەک پەلاماردەر ـ مدافع بو نەک مهاجم

٧ - پەلر کومەگیکی گەورەی روس بو.

٨ - روس جەنگی بەناوی پارزگاری مبادی وە ئەکرد نەک بەناوی ئەتکی پیاو پەرووشی وەلاتان.

٩ - بەهوی ئیتفاقی عدم تعدی ـ ژاپان ـ روس لە مەڵبەندی ژاپان و ئارامی هیلیکی دوهەمی جەنگ پشت ئەستور بو

١٠ - روس ـ جەنگی لە شوینیکا ئەکرد کە لە راست و چەپو پاشەوەی خوی ئەمین بو. لە ٣سە قولەوە بالوقە نەدرا بو.

١١ - هاوری وەکو انگلیس و ئەمەریکای هەبو بو هەندی کومەگی

بەرزی دەولەتی ئیتحادی جماهیری شورەوی لە یەزدان داوا ئەکەن.
ئەحمەد قوام

تلگرافی ئاستالین بو قەوام

سەرکی وەزیرانی دەولەتی شورەوی بڕواری ۱۹ فەروردین ۱۳۲۵ تهران - ٩٤٦/٤/٨

جنابی ئاغای قوام السلطنه وەزیری یەکەمی ئیران بە هوی گەیشتنی تلگرافی دوستانەی جنابعالی لە بارەی تی کوشانی مذاکراتی نیوانی دەولەتی شورەوی و ئیران کە بە شیوەیکی زور بە نرخ هەولتان داوە. رابیتەی سیاسی گوزاری خوم پیشکەش ئەکەم. ای. ئاستالین
نخست وەزیری جماهیری اتحادی شورەوی

قضیەی ئیران لە سازمانی ئومەمی متحدەدا

لە ٢٦ فەروەردین ١٥ نیسان ٩٤٦ادا لە لاین دەولەتی ئیرانەوە نومایندەی ئیران ئاگادار کرا. کە لەبەر ئەوەی ئامیناتی تەواو لە نیوانی ئیران وە شورەویدا پەیدا بوە.

پی ویستە بە پەلە داخوازەکەی ئیران لە شورای ئەمنیەت وەبگریتەوە.

سەروکی شورای ئەمنیەت لە کوبونەوەی ٣٦دا دەری بڕی کە هەتا راپوری کومیتەی کارشناسان - بە مەکتەبەی گشتی سازمانی وەلاتانی یەک گرتو بەگات. شورای ئەمنیەت بڕیار نادات بو دەرهاویشتنی باسی ئیران لە مجلسی شورای ئەمنیەت.

کرومیکو - ووتی بە پەروشە ئەلیم کە لیژنەی کارناسی ئەمنیەت گیروگرفت و ئاژاوە ئەخەنە ناو ئیشەوە. وە ئەم ئیختلاقەش پی چەوانەی دەستوری سازمانی ئاشتیە کە دەولەتیکی ئازاد لە مافی ئازادی خوی بی بەش بکری

شورای ئەمنیەت هەرگیز ناتوانی باسی ئیران بە جزئیکی دەستوراتی شورای ئەمن ناو بی تی.

مەبەستی هەندی لە نومایندانی مجلس ئەوەیە کە دریژە بە قضیەی ئیران

بدەن. لەمەولا هەر کەسێک لە بەسەرهاتی ئێرانەوە بدوێ مانای ئەوەیە پارەیکی قەڵبی بەرەوڕو ئەبێتەوە.

گرومیکۆ ـ لە دژی نوێنەرایەندەی انکلیس و ئەمەریکا وتی. لەم شورەوی لە بابەتی ئێرانەوە ناچێتە ناو باس و خوایسی مجلسی نوێ متحدەوە. شورەوی چوار شەممە ئەولی خرداد ۳۲۵ ۹٤٦/۸/۲۲ دو مسئلەی ئێران لە سازمانی وڵاتانی یەک گرتو هاتەوە ناو باس.

ئەو راپۆرەی کە لە لاین قوام السلطنە لەبارەی چوڵ کردنی ئێران لە شورەوی درابو. سید علاء نوێنەرایەندەی ئێران لە شورای ئەمنیەتا خوێندیەوە.

نوسرا بو کە هێنتی بازرسی ـ تەفتیش ـ شاری تەوریز شەش شاری ئازربایجانا پشکنیوە. هیچ مهمات و ئوردوی روسیان تیا نەدۆزیوەتەوە.

نوێنەرایەندەی ئەمەریکا هەڵی دایی وتی راپۆری کە بە ئێران گەیشتوە تە نیە. ئەو شارانەی کە باس کراون. بەشێکی ئازربایجانە. ئازربایجان هەر شارانە نین. زور شاری تر لە ئازربایجانا هەیە کە نەپشکینراون.

پی ویستە شکایەتی ئێران هەر لە سازمان ئومەمی یکدی گیرا بی نیت هەتا روداوی ئێران بە تەواوی رون ئەبێتەوە.

نوێنەرایەندەی انگلیس تایدی نوێنەرایەندەی ئەمەریکای کرد. بەلام نوێنەرایەند [ بولونیا ـ مخالف وەستاو وتی مادام شکایەت لە ئەصلا عائدی ئێرانە. ئێرانیش داوا ئەکات کە کاری ئێران تەواو بوە هیچ حەقی راگرتنی ئە سکالایەمان نیە.

نوێنەرایەندەی بولونیا ـ بە سید علای وت لەو باوەڕەدا نیم راپۆری قو راست بی. شورەوی ئێرانیان چوڵ کردوە. بەلام هێزیک یان لە چەتە سەرکێشەکان پێک هێناوە. کە لە ژێر چاوەدێری شورەویدا ئێش یان پی ئەکری وە ئەو هێزی پێکر و چەتانە لە چونی هێزی ئێران بو ئازربایجان سەرپی چ ئەکەن.

روژی ٤ خرداد ١٣٢٥ ـ ٩٤٦/٥/٢٥ دا بەیان نامەیک لە لاین نخست وەزیری ئێران بلاو کرایەوە کە لە ناکامی لی کۆڵینەوەدا کە لە لاین هێنتی

پاریسی ئازربایجان کە چوون بۆ تەوریز وە شارانی تابعی تەوریز ـ تاییدی
ئەوە ئەکەن کە هێزی شورەوی شارەکانی ئازربایجانیان بە تەواوی چۆڵ کردوە. وە
پۆلیسی هەمان بەیان نامە بە تلگراف درا بە نومایندەی تهران کە [واشنگتون]
کە دریژی ئەو باسە بخاتە بەرچاوی شورای ئەمنیەت پێ رابگەیەنێ.

وە بۆ باوەڕ پێ کردنیش نامەی تاکیدی سفارەتی شورەوی لە خوارەوە
پێشکەش ئەکرێ.

جنابی ئاغای قوام السلطنە سەرەک وەزیری تهران

لەسەر بڕیاری وتووێژی دەمەتەقێ بێ مان بە پێی دەستوراتی شورەوی لە
٢٢ مە ساڵ ١٩٤٦ بە کەماڵ ئیحترامەوە تاکید دوبارە ئەکەمەوە. کە لەسەر
بەشەی تخلیە لە ستادی ناوچەی نیظامی قەوقاز لە ئاخر و ئوخری مانگی
مارس کە باسمان لێ کردبو. ئەوا لەم ساتەوە بە تەواوی بە ئەنجام گەیاندرا و
ئێران لە قشونی شورەوی چۆڵ کرا. تکایە ئیحتراماتمان قبوڵ بفەرمون.

سادچیکوف

سەفیری جماهیر اتحادی شورەوی    دانیشتوی تاران

| تێ بی نی

وتانێ و بەڵگەی لەمەوپێش. خوێندەوارانی ئەو نوسراوە ئاگادار ئەکاتەوە.
کە بەسەرهاتی کوردستان و ئازربایجان لە کونگرە مجلیسە گەورەکانی
ئێستەیدا چە هەرایەکی لەسەر کراوە. روسەکانیش چۆن لەسەر پێگایەکی
لاوەیدا بۆی چوون،

چونکە بە ئاشکرایی روسەکان نەیان توانیوە هیچ باسی سەربەخۆیەت وە
مانەوەی ئازربایجان وە کوردستان لە شورای ئەمنیەت بکەن.

ئەوە وتانێ و بەڵگانە تێ مان ئەگەیێنن ئەو هەمو هەرا و ئاژاوە و بەزمەی
کە روس لە ئازربایجان وە کوردستانی مهاباد پێکی هێنابو. هەموی هەر بە
ئامداسی ژێر لیوان و ژێر پەردە بوە. هیچی بە رەسمی دانی پیا نەنراوە.

چونکە زانیویەتی کوردستان دروست کردن بە بێ خوێن ڕژانێکی زور گەورە

ناهێته وجودەوه. ئەودەوڵەتەی که بیەوی کوردستان دروست بکات. دوچاری هەڵمەتیکی گەورەی جیهانی ئەبێت.

کوردستان دروست کردن. ئەبی به پەنجەی انگلیس ئەمەریکا وە یا نە روس - پیک بێ.

هیچ کامیک لەو دو ئوردوگایەی ڕۆژهەلاتو ڕۆژئاوایە بە بی سود و قازانجیکی گشتی خۆیان بۆ کورد ناهینە ناو جەنگەوە وە تەنها لەسەر سودی کورد خۆیان ناخەنە مشکلاتی جیهانیەوە. ئەگەر روس - توانی بای کوردستانیک دروست بکات هەر لەم ئاژاوەی کە لە مهاباد و ئازربایجان ئابویەوە. دەستی لە کورد نەئەکیشایەوە. کوردستانیکی لە ئیرانا پیک ئەهینا وه یا هیچ نەبوایە جاریک لە سازمانی ئومەمی متحدەدا لەسەر کورد ئەمدایە جواب. کە کورد گەلیکی بەش خوراو و پاشکەوتوە پی ویستی بە کومەکی وە بەرزکردنەوە هەیە.

بەسەرهاتی ئەوتەکەی ئیران - دەری ئەخا کە روس لەم ئاژاوە و هەڵ گەڕانەوە و هان دانەدا. مەبەستیکی ئیستعماری بەکار هیناوه. نەک مەبەستی عدالەتو وجدان پەروەری.

بو هەمو زاتایک رون بوە کە بە ریک کەوتنی شەریکەیکی ئەوت لە ئیرانا - ئازربایجان و کوردستانی خستەوە چنگ ئیران.

تەنها بە بریاریکی فیلاوی قوام السلطنه ئەو هەمو ئازار و جەفایەی بە سەر ئازربایجان و کوردستان هینا. بە هەزاران خانەوادەی کورد و ئازربایجانی لە ناودا.

بوچی بو ئەوتی شمالی ئیران - بوچی بو هەندی مەرەکەبی - سەرقاڵەمی ئیتفاقی شرکەتی ئەوتی محتلی ئیران و بڕیارە - تصدیق نەکراوەکەی ئەوت. جا من لەو باوەڕەدام کە کوردستان دروست کردن زور بە ئەرک وە ئازارە. هیچ گەلیک ئەوەندە خاوەن هونەر و ضمیر نیە بە بی سودی خوی لەسەر کورد هەڵداتی.

چونکە کوردستان مەرکەزیکی حساسی ڕۆژهەلاتو ڕۆژئاوایە هەر دو

ئەوروپا و ئەمریکا چاویان بڕیوەتە ئەو هێڵەی کە پێی ئەڵێن کوردستان و پردی نێوانی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا و کلیلی قفڵی هیندوستان و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.
ئەو دەوڵەتەی کە بیەوێ کوردستان دروست بکات ئەبێ حاکمیەتی بەسەر تورک ئیران و عیراق و سوریە دا هەبێ. دەوڵەتێک ئەتوانێ کوردستان دروست بکات کە هەمو ئاسیای لێ مسئول بێ.
چونکە دوژمنانی کورد ئەمڕو لەوپەڕی وریایی و چالاکی دان. هەر دەوڵەتێک کە بیەوێ لەگەل کوردا تشریکی هاوری بەتی بکات. وە دەستی ئەسوری بو کورد ڕابکێشێ دەوڵەتە ناحەزەکانی کورد لەگەل ئەو دەوڵەتەدا پێکای جەوتی و دوژمنایەتی ئەگرنە پێش. وە ئەبێ بە دوستی ئەو دەوڵەتەی کە بەم لضیە ـ دڵتەنگ وە ناڕێکە.
کورد لە ئێرانا تەشکیلی ٣/١یەکی ئێران وە لە تورکیا چواریەکی تورک و لە عیراق چواریەکی عراق وە لە سوریا شەشیەک سوریا ئەکات.
هەر دەوڵەتێکی ڕوژئاوا ڕوژهەڵات کە بیەوێ کوردستان دروست بکات. ئەبێ لەگەل ١٢٠ ملیون عرەبی خاوەن ئیستقلال و باوەڕ پێ کراو و خاوەن لەشکر و پارە و ٣٠ ملیون تورکی جەنگ ئاوەر و ٣٠ ملیون فارس بکەویتە بارێ ناخوشی و پچکرانی علاقەی دوستایەتی بۆ چی وە لە سەرچی.
لەسەر دروست کردنی کوردستانێک کە ئاگاتە ١٥ ملیون وە بە مەودایکی دوور وە بە ئەرکو ئازاریکی زۆر دەرەنگ ئەمجا ئەم دەوڵەتە ئەتوانێ سود لە کوردستانە دروست کراوەکەی وەر بگرێ. کە ڕێگای هندوستان و ئاسیای لەسەر خۆ ڕاهست لەبەر کوردستان دروست کردن.
هیچ دەوڵەتێکی ئیستعماری ئەوە ناکات چونکە هەر دەوڵەتێک کە ئەوە بکات مانای ئەوەیە غلەتێکی گەورەی لە سیاسەتی ئیستعمارێدا کردوە.
لە کاتیکا ئەو دەوڵەتە ئیستعماریانە یارمەتی کورد ئەدەن وەکوردستان دروست ئەکەن. یا دەوڵەتە ئیستعماریەکان خۆ بە خۆ بیانەوێ پەلاماری یەکتر بدەن وە بە کوردستان دروست کردن تهدیدی سودی یەکتر کەن وە بە کورد. یارمەتی هەندی قابلیەتی سیاسیانەی یەکتر بەکار بێ نن ـ وە یا دوژمنەکانی

کورد دوچاری غەڵەت ـ بوبن وە کەوتنە جەبهەیکی دژ بەرامبەر بەم دەوڵەت
کە لەگەڵ دوستەکانی عرب و تورک تیهران ـ ناحەزیەتی پەیدا کردوە.
کاتیکی ناوادا بو رەدولفعلی سیاسەتی وە تەوازونی قوا ـ بەرگری هیز و تەک
ـ دەست لە پشتی کورد ئەدەن وە ئەی خەنە بەرچاو.

وەکو انگلیس لە ۱۹۱۹دا بو وەرگرتنەوەی لوای موصل هینای ش
محمودی بو دروست کردین ـ لە زدی تورکەکان وە روسیش لە بەسەرهات
۱۹٤۱دا قازی محمدی ـ بو پیک هینایین بو چنگ کەوتنی نەوت وە هەند
مصالحی لە تیهرانا.

هەر کوردستانیک کە بە دەست کاری وە سیاسەت ئیستعماری پیک
هەر ئەو مصرەی ئەبی کە لەگەڵ شیخ محمود و قازی محمدا پیک یان هینا.

جا بو ئەوەی کە برایانی کورد لە سیاسەتی ئیستعماری عالەمی ئاگا
بکەمەوە. ئەوا باسی بەسەرهاتی کوردستانی قازی محمدتان بە ووردی
ئەنوسمەوە بە ئەوەی کە کورد. سود لە غلەتەکانی خۆی وەربگری. وە
قابلیەتی خویەوە بی تە مەیدان داوای مالی ئەتەوایەتی خۆی بکات. ئەوە
مللەتانی ئیستعمار بکات بە جیگای هێوا و روناکایی داهاتوی.

هەر هوزیک کە بە تەوانای یەکیەتی خوی نەهیتە میدانەوە. لە دوا روژا
بەدناویو توزان سودیکی تر وەرناگری.

وە ئەو مللەتانەی کە بە قابلیەتی خرشیان هاتونەتە میدانەوە بە هیزیک
کەمی خویانەوە بەرامبەر بە هیزە گەورەکانی دوژمن راوەستاون وە لە هەم
لایکەوە. ملک و وەلات یان بەو دوژمنە گەورانە چوّل کردوە. وە نەخشە
سیاسەت و ئیستراتی جی جیهان یان گوریوە.

قابلیەت دەوڵەتانی ئیستعمار ئەکا بە هاوالی راستەقینە وە بە دەورە
مەبەستی خویا ئەی سورینیتەوە.

بی قابلیەتی کومەڵ ئەکا بە ئەوچیری ئیستعمار. وە بە بی مەبەست
ئیستعمار ئەبی بخلقی وە لەناو بچی!

***

## بەشی -٣- هەم

### تشکیلاتی کوردستانی مهاباد وە تێک چونی

لە ٣ ایلولی ١٩٤١ کە یەکەوتی مانگی شهری وەری تاریخ ١٢ شهریوەر ١٣٢ ئیرانی ئەکات. ئوردوی انگلیس و ڕوس وە ئەمەریکا بو پاک کردنەوەی هیزی ئەلمان لە ناوچەی ئیران وە قایم کردنی سەر ڕیگای یارمەتیدانی ئەلمانیا لەناو ڕوسیا بو ئیران - ئەو سە٣ دولەتانە داخلی ئیران بون - ئەمەریکا لە ناوچەی قم و شیراز وە انگلیس لە ناوچەی کرماشان و سنە وە ڕوس لە ناوچەی آزربایجان هەتا سەردەشت. بلاوەیان بە هیزەکانیان کرد. و عشائرەکان لە هەمو لایکەوە لە حکومەتی ئیران ڕاپەڕین.

یەکیک لەوانە کە حمە ڕشید خانی قادر خان زادە - لە خانەوادەی بانەی بو - لە داروخانی عراقەوە. بە هیز و دەستەیکی کەمەوە چو سەر هیزی دەولەتی ئیران لە شاری بانەدا.

بە ماوەدایکی زور کەم توانی شارانی - بانە - سەردەشت سەقز - بگری وە هەتا دیواندەرە بچی وە لە سنە - نزیک بیتەوە.

بەڵام لەبەر منافسەی نفوزی ئیستعماری ڕوس و انگلیس و مەترسی یەکگرتنی کرماشان - لە سالی ١٩٤٤دا تشکیلاتی سقز و سەردەشت و بانە . گرایەوە که لە کاتی خۆیان بە دور و دریژی باسی ئەو سیاسەت و تشکیلاتە ئەکەین کە لەبەر چی وە بۆ چی لەو ناوچانە بەم زوانە ژیزی دەولەتی ئیرانیان گرایەوە.

بەڵام لەبەر ئەوەی کە - ناوچەی سابلاغ - نقدە - سندوس - سایینقلا - ... - بەر نفوزی ڕوس کەوتبو. ڕوسەکان نەیان ئەویست کە هیزی ئیران لەو ناوچانەدا بکەویتەوە ئیش. سەرپەرشتی ئەو شوینانەیان - دابو دەست قازی

محمد ـ و هەندی سەردار عشیرەت لە ئەمسالی علی آغای دیبکری
عبدالله آغای مەنگور و قرەنی آغای مامەش ـ

### دەسانچەی ئاژاوە لە سابلاغ ـ دا

لە آخری مانگی ئازەری ۳۲٤ دا چەند نەفەریکی ـ پولیس ـ دژباتی
ئیران کە لە سابلاغ مابونەوە. لەلاین سەرکردەی ئاژاوەی ئەوڕوژە [عزیز علی
یاسی کندی فیض الله بەگی ـ و هەندی لە لاوان و گەنجانی سابلاغی
پولیسانەیان دەر کرد. وە پینج نەفەری پاسەوانیش یان لی کوشتن.
هیز و نفوزی دەولەتی ئیران بە تەواوی لە سابلاغ دور خرایەوە. ئەمی
حزبی دیکراتی کوردستان بەسەربەستی خوی ئاشکرا کرد. وە پەردەی نهینی
ڕوی خوی لادا.
وەکو بانگەکەی بیلالی حەبەشی ـ بە ئاشکرایی بانگی کوردستان درا
لە ۲٦ مانگی ئازەر کە ریکەوتی ۱۷ کانونی یەکەمی ۹٤٥ ئەکات آلای
حکومەتی یان داگرت و آلای کوردستانیان لە جیگادا گەل کرد.

### تشکیلاتی کوردستانی ئازاد لە سابلاغا

لە ۲٦ کانونی یەکەمی ۹٤٥دا کە ریکەوتی ٥ دەی ۱۳۲٤ ئازەری
ئەکات. قازی محمد کونگرەیکی زور گەورەی گرت ئاغوات و سەرداراتی
عشائری کوردی رضائیە و سنە و کوردی تورکیا و کرماشان و عراق و هەل
بژاردراواتی شارەکانی ئیران. لەو متینگەدا کوبونەوە. بەناوی پیشەوا و
رهبەری کوردستان و رئیس مجلسی موسسان و هیئتی مللی ـ قاضی محمد
هەل بژیدرا. وە بە دروشمی پیشەوای کوردستان مفتخر کرا.
ئەمجا حمە حسین خانی سیف بە جلی جنرالیەوە ـ بلاوی کردەوە کە جنابی
قازی محمد بە پیشەوا و سەروک کوماری کوردستان هەل هەل بژیرداوە و بە
ناوی هەمو دانیشتوانی کوردی ئیران و وەلاتان پیروزبایی لی کرد.

و قازي محمديش ـ دوباره به سيپالي رەسمي اونيفورم سوپاسي له هەمو ملله‌تي كورد كرد كه بو ئەو فەرمان و مەنسەبە ـ بە خاوەن ڕيزيان زانيوە.

وە لەو ڕوژەدا لەلایەن ئەنجومەني مللي و حزبي ديمكراتي كوردستان هەمو ويه دەسەلاتيک درا به قازي محمد.

وە له ١٤ كانوني دوهەم ٩٤٦ دا قازي محمد كوبونەوەيكي گشتي له سابلاغ پێک هينا وە بەم پي به سويندي خوارد.

سويند ئەخوم به قورئاني پيروز به نيشتماني شەرافەت مەندي هوزي كورد بەم ئالا پر افتخارەی كه له سەرمان ئەلاڕيتەوە هەتا ئاخر تنوكي خوينم له ڕيگاي ئازادي وە بەختياري كوردا تي بكوشم وە دواتەكەوم. به سەروكايەتي جمهوريەتي كوردستان و به يەک گرتني كورد و ئازربايجان ئەنازم. وە تي ئەكوشم بو مانەوەي ئەو ئامانجه له داهاتودا.

وە له ٢٢ كانوني الثاني ٩٤٦ و كونگرەيكي زور گەورە له شاري سابلاغ له ميداني ـ چوارچرا ـ گيرا. و ئەو ناوچەیە لەگەل هەمو شاري سابلاغدا. به ئالاي ڕەنگاوڕەنگي كوردستان وە جوان كراني شار به شيوەيەكي جەژني مللي گەورەي كورد ـ ڕازايەوە.

قاضي محمد ـ چو سەر بەرزایيک كه بوي ڕيک خرابو وە لەوي خطبەيكي دا ووتي ئاميتان ئەكەم كه كورد لەمەولا له خاكي خويا ئەژي وەكو ملله‌تاني سەر زەوي.

كوردستان دوستيكي زور گەورەي هەيە بو دامەزراندن و تثبيت كردني ئاوەري مصيري. وە له ئيستاوە جمهوريەتي كوردستاني زاتي دامەزرا ـ وە لەم كاتەوە كورد خاوەني كوردستان و حكميكي زاتي خويەتي ـ

وە له ١١ شباطي ١٩٤٦ لەو زاتانەي خوارەوە تشكيلي وزارەتي كوردي كرا

١ - سەروكي كومار و سەروكي پارتي ديمكراتي كوردستان ـ قازي محمد
٢ - حاجي بابه شيخ ـ سەروكي وەزيران
٣ - محمد حسين خاني سيف قاضي ـ نائبي رئيس الوزراء وە وزيري

برگری

٤- منافی کریمی ـ نایبی رئیس الوزرا وه وزیری معارف

٥- سید محمدی ایوبیان ـ وزیری تندروستی

٦- عبدالرحمن ایلخانی زاده ـ وزیری دەرەوە.

٧- اسماعیل آغای ایلخانی زاده ـ وەزیری مواصلات

٨- احمدی اللهی ـ وزیری اقتصاد

٩- خلیل خسروی ـ وەزیر ایشوکار

١٠- کریم احمدیان ـ وەزیری پەست و تلگراف

١١- محمد امین معینی ـ وزیری کشوەری

١٢- ملا حسین مجدی ـ وەزیری دادگستری

١٣- محمودی وەلی زاده ـ وەزیری کشتوکاڵ

١٤- صدیقی حیدەری ـ وەزیری پروپاگنده

١٥- حاجی مصطفی داودی ـ وزیری تجارەت

١٦- وهابی بلوری

١٧- حسین فروهر

بەلام لەبەر ئەوەی کە قضیەی کورد لەگەل بەسەرهاتی ئازربایجان لە ریگای سیاسی وە نەخشەی لشکری و مواصلات نیوانیکی زوری هەبو. ئەو ئەهمیەتەی کە بە پیشکەوتنی ئازربایجان نەدرا بە کوردەکان نەدرابو.

بەڵکو لەوکاتەدا روسەکان نەیانەویست کوردەکان لە ئازربایجان ببستن. وە لە لاین ئازربایجانەوە هەندی فەرمانو پیش هاتی یان تەماشا بکری. هەتا ئەو کاتەی کە خۆیان مەبەست یانە.

قضیەی کورد وەکو ئازربایجان لەگەل حکومەتی مەرکەزی ئیران لەبارەی جیابونەوە نەخرابو سەر قاقەز. هەر لەسەر نەخشەی پیشوی ئیران کوردستانی ئاوچەی رزائیە ـ بە مربوتی ئازربایجان ناو نەهینرا.

چونکە نەخشەی ئیران ئاستانی ٣ و ٤ یعنی تەوریز و رەزائیە بە هەمو ئاوچەیک یەوە بە ئازربایجان داتەنی سقز بانە سەردشت بوکان سابلاغ نغدە

سندوس ماکو مياندواو ـ بە ئاستانی ٤ رزانيە لە قەلەم نەدرا بەلام روسەکان لە ژێرەوە بە واداریکی گەورە وە کوردستانيکی ٢٠ مليونی قازی محمد ـ يان دڵ خۆش کردبو. بەلام بو ئەوەی کە انکليس و ئەمەریکا بە قضيەی کوردستانەوە تهديد نەکرێن وە نەکەونە تەلاشی تیکدانەوە. جاری هەر بە تشکيلاتی ئازربايجان اکتفا کرابو.

مثلا لە مەودای ٢٠ رۆژا ٤٠ شاريان تسليم بە ئازربايجانيەکان کرد. لە ئازربايجانا.

بەلام لە مەودای چوار سالا ڕوسەکان سقز و بانە و سەردشت يان دەست کوردەکان نەخست.

دوهەم هەرچەندە کە شاری سقز و بانە و سەردشت مەربوتی ئاستانی ٤ رزانيە بو. بەلام بە هێلێکی رئيسی سنە و نەوتی کرماشان ـ نەدرايە قەلەم.

لەبەر ئەوە ڕوسەکان بەسەرپەستی نە ئەويران ئەو شارانە بە تەواوی بخنە ژێر ئيشغالاتی خۆيانەوە.

هەر چەندە لەو ئاخرەدا ناوچەی سقز و بانە و سەردەشت بۆ بۆ بە جێگای ئاژاوە و شورشی قازی محمد ـ بەلام روسەکان نەيان ئەويست ئەم شوێنانە بکەونە دەست کوردەکان.

بەلکو مەتەلێک بو لە انکليس يان داهێنابو. بو ئەوەی کە بە هوی ئەم ئاژاوەيە. لە هەندی بەرپەرەکانی منافسەی سياسی و عسکری لە ميراتی ئەلمان و ژاپان و ايطاليا ڕوس شتێکی پی ببڕی. وە ئەويش لەبارمتەی ئەو ميراتە بەشەيەی دا واز لە بەسەرهاتی کورد و ئەو شارانە بهێنی.

وە لە ڕيزی دوهەميشا. بە هوی ئەو شورش و ئاژاوەيەوە بتوانی کە هەندی مصلحەت لە ئيرانيەکان وەربگری. وە ئيرانيەکان بگرێتە لای خوی.

بەلام ئيرانيەکان لەوە حالی بوبون. کە ڕوسيا لە قضيەی کوردەکان هەر لەوەندە نداخل نەکات. هەتا ئيتفاقی نەوتەکەی بو مۆر نەکری.

بۆيە بە هيچ جورێک ئيرانيەکان ئامادە نەبون کە ئيعتراف بە هيچ بڕيارێک بکەن بو تسليم کردنی شاراتی سقز و بانە و سەردەشت. چونکە ئەيان زانی ئەم

تشکیلات سەربەرشتیە شتیکی وەختیە روسەکان بە هەندی تمماع و چنگ لەولی ئەو تشکیلاتو جیابونەوەی کوردەکان تیک ئەدەنەوە.

**پەی مانی ئازربایجان و کوردستانی قازی محمد**

لەبەر ئەوەی کە روسەکان ئەیان زانی بە ئاشکرایی دەست کاری قضیەی کورد کردن پرشنگی ئاگری شەری ۳ـەمەمی لی ئەگەشیتەوە.

وە لەو کاتەشا روسیا ئامادەی جەنگ نەبو. چونکە لە شەری ئەخۆشیک بریندار بو.

وە بو ئەوەی کە کوردەکان پشتیوانیکی وەهایان بیی ئەگەر لی یان قەومی دفاع یان لەسەر بکری. وە بەم ناوەشەوە چەک و خواردن و پوشاک یان لەسەر حسابی ئازربایجان بو تامین بکری. چونکە روسیا بە ئاشکرایی ئەنەویرا چەک و خواردن و کەلوپەلی پی ویستی شورش بە کوردەکان رابگەینی بەلام بەسەربەستانە یارمەتی ئازربایجان ئەدا.

آزربایجانیەکان لە ئەوەلی پەلاماردانی دەولەتیدا هەمو وینە چەک و خواربارێک یان چنگ کەوتبو. هەمو یارمەتیکی روس لە ناو ئەو تالانو گیرو دارەدا شیرەرا بووە.

بەلام کوردەکانی مهاباد هیچ گونە چەک و خوار و بارێک یان چنگ نەکەوتبو. وە لشکری روسیش لە ناوچەی کوردەکانا نەبو کە بەم ناوە شتیان چنگ بکەوی. روسەکان بەناوی چەکی تالانی ئازربایجان نزیکەی ۲۰ هەزار تفنگی برنەوی کورتو دریژ و ئەلمانی بچوک کە پی یان ئەووتن تفنگ زە الیهود ـ و صلیب وە [۵۰۰۰] دەمانچەی مارکە کولت و برنەوی پەرەبەلوم ـ وە دەمانچەی ئوتوماتیکی ۲۰ فیشەکی و ۳۱ تیری ئەمریکایی وە [۱۸] ئوتومبیلی باری و جەنگی لە مارکەی شکودا ـ وە چەند ملیون فیشەک و چەند صندوق بومبای زدی تانک ـ وە رەشاشی دژی فروکە وە روشاشی خندەک وە زور شتی تریان بەناوی ئازربایجانەوە دابو بە قاضی محمد.

کە ئەو چەکانە لە کاتی خویا ـ سرهەنگ ئەرفەعی ـ لە ئەلمانیا کری بوی

له بەرامبەر بە گەنم و جۆ. وە هەندی چەکی تر ـ کە لە لایەن ئەمەریکاوە بە ئیعارە و یارمەتی درابو بە ڕوس وە ڕوسەکانیش دابویان بە ئازربایجان.

جا بۆ ڕاپەڕاندنی ئەو فەرمانە عسکریە ئیتلافیە. ڕوسەکان لە ٢٣ نیسانی ١٩٤٦دا ئیتفاقیەک یان بە ئازربایجان و کوردەکان کرد کە مادە ٤ ئیتفاقی عسکری بو لە نیوانی هەر دو دەولەتی کورد و آزربایجانا وە لە مادە ٣دا پێک هێنانی لیژنەیەکی هەر دو قولی بو بڕیارەی ئابوری و ئیقتصادیاتی ولات.

وە مادە (٥) ئەوە بو کە هەر ڕیکەوتنیک لەگەل تهرانا بکەن بە ئیتفاق و ئاگاداری هەر دو لایان ئەبی بکری.

مادە ٢و٦ بریەتی بو لەوەی کە کوردەکانی ناوچەی میاندوئاو وە تەوریز وە ارومیە کە بە نسبەت تورکەکانی ئازربایجان ئەقلیاتن حقوقی ئیداری و ثقافی یان هەبی.

مادە ٧ ئەوە بو کە هەر دستە و بەرەیەک پیمەوی نیوانی یەکیەتی کورد و ئازربایجان تیک بدات معاقبە و سزا بدری.

نوماینەدەی کورد بو ئەو پیک کەوتنەی کە ڕوس بۆ هەردولای پێک هینابو بریتی بون لە ١- قازی محمد ٢- حمە حسین خانی سیف ٣- سید عبدالله گیلانی ٤- عمر خانی شکاک ٥- رشید بەگی هەرکی ٦- زیرو بەگی هەرکی ٧- قاری محمد قازی شنو ـ

وە نوماینەدەی ئازربایجانیش بریەتی بون لە . جعفەر پیشەوەری و حاج میرزا علی شبستری ـ ٣- صادق پادگان ٤- سلام جاوید ٥- محمد بیرنیا.

بەلام بەڕاستی ئەو ئیتفاق نامەی ئازربایجان و کوردستان زۆر جێگای سەرسوڕامان بو.

نە لە لاین دەولەتەکانی بیگانە وە نە لە لاین دەولەتی مەرکزی تهران ئیعتراف بە خودمختاری ئازربایجان و کوردستان نەکرابو. کە مافی ئازادی وە یا مسابرنەوەیان هەبە. کە بەلێن وە پەیمانیان لە دەرەوە و ژورەوە نرخیکی قانونی هەبی. هەر دو لایان بە چاویکی چەتە و ری گر لە ئەوساتی بیگانە و

بەرامبەر بە پاشە ڕوژێکی تاریک و لیل نەبی ئەو ئیتیفاق و پەیمانە
ئازربایجان و مهابادە چە سودێکی هەبوبی. کە ڕوسەکان لە زور مناسە
باسی ئەو ڕیکەوتو پەیمانەیان ئەکرد. ئەو ئیتفاقە عینا لە پەیمان و ڕیکەوتن
دو عشیرەتی ئەکرد لە میدانی قانون و ئیعترافاتی دوەلیدا.

مادام ئەو دو هوزە تامینی رەصیدی وەلاتان و مجلسی شورای ئەمنیەت
ئیعترافاتی حکومەتی مەرکزی ئیران یان نەکردبو. ئەو ئیتفاق و ڕێ
کەوتنەیان جیگای هیوا و ترخیک نەبو لە پاشە ڕوژی هەر دو لایاندا.

بەلام روسەکان ئەیان زانی کە کورد و تورکی قزلباشی ئازربایجان
کونەوە چنگ یان لە خوینی یەکتردا بوە. بە ئیتلیکی ئاوا ئەبوایە ئە
ئەتوانی یارمەتی بیر و باوەری یەکتریاندەن و تولەی خوین ئەستینی کونە
لەبیر بەرنەوە. وە لەوەش ئەترسان کە یەکیک لەو دو هوزە صلحی تەنیا
منفرد لەگەل ئیرانا بکەنەوە.

بەلام ئەو هەمو ڕیسو کوریس و هاتو چویە شتیک بو بو ئیحضاراتی ئەو
ـ پێیک هینرا. تەنها لە چنگ کەوتنی پەلینی ئەوت ڕوسەکان خودمختار
کوردستانیان هینایە سەر چول کردنی ـ شاری سقز و بانە و سەردەشت.
مربوتی ئاستانی رضائیە بن وە لە ژیر ئیدارەی خودمختاری ئازربایجان
کوردستان بە لقیکی مربوتی ئازربایجان تەماشا و ئیدارە بکرین.

لە روژی ١٦/٤/١٩٤٦دا پینج ضابطی ڕوس بە دەرجەی زعیم و عقید
رئیس اول وە ملازم ثانی هاتنە دی [ سەرا ]ی ناوچەی بوکان ـ بە سوار
ماشینی جیبی ژمارە ٤٠٧ ـ بە حمە رشید خان ـ فەرماندەی هیزی سقز
بانەیان ووت ئیمە ئیران بەجی ئەهیلین، ئیوە ئەلین شی.

حمە رشید خان ـ لە وەلاما ووتی. ئیمە و ئیران لە مەودایکی زور کونەوە
دوژمنی خوین ڕیژی یەکتر بووین. بەلام لەو دوایەدا تا ئەندازەیک ئەو خو
ڕێژیەمان لە بیر چوبووە.

ئیوە هاتن بو ئیران ئەو دوژمنایەتی یەتان تازە کردەوە. وە ئیستاش بە

مان نەهیلن بە بی چک وە هیچ وینە یارمەتیک. کە هیچ نەبوایە چەک تان
دابنی ئیمە نەمان توانی پاریزگاری خومانی پی بکەین. بەلام ناوبانگی
دەولەتی شورەوی بە پی چەوانەی ئەوەیە کە ئیمە بیستبومان.
پاریزگاری مللەتانی هەژار و بی دەست هەر بەم پی یە نەکەن وەکو لەگەل
ئیمە دا کردوتانە.
رەئیسەکە لە وەلاما ورتی . دەولەتی شورەوی چەکیکی زوری بە ئیوە
بەخشیوە. (۹۰) تانکی دوقات لەگەل ۸۰ فروکەمان داونەتی. ئەگەر ئەم
چەکانە کافی نەبون بو بەربەرەکانی ئیران. ئیمە ئامادەین کە یارمەتی تریشتان
بدەین. و شتی لە خو زیادمان چی بی بوتان بە جی دیلین لە تەوریزا.
هەرگاە کە لەگەل ئازربایجانا نەتان توانی بەرگری لە خوتان بکەن ئیمە بە
گەرمەگی تانەوە دی ین.
من خوم یەکیک بوم لەو کەسانەی کە لەو کوبونەوەیەدا حاضر بوم وە
پرسیارم لە روسەکان نەکرد بو پاشەروژی کارمان.
روسەکان لە پاش بلاو کردنەوەی ئەو قسانە سواری ماشینەکەیان بون و
بوی دەرچون وە جاریکی تر چاومان بە روسەکان نەکەوتەوە بو هیچ وینە دل
دانەوە و نارایشتیکی سیاسیانە.

بو چی ئیعتراف بە خودمختاری ئازربایجان و کوردستان نەکرا
روسەکان نەیانەویست کە ئیرانیەکان تا ئەندازەیەک لەگەل ئازربایجانو
کوردەکان ریک بکەون. بو ئەم بارە دەرگای مذاکرات یان لە نیوانی هەر ۳ قولا
هەسە سەربەشت.
داوای چول کردنی شارانی سقز و بانە و سەردشت ـ یان نەکرد بو
کوردەکان لەسەر بەرەیکی ئاشتی و خیرخوایانە. بەلام لەبەر ئەوەی کە
ایرانیەکان لە [فیتی] خویان گەیشتون وە ئەیان زانی کە بو تصدیقی لایحەی
نەوت روس و ئیران پی ویستی یان بە ئینتخابات هەلبژارتنیکی گشتی هەیە
لە دەورەی ۱۵هەم. وە ئەم ئینتخاباتەش پیک ناهی هەتا هەمو ناوچەی ئیران

تشکیلاتی حکومەتی بە تەواوی تیا نەکریتەوە. وە تیرانیەکان نەیان زا
روسەکان ناچاری ئەوە ئەبن کە ئەو ئاژاوەیە لە تیران بی دەنگ و بکوژینەوە
ئەوەی هیزی دەولەتی بە ئازادانە تشکیلاتی ئیداری ئازربایجان و کوردست
بکاتەوە. بو ئەوەی مجلسی ئازادانە پیک بی نن. لایحەی نەوت بو رو
تصدیق بکەن.

شەردا بو داپیردا. دایە پیر کلکە لولی وە مام ریوی دا.

جا تیرانیەکان. بەم هیوایە دریژەیان بە ئیعتراضی خودمختاری ئازربایجا
و هەر روژە بی نویک یان بە لیژنەی ریک کەوتن ئەگرت. بو ئەوەی کە لە
دادەکەی ٧ـ مانگانەی روس تی پەر بکات کە بریار درابو لە دوای ٧ مان
تیران ئینتخاباتیکی ئازادانە لە هەمو ناوچەی تیران بکاتەوە. و مجلسی
پەرلەمانی ئازاد پیک بی نی. لە ویدا لایحەی نەوت بو روس تصدیق بکر

چونکە تیرانیەکان ئەگەر لە پیش تشکیلات و ئینتخاباتی دەورەی
هەمان ئیعتراضیان بە خودمختاری ئازربایجان بکردایە جاریکی تر نەیان ئەتوا
داوای ئیعادەی تشکیلات ئازربایجان لە روسەکان بکەنەوە. بەلام پیشەوەی
قازی محمد ـ بە لای ئەو فیلەدا تەنەچون وە روسەکانیش باوەریان وا نەبو
تیران بتوانی لایحەی نەوتی روس رەت بکاتەوە.

لە ئاکاما تیرانیەکان بەسەر ئامانجی فیلاوی خویانا سەرکەو
خودمختاری ئازربایجان و کوردستان وە شەریکەی نەوتی روسیش یان خـ
ژیری. خیالاتی سەرکیشانەی روس یان بە هەندی تماعی نەوتی تیران تا
مار کرد.

صورەتی مذاکراتی نیوانی تیران و خودمختاری ئازربایجان و کوردستان

بە هوی ئەوەی کە تیرانیەکان لە مادە ٣ ئیتفاق نامەی ٤ ئاوریل ٤٦
شرکەتی نەوت و چوار کردنی تیران. بە گویرەی دەسەلاتی قانونی تیران لشا
یان بە ریک کەوتن و ئاشتی لە نیوان ئازربایجان و حکومەتی مرکزی ت
کردبو. بو ئیحترامی ئەو پەیمانە. تیرانیەکان لەگەل ئازربایجانیەکان کە

گفتوگو.

روژی یەک شەمە ئەوەڵی مانگی اردی بهشت ۹٤٦/٤/۲۱ بەیان نامەیەک لە لاین دەولەتی تیرانەوە بڵاو کرایەوە

ئیختیاراتیکی کە لە مانگی ربیع الثانی ۳۲۵دا بە پی بەندی ۲۹ و ۹۰ و ۹۱ و ۹۳ قانونی ئەساسی تیهران. بو ئەنجومەنەکانی ئەیالەتی وە ولایەتی ئازربایجان بە تەرتیبی خوارەوە پیک ئەهێنری.

۱- سەروکەکانی دایرەی کشتوکال. بازرگانی. پیشەسازی. بار گوازتنەوە. فرهەنگ بهداری. پولیس دادگوستەری مالیە. بە هوی ئەنجومەنەکانی ئەیالەتی و ولایەتی هەل ئەبژیردرین وە لە لاین ئەحکامی رەسمی دەولەتیەوە لە تاران وەر ئەگیرین.

۲- دامەزراندنی ـ ئاستاندار ـ متصرف. بە رەزامەندی ـ ئەنجومەنی ئەیالەتی لە ژیر پەسند کردنی حکومەتی قبول ئەکرین. بەڵام دامەزراندنی فەرماندانی نظامی و مدیرانی پولیس لە لاین دەولەتەوە پیک دی.

زمانی رەسمی ئازربایجان سائری ناوچەکانی تیهران فارسی ئەبی. و فەرمانی نوسین و اداره لە ناوچەکانی محلیدا بە زمانی محلی ناوخوئی ئەبی.

ئیش و کاری دادگوستەری محکمە بە زمانی تورکی و کوردی ئەبی بەڵام وەر ئەگیردرینە سەر فارسی

خویندن هەتا گەلاسی (٥) سەرەتایی بە زمانی ئازربایجانی ئەبی وە لەمەولا بە فارسی ئەخویندری چ لە دەرەوە وە چ لە ناوچەی محلیدا.

٤- لە کاتی پر کردنەوەی میزانیە گشتی بو ئاوەدانی ریگا و بان ئاوشار پیک خستن. و دانشگە و بهداری. بە جیاوازی وەتای بەتی (بودجەی) بو درو ست ئەکری.

٥- تی کوشانی سازمانی دیمکراتی لە هەمو ناوچەی ئازربایجان وە هاوری یەکانی ئازادە

٦- نسبەت بە دانیشتوان و کاسب کاران و ئیش کەرانی حزبی دیمکرات

ئازربایجان هیچ وینه تذبقاتیک پیک ناهینری.

٧- به پی نفوس هەڵبژارتەی ئەندامی ئازربایجان ئەچیتە ناو دەورەی ١٥ هەمی پەرلەمانی ئیرانەوە

هیئەتی نومایندەی کورد و ئازربایجان لە تارانا

بە تاریخ ٨ مانگی نوردی بەهەشت ١٣٢٥ کە ڕیکەوتی ١٩٤٦/٤/٢٨ ئەکا ئەوانەی کە چوبون بو تاران و ئیشتراکی مذاکراتی نیوانی دەوڵەتی ئیران یان کردبو بو خودمختاری ئازربایجان و کوردستان بریەتی بون لەو ئاغایانەی خوارەوە.

١- صادقی پادەگان ٢- دوکتور جیهان شاهلو ٣- آغای ابراهیمی ٤- ئاغای دیلمقانی ٥- حمە حسین خانی سیف - وەزیری جەنگی کوردستان وە نائب پیشەوای کوردستان لە ژیر سەروکایەتی پیشەوەری پیشەوای ئازربایجان لە سەعات ١١ و ٢٠ دقیقە گەیشتنە فروکەخانەی [مهراباد - لە تارانا آغای مظفر فیروزی - معاونی سیاسی سەرەک وەزیری ئیران وە سەرتیپ - حفاری سەروکی سازمانی شارەبانی بە پیل - بە پیر - ئەو هینتەوە هاتنە فروکەخانەی مهراباد وە بە ڕیزیکی زور شایستە بردیان ئە ناو کوشکی [جوادیە] کە ١٢ کیلومتر لە تارانەوە دورە.

ڕوژی ٩ مانگی ناوبراو لە حضوری نومایندەکانی ئیران کە بریەتی بون لە - آغا مستشارالدولە محمد ولی میرزا فرمان فرمائیان - لنکرانی - ایچکچیان - مورخ الدولە سپهر وزیری پیشەسازی - مظفر فیروزی معاونی سیاسی رئیس الوزرا - دەست بە مذاکرەی تاران و ئازربایجانو کورد کرا.

هەتا ڕوژی ٢٣ مانگی نوردی بەهەشت ١٣/ ٥ / ٩٤٦ ئەو مناقەشە و مشتومڕیە لیک کیشرایەوە.

بو ئەوەی کە بهانەیک بو ئیرانیەکان هەڵ بکەوی وە ببیتە هوی ئەوەی کە ئەو مذاکرەیە بو کاتیکی تر هەڵ بگرن.

لە ٢٩ نیسانی ٩٤٦ کە ڕیکەوتی ئەوەڵ ڕوژی مذاکرەکە ئەکات لە ژیر

دەستوراتی نهینی ـ فەرمان درا بە فەرماندەی هیزی سقز ـ کە پەلاماری هیزی قازی محمد بدا لە ناوچەکانی سەرا و سەرچاوەی ـ ناوچەی بوکان ـ لەسەر هەمان دەستوراتی نهینی سەربازی. لە سعات ١١ و ١٥ دقیقەی پیش نیوەرو هیزی ئیرانیەکان سەرا و سەرچاوەیان دایە بەر توپ بەلام ئەو لشکرە بە شکانیکی زور شەپرزەی گەرانەوە بو سقز کە لە کاتی خویا لە دریژی باسی ئەم پەلاماردانە ئەکەین.

ئەمجا ئیرانیەکان ئەو رووداوەیان کرد بە هوی ئەوەی کە ئەو وتو ویژە راگیری. لی کولینەوەیەکی تەواو ئەکەن بو دوزینەوەی پیاو خەراپی ئەم پەلاماردانە. و تاران باری ئەم فەرمانە روئەکاتە کام لا. چونکە ئەم رووداوە بە بی چەوانەی مەبەستی هەر دو لا بووە.

حا لە روی ئەم پەلاماردانە هینتی ناوبراو لە روژی ٢٤ نوردی بەهشت بە بی هیچ وینە سەرکەوتنیک گەرانەوە بو ئازربایجان

**بەیان نامەی قوام السلطنه**

لەم کاتەدا کە هەمو بیروباوەریکی گەلی تهران روی کردوتە من وە ناوم بە تاوان بار ئەهینن. لە سەر ئەوەی کە من ئەمەوی بەسەرهاتی آزربایجان بگەینمە ناقاریک کە قانونی ئیران بەم ریکەوتنە زەرەرمەند نەبی.

لەو ری یەوە بە زور بەلگەی گەورە بەد ناو کراوم کە گویا ئەمەوی قانونی ئیران لە [ ریسمە ـ بەرم و تجاوەزاتی سنوری قانونم کردبی. بەلام لەبەر ئەوەی کە من ئاشتی خوازم هیچ باکم لەو تهمەتانە نیە. لەسەر بیان نامەی روژی ١/ ٢/ ٣٢٥ ـ ٢١/ ٤/ ٩٤٦ کە بریەتی بووە لە ٧ مادە بو ئیدارەی ئەنجومەنی ئەیالەتی ئازربایجان کراوم بە پەندی تانەو پل.

زور بە پەروشم کە ئەم توانی داخوازی نوماینەدەکانی ئازربایجان پیک بینم. چونکە داواکانیان لە صلاحیتی قانونی ئیران بە دەرە. جا بو ئەوەی کە میوانی ریکایکی ناونجی و باش بدوزینەوە بو حل کردنی قضیەی ئازربایجان و دەولەتی. وتوویژەکانیانم هەل گرتوە بو کاتیکی لەبارتر.

داخوازی ئەو هێنتە ئەو چەند مادانەی خوارەوە بون

١- بە پێی مادە ٢- بیان نامەی روژی ١٣٢٥/٢/١. وابریار درا بوکە تعینی ئاستانداری ئازربایجان لە ژێر چاوەدێری ئەنجومەنی ئەیالەتی لە لاین دەولەتەوە پێک دی.

بەلام هێنتی ئازربایجان داوای ئەوەیان نەکرد. کە تعینی ئاستاندار لە سەر ئامیناتی ئەیالەتی بێ وە دەولەت بە بێ ئیعتراض ئەو هەلبژارتەیەی ئازربایجان پەسند بکات.

٢- لە مادە ٢ـ بیان نامەکەمانا ئیمە وتبومان کە دامەزرانی فەرماندەکانی هێزی نظامی وە ژاندارمەری لە لاین دەولەتەوە بێ.

کە چی نومایندەی ئازربایجان ئەلێن ئەبێ ئەو فەرماندانە لە لاین ئیمەوە ترشیح بکرین و حکومەت بە بێ ئیعتراضی قبولیان بکات

٣- دابەش کردنی ئەراضی دەولەتی بەسەر فلاحا. ئیمە ئەلێن هەر ئەو ئەرازیەیە کە لەو شورشەدا بەرچاو کەوتوە. بلام ئەو هێنتە ئەلێن ئەبێ هەمو ملکێک ئەبێ هی فلاح بێ. ئەوکو ملکی مالک و خاوەنی پێشوی وەیا حکومەتی.

جا ئەو شتانە لە صلاحیەتی قانونی ئیستای ئیران بە دەرە ئەبێ لە لاین مجلسی شورای ملیەوە بو ئەو بارە موافقەت وەر بگیری. جا لەبەر ئەبونی مجلسی پەرلەمان چە بو ئەو باسە وە چە بو باسەکانی تر ئەمان توانی هیچ وینە بریارێک بدەین.

بەلام لەبەر ئەوەی کە من دوستایەتی دەولەتی شورەویم زور مەبەستە. چ بو تصدیقی لایحەی ئەوت. وە چ بو سەرپێ گرتنی داواکانی خودمختاری ئازربایجان. کو کردنەوەی دەورەی ١٥هەم مان زور پێ ویستە.

وە لە کوبونەوەی مجلس حەل کردنی ئەو مشکلاتە زور بە ئاسانی پێک دی.

تقریری ـ نوماینده حمه حسین خانی سیف

حمه حسین خانی نوماینده‌ی کورد که له تاران گه‌رایه‌وه به دور و دریژی راپوریکی له به‌سه‌رهاتی سه‌فه‌ره‌که‌ی دا به لیژنه دیکراتی مه‌رکزی وه مقامی پیشه‌وایه‌تی. که تیران یه‌کان له هه‌مو باوریکیانا نه‌یانه‌وی دریژه به لیشوکاری خودمختاری کورد بده‌ن. هه‌ر چی که ئه‌ی لین وه نه‌یکه‌ن درویه. و ئه‌وس راپور و یادداشته‌که‌ی له روژنامه‌ی کوردستان ژماره ( ٥٠ ) دا چاپ کرا بو.

وه قازی محمدیش ـ له زدی ئیرانیه‌کان خطبه‌یکی دور و دریژی خوینده‌وه. وه له زور بابه‌ته‌وه له‌گه‌ل بیر و باوه‌ری حمه حسین خان سیف ـ یه‌ک بو. وه خطبه‌که‌ی قازی محمدیش ـ هه‌ر به چاپ گه‌یاندرا. کورده‌کان ووریا بونه‌وه که هافلاندن و خاوه‌خاوه پی کردنی ده‌وله‌تی ئیران فیتله و بو فیتل وا ئه‌که‌ن.

نامالجی قازی محمد ـ له فشاری ده‌وله‌تی ئیرانا

ئه‌مجا بو ئه‌وه‌ی که ئیرانیه‌کان بو ریک که‌وتن ناچار بین قازی محمد فشاریکی زوری بو هیزی ده‌وله‌تی هینا له شاراتی سقز و بانه و سه‌رده‌شتا. ئاپلوله‌ی ئه‌و ٣سه شاره‌ی دا. له هه‌مو لایکه‌وه ریگای هاتو چوو تامین هواره‌مه‌نی له قه‌ده‌غه کردن.

ئه‌مجا ئیرانیه‌کان به هوی ئه‌و فشاره روژی ٢١ خرداد ٣٢٥ که ریکه‌وتی ١٩٤٦/٦/١١ ئه‌کات

هینیکی سیاسی و نظامی ده‌وله‌تی ئیران گه‌یشتنه ته‌وریز بو مور کردنی ئیمان نامه‌ی باسکراو.

وه ئه‌و هینته‌ش بریه‌تی بون له آغای مظفر فیروزی ـ ابولحسن صادقی ـ مهموی زاده ـ سه‌رتیپ هدایه‌ت معاونی وزاره‌تی جه‌نگ ـ سه‌رهه‌نگ علوی ئاهودار ـ له وه‌زاره‌تی جه‌نگا. له سعات ٢٣ واردی ته‌وریز بون وه به شه‌رحی هواره‌وه ریک که‌وتن پیک هات وه ئیتفاق نامه‌که‌یان به ئیمضای هه‌ر دو لا گه‌یاند

۱- حکومەت موافقەت ئەکات رئیس مالیە بە دیاری کراوی ئەنجومەنی ئەیالەتی بی. وە بە بریاری دەوڵەتی تعین بکری. وە ئەم دیرە بخریتە سەر مادەی ۲ ئیبلاغیەی ۲۵ مانگی نوردی بهشت.

۲- لە مادەی ۲ بیان نامەدا وا بریار دراوە کە تعین ئاستاندار لە لاین ئەنجومەنی ئەیالتیەوە هەل ئەبژیرری وە بە پی مصلحەت وە بی ویستی حکومەتی تعین بکری.

بەڵام ئیستا وزارەتی داخلیە بریاری لەسەر ئەوە داوە کە تعین ئاستاندار لە نێو چەند کەسێک هەڵ ئەبژیررێت کە ئەنجومەنی ئەیالەتی پەسندیان ئەکات.

۳- لەسەر ئەو گۆران وە رودلوەی ئازربایجان دەوڵەت ئیعتراف بەو سازمانە ئەکات کە پی ئەڵین مجلسی ملی ئازربایجان ئەو مجلسە بە لیژنەی ئەیالەتی ئەناسری.

لە پاش پیک هینانی دەورەی ۱۵ هەمی مجلسی شورای مللی و دانانی قانونی تازەی ئەنجومەنی ئەیالەتی وە ولایەتی. بە گورجی ئەو قانونە تصدیق و ئیشی پی ئەکری.

٤- بو تعینی هیزەکانی محلی. زابطەکانی هیزی ئازربایجان کەلە ئاکامی تی کوشانو ئیشتمان پەرستیەوە. چە بە شیوەیکی زورداری وە چە ئیختیاری کۆ کراونەتەوە. بە پی ئەو بریارنامەیە بە هیزی لشکری ئیران محسوب ئەکرین.

موافقەت پێک هات کە کمیسۆنیک لە نوماینەدەی ئاغای قوام السلطنە وە ئەنجومەنی ئەیالەتی ئازربایجان کو بکریتەوە. کە تقدیری چەندیەتی وە چونیەتی دەرەجە و موجودی ئەفسەرەکان بکات. وە بو تصویب بدری بە مجلسی پرلەمان لە داهاتودا.

۵- نسبەت بە خزینەی ئازربایجان موافقەت مان کرد کە ۷۵ لە سەتا واداتی ئازربایجان لە لاین ئەنجومەنی ئەیالەتی ئازربایجانەوە پەخش بکری. وە لە سەتا ۲۵ واریدات بدری بە تاران

| تی بی تی     ملحوظات

١ - مصرف و واریداتی تلگراف گمرک شمندوفەر ـ پاپوری دەریاچەی ورمە لە مادە ـ ٥ ـ بریارنامەی باسکراو مستثنایە واریدات و مصرفی ئەو شانە پی وەندی لەگەل حکومەتا هەیە. تەنیا پوستە و تلگرافی ئەنجومەنی ئەیالەتی بە بی [ پول ] وەر ئەگیری.

٢ - تعمیراتی ریگا و بانەکانی رەئیسی لە ئەستوی دەولەتدایە بەلام گوپە و گوزەر و ریگا و بانی تازەی لکەکان لە عودەی ئەنجومەنی ئەیالەتی ئازربایجانە.

٣ - دەولەتی تیران لە بەرام بەر ئەو خزمەتو فداکاریەی کە لەبارەی پیکرانەتی تیرانی پەرستی بەکار هاتوە. لە بەرامبەری ئەم دلسوزی یەیان حکومەتی تیران لە سەتا [ ٢٥ ] وارداتی گمرک ئەداتە مکتبەکانی ئازربایجان.

٦ - دەولەتی تیران رازیە کە هیلی ئاسن بریتە [ تەوریز ] بەهەر وینە پەلە و کورجیک کە پیک بیت. وە بو راگیر وە سەرپەرشتی کردنی فەرمانی ئەو هیلی ئاسنە دانیشتوانی ناوچەی تەوریز پیش خەلکی جیگاکانی تری تیران بەهرەن.

٧ - هیزی فیدایی ئازربایجان بە ـ ژاندارم ـ پولیس ناو ئەبری. وە بو دیاری کردنی دەرجەیان کمیسونیک لەلاین هەر دو لاوە پیک دی.

ئاگاداری

لەبەر ئەوەی کە لە سالانی رابوردودا لەبەر کردەوە ناشیرینەکانی هیزی ئەمنیە ـ شیوە و ناو و دروشمی [ ئەمنیە ] زور بە ناشیرینی و بی ریزی دیتە بەرچاوی خەلک. وە خەلک بەم ناوە زور دل گیر و گلەمەندن. وامان بریاردا کە بو پلە ئەو ناوە سرکە بگوری بە ناویکی خوشەویست.

٨ - ئەو زەوی و زارانەی کە لە ئاکامی شورشی ئازربایجانا بەسەر جوتیاران وە وەرزیرەکان دابەش کراوە.

دەوڵەت رەزامەندی خۆی بۆ ئەو دابەش کردنە دەر ئەبڕی.

بەڵام ئەو ملک و ئەرزانەی کە هی مللەت بووە و لە لایەن هێزی دیکرا... بەسەر خەلکا دابەش کراوە. دەوڵەت ئامادەیە کە هێنتیک پێک بی نی ت... خساراتیان بکات. وە حەلیک بۆ حقوقی مالکەکان بدۆزێتەوە.

٩- دەوڵەت پێ خۆشە کە لە ئەوەلی کردنەوەی دەورەی مجلسی ١٥... لایحەی هەڵ بژاردن لەروی ئەصلی دیکراتی و ئازادخوازیەوە پیک بی.

١٠- ئەیالەتی ئازربایجان بریەتیە لە ئاستانی ٣ ـ ٤ ئەوریز و رەزائیە...

١١- دەوڵەت موافقەت ئەکات بۆ ئامینی راپەڕینی نیشی ئیدار... لیژنەی ئیدارەی لرا ـ پێک بی نی. وە لە ژێر چاودێری ئەنجومەنی ئەیالە... دا دەست بە فەرمانی بی وێستی خۆی بکات.

و ئەندامی لیژنەی ئیدارەش بریەتی ئەبن لە ـ ئستاندار ـ و سەرەکە... ئیدارەجات. و هێنتی ئەنجومەنی ئەیالەتی.

١٢- لە بیان نامەی رۆژی ٢ ئوردی بهشت ٣٢٥ مادە ٣ دا ووترلاوە... مکتبەکانی ناوەندی و دانیشگەکان. بە فارسی بخوێنن. وە لەسەر ئەمە ر... کەوتن پیک ئەهات. بەڵام ئێستا بڕیارماندا کە ئەو چەند ووشەیە بخرێتە س... ئەو مادەیە کە لە مدرسەکان متوسطە و ئانەویدا دەرس خوندن بە زما... فارسی و ئازربایجانی ئەبی مطابق بە برنامەی وزاری.

١٣ دەوڵەت موافقەت ئەکات کە کوردەکانیش مشمولی ئەو ئیتفاق نامەیە ب... وە سود لە چاکەی ئەو ریک کەوتنە وەر بگرن بە پی بیان نامەی مادە ٣... دەوڵەت تا پولی ٥ ـ سەرەتایی کوردەکان مەودایان هەیە کە بە زمانی خ... بخوێنن.

١٤- لەبەر ئەوەی کە دەوڵەت لە بیریا هەیە کە قانونی هەڵ بژار... سەروکەکانی شارەوانی لە ئەواوی ئێرانا دروست بکات لەسەر ئەرزی... دیکراتی راستەقینە. جا هەتا ئەو ساتە ئەنجومەنەکانی ئێستای ئازربایج... لەسەر وظیفەکانیان دەوام ئەکەن هەتا ئەو کاتە پیک دی.

١٥- ئەو موافقەت نامەیە لەسەر دو نوسخە ئەبی و ئاڵوگوڕی پی ئەک...

له نیوان هەر دو لادا.

مظفر فیروزی　　　　　　جعفر پیشەوەری

رئیس هیئتی نوماینده‌ی دوله‌تی ایران　　رئیس ئه‌نجومه‌نی ئه‌یاله‌تی ئازربایجان

لەسەر داوای ئه‌نجومه‌نی ئه‌یاله‌تی ئازربایجان وەزیری کشوەری تیران به بریاری وەزیری مالیه ۸ ملیون ریال یان بو چاک و ریک خستنی شارانی ۳ و ٤ به هوی بانکی مللی وه خسته ژیر چاودیری ئه‌نجومه‌نی ئه‌یاله‌تی ئازربایجان. ئاغای دوکتور سلام جاوید ـ لەسەر ترشیح ئه‌نجومه‌نی ئه‌یاله‌تی به ئاستانداری تەوریز دامەزرا.

هیئتی وەزیران له ۲۷ خرداد ۳۲۵ بریاندا که ئاستانی ۳ و ٤ بکەن به یک ئاستان. وه ناوی ژاندارمەریش ـ بکری به ناوی نگهبان کشوەر.

شای تیرانیش به ناوی جواتی ریک کەوتنی ئازربایجان وه دلسوزی پیشنمان پەرستی تیران پەتیەوه. له گەنجینه‌ی تای بەتی شاهنشاهی. یەک ملیون تومانی به گەنجینه‌ی شاروانی تەوریز بەخشی بو چاک کردنی ئاوی هواردنەوه

تفتنی تیران لەگەل دوله‌تی قازی محمدا

دوله‌تی تیران له غائله‌ی ئازربایجان تا ئەندازەیک ئارام بو، ئەمجا پەیسی باداتەوه سەر ئاوچه‌ی کوردنشینه‌کان وه به فیل و تەلەکه بازی ئەوانیش بخافلینی.

جا بو هلگرتنی ئەو فشاره‌ی کەبەسەر سقز و بانه و سەردەشتەوه هەبو به نای بەتی پاسگای [ربط و بریسوز] لەناوچه‌ی سەردەشت و پایگای مرەدی ا له ئاوچه‌ی سەقز که زور دەمیک بو لەلاین هیزەکانی کوردستانەوه گەمارو درابون.

بو رزگار کردنی ئەو هیزه فشار دراوانه قازی محمدیان ـ برد بو تاران ـ له روژی ۳۲٥/٤/٥دا که ریکەوتی ۲۹ حزیرانی ۹٤۹ ئەگا قازی محمد لگل ئاستانداری تەوریز دکتور جاوید ـ به سواری فروکه چون بو تاران. روژی ۷

مانگی ناوبراو ۱۹٤٦/٦/۲۸ چاویان به قوام السلطنه کەوت. وە بە حضوری [ رەزم ئارا بازرەسی ناوچەی ۲ـ نظامی و مظفر فیروز معاونی سیاسی رئیس الوزرا و دکتور جاوید ئاستانداری تەوریز ـ دەست کرا بە ووتوویژ لە بارەی چۆڵ کردنی شارانی سقز و بانە و سەردەشت لە هیزی دەوڵەتی.

قازی محمد ـ داوای کرد کە بیان نامەی ۲۱ خرداد ۳۲۵ (۱۹٤٦/٦/۱۲) ئەبی لە هەمو باریکەوە کورد بگریتەوە. ئەبی آستانی رەزائیە بە ئەیالەتی ئەنجومەنی مللی کوردستان بناسری. نابی بخریتە سەر ئاستانی ۳ ـ تەوریز.

ئیرانیەکان ئەو شروتو بەندانەی خوارەوەیان بو قازی محمد وە دکتور جاوید ـ خستە ناو ووتو ویژەوە.

۱ - ئیمە بە مەرجی دەستەبەری بریارنامەی ۲۱ خردادی ۳۲۵ ئەبین. کە ئەو هیزانەی گەماروی سقز و بانە و سەردەشت یانداوە بلاوەیان پی بکری.

تەنیا بەناوی ـ نگهبانی ـ وە دەستەیکی کەم بو پاریزگاری ئاسایش ریگا و بانەکان بمی نی تەوە.

هەر کاتیک کە ئەو هیزانە بلاوەیان پی کرا. دەوڵەتی ئیرانیش ـ پاسگای [ رەهەت بریسو ] وە میرەدی ] هەڵ ئەگری. ئەی باتەوە ناو شارەکان.

۲ - هەرگاە کە دەوڵەتی ئەنجومەنی ئەیالەتی ئازربایجان زەنگانی ـ بو دەولەتی مرکزی ئیران رەت کردەوە حکومەتی مەرکەزیش ئامادەیە کە شارانی ـ سەقز و بانە و ـ سەردەشت ـ بە بی جەنگ چوڵ بکات چەنکە [ زەنگان ] لەسەر نەخشەی ئازربایجان نیە. مسئلەی چوڵ کردنی سقز و بانە و سەردەشت ئەخریتە پاش گوی هەتا چوڵ کردنی [ زەنگان ]

۳- دەولەتی مەرکەزی تاران هیچ کاتیک ئامادە نابی بۆ چوڵ کردنی شارانی سەقز و بانە و سەردەشت لە ژیر هەرەشەی چەکداریدا.

بەلام بە تەرزیکی بی چەکی. ئیمە دوایی بەم چوڵ کردنە ئەهێنین جا بو ئەوەی کە قازی محمد ـ فریوی ئیرانیەکان بخوات و بکەویتە ناو [ تەڵەی ] درویەکان یانەوە. ئیرانیەکان داوایان کرد کە ئیمە ئامادەین هیزەکانی خۆمان لەو ناوچانەدا بەرینەوە سەر شکلی پیش ئینقلابی شهری وەری - ۳۲۰. قازی

محمدیش ـ بە دڵیکی سادە و بی فێڵ باوەڕی بەم هەنگاوەیان کرد. ئەو بڕیارەی پەسند کرد. لای وا بو کە ئەم مادەیە پێشکەوتنیکی بە نرخە بو کوردەکان.

قازی محمد بە هەناسە برکی گەڕایەوە بو سابلاغ وە لە ڕوژی ٢٧/٤/٣٢٥ گەیشتەوە سابلاغ وە بە پەلە فەرماندەکانی لشکری کوردستاني بانگ کردن بو سابلاغ بو دەستوراتی تازەی تاران کە بە دیاری بوی هیناونەتەوە.

بلاوەی لەشکری قازی محمد

لە ڕوژی ٢٠ تموز ٩٤٦ کە ڕیکەوتی ١٣٢٥/٤/٢٩ ئازەری ئەکات فەرماندەی لشکری سقز و بانە و بوکان ئاغای جەنەرال مایور حمە رشیدخانی قادر خان زادە ـ برایە سابلاغ. لە لاین قازی محمدەوە پی ڕاگەیاندرا لە کە لشکرەکەی اذن بداتەوە وە جبهە چوڵ بکات.

حمە رشید خان بو بە ئەنجام گەیاندنی فەرمان گەڕایەوە بۆ جەبهە. لشکری عشیرەتی منگور، مامەش، پیران، شکاک. بانە. زەرزە، گەورک، فیض الله بگی. دیکری ـ کە لە جەبهەی سەقز و بانەدا بون هەمویان اذن درانەوە.

تەنها ١٢٠٠ نەفەری بارزانی نەبی. بەسەر جیگای چوڵ کراوی لشکرەکانا دابەش کران. وە لە بارزانی زیاتر هیچ هیزیکی عشایری لە هیڵی شڕا نەمایەوە.

وە لەسەر بڕیاری ٢١ خرداد ٣٢٥ ـ ١١ /٩٤٦/٦ قازی محمد لەسەر ناوی پیشەوایی وە ڕهبەری کوردستانەوە ناوی لە خۆی نا ـ [ رئیس ئەنجومەنی ئەیالەتی] وە ناوی حمە حسین خانی سەیف ـ وەزیری جەنگیش گورا بە سەرپەرستی نگهبانی ـ مجلسی وەزیرانیش گوڕا بە ئەنجومەنی ئەیالەتی وە ڕیگا بەستراوەکانیش بۆ هیزی دەوڵەتی کرانەوە.

ئەنجا لە هەمو لایکەوە ئیرانیەکان زەخیرە و خواردن وەکو پەلی پی ویستیان بە هیزە گەمار دراوە برسیەکانیان ڕاگەیاند سەربازە برسی و مردەلوخە

معنویات شکاوەکانی ئیرانی زندو بونەوە.

دەولەتی ئیرانیش لەسەر ئەو دلسوزیو یەی مان پەرەستیە پاسگای [رەبەت ] و بریسوی ] ناوچەی سەردەشت کە چەند مانگ بو لە ژیر فشار و گەماروداا بون. بو کوردەکانی چول کرد و هیزی ئەو پاسگایانەیان بردەوە شارەکان بو ئیستحکامات

هەلەی قازی محمد ـ لە لشکر چول کردنەکەیا

بەراستی قازی محمد غلط هەلەیکی گەورەی بەسەر خوی هینا لەم باوەرەدام کە هەر ئەو هەلەیە ـ بو بو بە هوی لەناو چونی تەخت و بەختەکەی.

بەلام بەرامبەر بە هەندی روداوی ناهەموار و ظروفی تایبەتی بی دەسەلاتی دا چی نەکری.

کە زەرورەت وە باری ناچاری لە هەندی کاتا مروڤ ناچار ئەکات بو غەلطیکی فەردی وەیا گشتی.

هیچ گومان نیە کە قازی محمد لە کاتی خزیا هەستی بەو غلطە کردوە کە ئەو بریارەیان شتیکی خەراپە.

بەلام نائومیدی پشتیوانی روس و هندی پیش هاتی ناهەموار ناچاری کردبی. بەسەردانەواندن بو رەزامەندی ئیرانیەکان. جا ئەو چەند پیش هاتەی خوارەوە لە هەلەی ئەو قرادادەیە وە هاتوتە رو

۱ - لە پیش چول کردنی جبهە. دەورەی پاسگای صاحب، سنتە ـ میرزا میرناشە ـ ریگای روژهەلاتی سقز و هیلی سنە ـ بە لشکری طاهرخانی کوری اسمعیل خانی شکاک ـ وە سەرهەنگ نوری بەگ رئیس عشیرەتی بگزادەی هەرکی وە لشکری حمە امین آغای پیران و عباس آغای مامەش و قریکاس خان ـ و قیطول خانی شکاک ری بەندان وە گەمارو درابو.

۲ - ناوچەی [ خورخورە و سەرشیو ـ هەتا ئەگاتە [ ملە و روستەمان ـ و جنوبی شەرقی سقز ـ بە هیزی عمرخانی شکاک و سید فهیم ـ و حمە صدیقی سلیمان خانی جاف ـ بە توندی محاصرە کرابو

٣ - وه ڕۆژئاوای سەقز - لە ناوچەی میرەدی وە - هەتا گێوی بهنام دوژ - بە هێزی بانەی و فیض الله بەگی وەگەورکی دەستەی علی جوانمردی و محمودی رسولی - سپێردرا بو.
٤ - شمالی سقز - لە کیوانی - مامەشە - صالح ئاوا - مەلقرەنی ئالتون - گەلی کەرویشکە - قارەوا - مەرخوز - گەلی سەرا - بە لشکری بارزانی توند و تەنرابو.
٥ - پاسگای میرەدی - کە ٤٠٠ نەفەری سەربازی دەوڵەتی ئیرانی تیابو ٤٠ ڕوژ بو خرابو ژێر فشار و گەمارووە. بە فروکە خواردن یان بو تامین ئەکرا. لەگەل شاری [بانە]دا.
ئەو دو جیگایە بە لشکری بانەی - دەورە درابون.
٦ - سەردەشتیش - لە لایەن لشکری زیروی هەرکی و لشکری کاک الله آغای محمد آغای - پاراستان - و بکر آغای حویزی - نەفەری فراری عراقی - وە بەشیک لە پیشمەرگەی سابلاغی - و ابراهیم آغای سویسنی - و دەستەی علی آغای زیوە - وە دەستەی ئاغولانی باپیرآغایی - و عشیرەتی دەشتە تاڵ - وە دەستەی برایم آغای بەراجی - و احمدی قاسم آغا - زور بە توندی فشار وە گەمارە درابو. تسلیم بونی هێزەکانی ئیرانی لەو ناوچەیەدا کەوتبو ئیوانی لیسا و ساتیکی تر.
نزیکەی دو مانگ بو ئەو هێز وشارانە - کەوتبونە ژێر فشار و دەورە دان. بە طیارە نەبوایە خواردنو فیشک یان پی ڕانەنەگەیشت ئەگەر تا چەند ڕوژیکی تر ئەو محاصرەیە هەڵ نەگیرابا. هەمو لایک یان ناچاری خو بەدەستەوەدان ئەبون.
بەلام بە ئازاد کرانی ڕیگاکان گیانی سەربازەکان بوژایەوە وە هیوای دوراویان هاتەوە بەر ئەندام.
٧ - ملاو کردنەوە لشکرەکان بو بە هوی ئەوەی کە ئیرانیەکان [ بی نیان لە بوپاڵندە خوشی بکەن. و ئازادی خواهەکان بە پاشەڕوژیکی ڕەش بترسینن. وە

زور کەس مەعنەویاتی بێ هێز ببێ وە لەژێرەوە پەی وەندی لەگەڵ هێزی دەوڵەتیدا پەیدا بکاتەوە.

٣- ئەو لەشکر بەتاڵ کردنەوەیە بو بە هوی تورانی حەمە رشید خان و عمرخانی شکاک و هندی عشیرەتەکانی ئێرانی

ایران چە سودیکی لە پاسگا گەمارو دراوەکانی کرد.

١- چوڵ کردنی پاسگای ـ میرەدی و رەبەت. پسوی ـ زەرەریکی زوری لە هیزی دیکراتدا.

چونکە ٥٥٠ نەفەری سەربازی ئیرانی لەو ٣ پاسگا یەدا هەبو. لەبەر گەمارودراوی هیچ سودیک یان لەو ٣ پاسگایە نەئەکرد. چونکە هیچ وێنە پەی وەندیک یان بە مرکزی رئیسیەوە نەمابو. وە لە سەروبەندی خو بە دەستەوە دانا بون. وە تسلیم بونیش یان بو روحیەی سەربازی ئەبو بەشتیکی زور نەگبەت و ریز شکانی سەربازی

بە هوی چوڵ کردنی پاسگاکان. هیزی شارەکانی تین کرد.

٢- هیزی حکومەتی ئیران لە پێش شهری وەری ٣٢٠دا لە شارانی سقز و بانە و سەردەشت بریەتی بو لە ٦٠٠٠ نەفەر.

بەڵام لە دەوری دیکراتا هیزی ئەو ٣ شارە هاتبوە سەر ٤٠٠٠ سەرباز.

بەڵام قازی محمد لە تاران وا حاڵی بوبو کە هیزی شهری وەر لە هیزی ئیستایان کەمتر بووە.

ئیرانیەکان بەو فێڵە ٢٠٠٠ سەربازیان خستە سەر هیزی شارەکان وە بەم هیزە تازەیە نەخوش و لاتو لەواریان پێ ئاڵوگور کردن.

وە هەر بەم ناوەشەوە چەکو خواردەمەنیکی زوریان بردە ناو شارە گەمارو دراوەکانەوە.

چونەوەی حوسێن خانی سەیف بو تاران

ئەمجا حمە حسێن خانی سیف ـ سەرپەرستی نگهبانی هیزی دیکراتی

کوردستان بو سەر پی گرتنی وادەکانی ناو بڕیارنامە ئمضا کراوەکەی قازی محمد ـ لەگەل هێنتێکی ئازربایجانیدا چو بۆ تاران.
بەلام لەبەر ئەوەی کە وەختی هیچ شتیک نەمابو هەمۆ ئیشو فەرمانیک قابلیەتی خۆی دوڕاندبو. ئیرانیەکان لە زور لاوە ئیش یان پیشکەوتو بو. نرخیکی عملی بۆ قازی محمد و لشکرەکەی نەمابووە.
حمە حسین خان ـ بە هیچ گۆنە سودێک گەڕایەوە بۆ سابلاغ لە روژی ٥ آزەری ٣٢٥ کە ریکەوتی ١١/٢٦/ ٩٤٦م ئەکات بە دڵیکی سارد و هەل دوڕاو.
صدری قازی ـ کە برای قازی محمد بو ـ و نائبی دەورەی ١٤ هەم بو لە تاران. لەگەل هێنتیکی ئیرانی لە تارانەوە هات بو سقز. بەناوی ووتو ویژ و باری ئاشتی لە نیوانی هەر دو لادا.
بەلام هیچ گیر نەبو هاتەوە سابلاغ وە خوی لە چنگ ئیرانیەکان ڕزگار کرد.
وە صدری قازی لە ناو کوردەکانا دەستی کرد بە پروپاغندە لە دژی ئیرانیەکان. و قازی محمدی خستە سەر بیری لشکرکەشی تازەبەتازە و پەلامار دانی شارەکان.
بەلام داخی گرانم قضیە نرخی خۆی توان بووە. ڕوداوەکانی دەرەوە و ناوەوە لە دژی ئەو لشکرەکەشی وە پەلامار دا نەبو. ئەو روژە بە ئاخر روژی پیشکەوتنی حکومەتی قازی محمد ـ ئەژمیرەرا.
چونەک بەسەرهاتی سیاسی بالی بەسەر هەمو نەخشە و پیلانیکی پیشکەوتنا کیشابو. دەوری ئینتخاباتی ١٥هەم نزیک بو بۆوە.
ڕوسەکان بۆ تصدیقی لایحەی نەوتی ئیران و کو کردنەوەی مجلسی پرلەمان و دامەزراندنەوەی دەولەتی ئیران زور بەپەلە بون.
وە لە ئەلمانیا و ئەوروپادا هەندی داخوازی ڕوسەکان پیک هاتبو ئیش یان بەم مەسرەح و فیلمی ـ قازی محمد و جعفر پیشەوریە نەمابو. جا نەیانەویست بە زوترین کات ئەو باسە لەسەر نەخشەی دروست بونا نەهێن.

ئاوەروكی ـ لەقەبی قوام السلطنه

بە بڕواری ۲ مـانگی مـرداد ۳۲۵ کە ڕیکەوتی ۹٤٦/۷/۲٤ ئەکـات فەرمانی خوارەوە لە لاین شاهنشاهی ئیرانەوە تبلیغ بە قوام السلطنە کرا.

جنابی ئاغای سەرەک وەزیرانی ئیران

بو دەربڕینی نرخی زانایت و بەرچاو کەوتنی تای بەتی لطفی شاهانە بە گوێ رەی ئەو دەست نوسینە. لە ئیستاوە ئیوە بەناو بانگی ـ ئەشرەف ـ ناو ئەبرێن. وە ئەم ناوەروکە تەنیا بە شخصی ئیوە پەی وەندی هەیە.

محمد رضا پهلوی

لە ۱۰ مرداد ۱۰ آب ۹٤٦ تعدیلات و الـگوری وەزیران کرا وە ئەو هینئتە بە شاهنشا ناسران.

١- رئیس الوزرا احمد قوام ـ وەکیلی وزیرانی دەرەوە و کشوەری
٢- تیمسار سپهبد احمدی ـ وەزیری جەنگ
٣- عبدالحسین هژیر ـ مالیه
٤- عبدالهیاری صالح ـ عدلیه
٥- سەرلشکر فیروزی ـ اشغال و مواصلات
٦- مظفر فیروزی ـ عمل و دعایه
٧- نوشیرەوان سپهبدی ـ وزیری مشاور
٨- دکتور اقبال ـ برق و برید
٩- شمس الدین امیر علاء ـ زراعی
١٠- دکتور مرتضی یزدی ـ حجه
١١- ایرج اسکندەر ـ صنعەت و بازرگان
١٢- دکتور فریدون ـ وزیری معارف

چوڵ کردنی زەنگان

بە هوی ئەوەی کە سەرما تشددی پیا کردبو و ئیران یەکان ئەیان زانی. کە نگهبانەکانی دیمکرات لەوە پتر ناتوانن شاخ و چوڵ پەرستی بکەن. وە هەلی

...ار دان نزیک بوتەوە.

...دەولەتی ئیران جعفر پیشەوەریان هەڵ پێ چاپو تسلیم کردنی شاری زەنگان ...لەوەی کە ئەوانیش وەفا بە قراردادەکەیان بکەن کە لە ٢١ خرداد ٣٢٥ ...بانە سەقز و بانە و سەردشت بو کوردەکان چوڵ بکەن.

...ڕوژی ٣ آزرماه کە ریکەوتی ٩٤٦/١١/٢٤ ئەکات زەنگان لە هیزی ...رانی ئازربایجان چوڵ کرا.

...وە ئەو هیزەی کە لە [قەزوین - لە لاین روسەکانەوە ئەدەغە کرابو کە بیتە ...کان - هەر ئەو هیزە گەیشتە زەنگان. لە تفلان کوی - زەنگان لشکری ...ران شەریکی خوینینی لەگەل لشکری ئیرانا کرد. بە کوشتاریکی زور ...کری ئیران خوی گەیاندە زەنگان. ئەمجا دەولەتی ئیران بلاوی کردەوە کە ...بە خوین و شەر زەنگان مان گرتوتەوە نە وەکو بە ئاشتی و خوشی وەکو بە ...اری ٢١ خرداد ٣٢٥ (٣/١١/ ٩٤٦) بەڵێنی مان لە سەردابو. آزربایجانی ...کان ئەو بریارەیان نەبەردە سەر. و ئیمەش ناتوانین سقز و بانە و سەردەشت ...بکەین. چونکە ئیمە زەنگان مان بە هیزی سلاح وەرگرتوتەوە نە وەکو بە ...ئاشتی.

**...وریا بونەوەی جعفر پیشەوەری و قازی محمد**

ئەمجا ئەنجومەنەکانی آزربایجان و کوردستان دەرکیان بەو هەڵە و غلطانە ...لە سەروکەکانیان پێک یان هێناوە. لە هەمو لایکەوە پیشەوەری و قازی ...گران بە جێگای تانە و پڵ و محاسبە لە لاین ئەنجومەن و دانیشتوانو ...انەوە.

ئەمجا قازی محمد - وەلامی نارد بو عشائرەکان کە لشکر بەزی بکەنەوە ...وەی کە لە قبایل زەنگان - سەردەشت و بانە و سقز بە هیزی چەکداری ...ەوە. بەلام لەبەر هەندی ڕوداوی ناشیانە کە لە کاتی خویا باسی ئەکرین ...ی عشائرەکان نەهاتنەوە جبهە. وە باری لاین گیریان هەڵ بژارت.

ئەمجا ٣٠٠ ئەفەری [زەرزە] و ١٢٠٠ نەفەری بارزانی و ٤٠٠ نەفەری

ساپلاغی و ۳۰۰ کەسیکی غەوارەی سویسنی و فیض الله بگی وە کمو
نەبی کەسی کە بە قسەی قازی محمد نەهاتە جبهە. بەلام لەسەر ئەو ت
نامەیەی کە لە کاتی خۆیا ڕوسەکان بە ئازربایجان و کوردەکانیان مور ک
لەسەر ئەو ئیتفاقە ۱۵۰۰ ئەفەر پیش مەرگەی تورکەکانی ئازربایجان لگ
دەبابە و ۳ توپی شاخی و چەک و خواردنیکی تەواو. بە کومەکی ق
محمدەوە هاتن. وە گەیشتنە ناوچەی شەڕ لە جبهەی سەقزەوە.

لە هەمو لایکەوە دەست کرایەوە بە هەڵ پی چانی ئەور ۳ شارانە بو ت
بون. وە لە هەمو لایکەوە گەمارو درانەوە لە کاتی پەلامار دانو هەڵمەتی
ناو شارەکان دابون کە بەیان نامەی قوام السلطنە بە رادیوی تاران
کرایەوە. باری جەنگو مەبەستەکانی کوردی گوری.

بیان نامەی قوام السلطنە بو تشکیلاتی هەمو ایران

لەبەر ئەوەی کە ئیمە ئەمانەوی ئینتخاباتیکی گشتی پیک بی نین. و
پیک هێنانی ئەو هەڵبژارتەیەش ئەبی. سەرانسەری ئیران بە بی ه
ئیستثنایک بە هیزی دەوڵەتی پاریزگاری بکری.

وە بە پی مادە ۲۸ قانونی ئینتخابات ئەبی بە مودەی پینج روژ وە
جیگایانەی کە هیزی دەوڵەتی تیا نیە بە گویرەی مادە ۱۹ یاسای ئینتخا
لیژنەکانی ئینتخاباتی مرکزی ئەتوانن لیژنەی لقی پیک بی نن.

جا لەو وەختەیەوە کە من جەڵەوی فەرمانی دەوڵەتی ئیرانم گرتو
دەست. تا ئیستا هەوڵم داوە کە هەمو وێنە بەسەرهاتیکی ناخوشی ئازربا
لە ناو بەرم.

هەتا ئەو ناقارەی کە قانون ریگای دابم دریغم نەکردوە بە پی
قرادادیەی کە نوماینده‌کانی ئازربایجان بریاریان لەسەردابو کە ناو
(خمسە، زنگان) لە هیزی فیدایی چەکدار چوڵ بکەن.

بو ئەوەی کە باشتر بتوانین هیزی تفاهمی نالەبار لە نیوانا هەیە ه
بگرین.

بڕیارمان وابو ٦ مانگ پێش ئەمڕۆ ئەو ناوچەیە چۆڵ بکرێ. کەچی هەتا ئێستا چۆڵیان نەکردوە. هەر ساتە بە فرۆکەیەک بێ نۆبەک نەدوژنەوە هەتا لەو دوایەدا لەگەڵ هەیئەتی لەشکری ئازربایجان لە تاران ووتو ویژمان کرد. وە وامان بڕیاردا کە ڕۆژی ٢٣/٨/٣٢٥ (١٤/ ١١/ ١٩٤٦) ڕۆژی ئاخر چۆڵ کردنی زەنگان بێ.

بەپێی ئەو بەڵێنە لیژنەیکم لە ئەفسرانی شارەزا کە جێگای باوەڕ بن نارد بۆ زەنگان. کە بە بەرێکی تەوژ ڕێگایکی ئاشتی و ڕێک کەوتن بۆ ئەو بارە بدۆزنەوە.

لە ٢٧ ئابان ٣٢٥ یەکێک لە ئەفسەرانی ئازربایجان تفنگێکی بە سەرهەنگ ئیسحاقی ـ رئیس هەیئەتی دەوڵەتی وە نابو. لە هەمان کاتا تاران بار دەردەست کرا. کە چی لەبەرچاوی ئەو هەیئەتە تاولن باریان بەرەڵا کرد.

لە هەمان ڕۆژا دەستەیەک لە فیدائیانی ئازربایجان لە ناکاو پەلاماری پۆلیس خانەیاندا. چەند پۆلیسێک کە لەگەڵ هەیئەتی ناوبراوا چوبون بۆ زەنگان ئازار سزا و سوکیان بەسەر هێنان وە شاربەدەریان کردبون.

وە ئەو هەیئەتە بە شاربەدەر کراوی گەڕانەوە بۆ تاران. دیموکراتیەکانی ئازربایجان چ لە زەنگان وە چ لە زەیین آوا لەو مودەتەیەدا هیچ دریغ یان نەکردوە لە کاری بێ شەرمانە.

هیچ ژن یان لە ژنانی [زەرین ئاباد ـ بە زۆر لە ئەفسرانی دیموکرات مارە کردوە. وە لەکاتی چۆڵ کردن زەرین ئاباد ـ دو ژن یان بەناوی ـ صفیە ـ حدف بە زۆر ڕاکیشاوەتە زەنگان

وە ژنی آللە ویردی ـ ناوێک یان چوار ڕۆژ لە مێردەکەی دزیوە وە تێشی نا پیاوان لەگەڵ کردوە. وە آللەویردیش ـ یان لەو مودەیەدا زیندانی کردوە. و لەماسی ئاومالێشی کە بای [٥] هەزار تومان بوە لێ یان ساندوە. وە هیچکە لەوەش زۆر رابوری بیس ترمان بو هاتوە لە بارەی کردەوەکانی پیلسرکەی دیموکرات کە تا چە ئەندازەیک تعدای ناموسی دانیشتوانی خەڵکی ئاشکایان کردوە. جا بۆ ئەوەی کە ئەو ژیانو بە درە ووشتیە ڕابگیرێ. دوی شەو

دەستورم دا کە ستونی ـ ١ـ نظامی لە ژیر فرماندەی سەرهەنگ هاشمی دا بچیتە زەنگان. وە لەوی حکومەتی عسکری دابمزرینی.

ئیستا ناسایشی زەنگان زور لە باشی دایە. چونکە روژی ٣/٩/ ٣٢٥ رێکەوتی ٢٤/١١/٩٤٦ نەکات لە سعات ٧ هیزی ئیمە گەیشتونە زەنگان.

من لیرەدا هیچ نادروستیەکم نەکردوە. چونکە لەگەل آستاندار دکتور جاوید ـ بریارماندا بو. ئەگەر هەتا ١٠ روژی تر زەنگان چول نەکری، بە هیزی دەولەتی زەنگان چول ئەکەم. روژی ٢٣ آبان ٣٢٥ رادەی بە ئەنجام هینانی بریارەکەمان بو.

جا بە پی چەوانەی هیوام. ناچار کرام کە بەرپەرەکانی شتی خراپ و نالەبار بکەم.

احمد قوام

سەرەکی وزیرانی ایران

لە هەمان روژا. بو شکاندنی ناوبانگی دیمکراتیەکانی ئازربایجان هینتیک یان لە روژنامە نوسەکان لەسەر حسابی لشکر نارد بو زەنگان و خمسە ـ وە چەند مضبطە و سکالایک یان لە دژی سەرکردەکان دیکرات ـ وەکو ابوالفضلی رئوفی اوحدی ـ رضائی ـ حیدەری ـ

بە موری ابوطالبی رهبەری و نعمت اللە ابودی ـ و ابوالفتح امجدی و دکتور رهبەری ـ دروست کرد. هینتی ناوبراو ئەو شکایەت و هەل بەستانەی لەسەر شیوەیکی ناشیرینی لە رەووشت بەدەرانەی دیکراتیەت لە روژنامەکانیانا بلاو کردەوە ئەمجا لە روژە مانگی ئازەر ٣٢٥ تلگرافی خوارەوە لە لاین قوام السلطنەوە درا بە ئاستانداری آزربایجان دکتور جاوید

تلگرافی انذاری قوام السلطنە بو دکتور جاوید استانداری تەوریز

آغای دوکتور جاوید ئاستانداری تەوریز

هەر وەکو لەمەو پیش ووترا. ئەبی ئوردومان بچی بو ئەو پەری مەملەکەت لەبارەی ئینتخاباتی ئازادانەوە. چونکە ئازربایجانیش وەکو ولاتەکانی تر

نهرانی پی ویستی به ئینتخابات هەیە. بەلام هەر ئازار و کەموکوڕیێک بەو
لشکرە بکات مانای ئەوەیە انتخاباتەکە لەکەدار ئەکریت.
و هندی پروپاغندەش کە لە رادیۆی تەوریز بلاو ئەکریتەوە زور خطرە بو
معنویاتی ئینتخابات و ئاسانجی تای بەتی دەولەتی ئمبی بە گورجی قەدەغەی
ئەو شتانە بکەن

احمد قوام

روژی ٣٢٥/٩/٨ وەزیری مالیە هژیر و موسەوی زادە وەزیری عدلیە و
دکتور شایگان وزیری معارف لەگەل وەزیری بهداری وە وەزیری دعایە و مدیری
گشتی ریگای ئاسن. بو دلی ئەوایی دانیشتوانی زەنگان چونە زەنگان. لە
مرگەوتی شا لە حضور چەند هەزار کەسیک خوشەویستنی شایان بە گوێ
هەلکا راگەیاند.

وەلامی تلگرافی قوام لە لاین دوکتور جاویدەوە

جنابی ئاغای ئەشرەف قوام السلطنه سەرەک وەزیری ئیران لەبەر ئەوەی
ئەنجومەنی ئەیالەتی بە هاتنی نیروی ئیران موافقەت ناکات. هێزی دیکراتی
ئازربایجان لە بەرام بەر هەر گونە پەلامار و کوشتاریک خوی بە تاوان بار
ئازانی.
چونکە دەولەتی ئازربایجان لە تەوانایا هەیە. کە لە مەرز و قەلەم رەوی
خویدا لە ژیر سەرپەرشتی پیشمرگەکانی خویا پی ویستی ئینتخاباتی عادلانە
پیک بی نی لە حدودی قانونا. وە قرار دادەی ٢١ خردادی ٣٢٥ (١١/٦/
٩٤٦ پی چەوانەی هاتنی نیروی دەولەتی شاهنشاهیە بو ئازربایجان.
دوکتور جاوید ئاستانداری ئازربایجان

تلگرافی دوبارەی قەوام السلطنه

جنابی ئاغای دوکتور جاوید ئاستانداری ئازربایجان
بیان نامەی ئەنجومەنی ئەیالەتی تان بە پی چەوانەی یکیەتی کشور و

چونکە ئازربایجان لەبارەی یەکیەتی وەلاتەوە هیچ جیاوازیک و ئیمتیازیکی تای بەتی نیە لەگەل ئەیالەتەکانی ترا.
ئەوەی کە ئیوە باستان کردوە گوایائازربایجان خۆی نەتوانی لە بابەت هاتنی نیرودا. ئەوە زۆر غەلەتە
ئیستاش ئەوا بریار درا کە لشکری دەوڵەتی بو ئەو ناوەی بی جا پی ویستە زور باش ئیستقبالی لشکر بکەن.
چونکە لەبەر مسئلەی هەل بژارتن هاتنی لشکر بو ئەو ناوە زور پی ویستە.

ئەحمد قوام

١٠ / ٩/ ٣٢٥ (١٩٤٦/١٢/١)

وەلامی تلگرافی قەوام لە لاین ئاستانداری تەوریز
جنابی اشرف آغای نخست وەزیری ئیران
ئەنجومەنی ئەیالەتی ئازربایجان بە هیچ باری ناتوانی قبولی هاتنی لشکری حکومەتی ئیران بکات. هیزی ئازربایجان هەتا دوا هەناسەی لەسر ئازادی خواهیەتی خۆی ئامادەیە بۆ بەرەرەکانی لەگەل لشکری ئیرانا.
بەرامبەر بە بریاری ٢١ خرداد ئەیالەتی ئازربایجان ئامادەیە بو یەکیەتی و خذمەتی برایانە.

دکتور جاوید
ئاستاندار

لە ١٩ مانگی ئازەری کە ریکەوتی ١٠ /١٩٤٦/١٢ ئەکات ئوردوی دەولەتی لە زەنگانەوە بو قولی ـ میانە ـ قافلان کو ـ تەوریز ـ خرایە بزوتن. قوام السلطنە بو جاری ٣سەهەم داوای بە پەروە چونی ئوردوی لە ئاستاندار دوکتور جاوید کردەوە. وە لە لاین آستانداری تەوریزەوە بە وینەی خوارەوە بە برواری ٣٢٥/٩/٢٠ تلگرافی رەزامەندی و تسلیم بونی بۆ قوام السلطنە نوسی

جنابی ئەشرەف سەرەک وزیرانی ئیران

تلگرافی ژمارە ٢٠٤٨تان بە پەروشەوە ئەمرو بە من گەیشت کە ریکەوتی ٣٢٥/٩/٢٠ کە ١٢/١١/ ٩٤٦ ئەکات هەر چەندە کە مەبەستی تلگرافەکەتان ٢٤ ساعت دوا کەوتوە بەلام حضرەتی اشرف بو خوی ئەزانی کە من هەمیشە تی کوشاوم کە بە حسن نیەتی جنابی اشرف دوایی بەکاری ئازربایجان بی نین.

وە ئەو باسەشم عرض آغای سیفی قاضی کردوە. بو ئەوەی کە ئەویش وا لە بیر و باوەری برادەر کوژی بی نی. و هەر ئیستا فەرمانم دا بە گەرانەوەی ئەو لشکرەی کە بە کومەکی قازی محمد چوون بو ناوچەی سەقز. ئیوەش دەستورات بە لشکری (١) بدەن کە واز لە کوشتن و پەلاماردان بی نی. بە بی جەنگو ئاژاوە تشریف بهینیتە تەوریز.

و موافقەتیش بفرمو کە خوشم بە پیر نیروی شاهنشاهیەوە بچم بو میانە ـ

دوکتور جاوید

ئاستانداری تەوریز

داگیرکرانی تەوریز لە لاین سەرتیپ هاشمیەوە

روژی ٣٢٥/٩/٢٢ کە ریکەوتی ١٣ کانونی یەکەمی ٩٤٦ اکات لە ژیر فرماندەی سەرتیپ هاشمی لشکری یک (١) گەیشتە تەوریز و هەندی کەس کە دلشکاوی دەستی دیکرات بون. بە هەلیان ئازانی لەگەل لشکری دەولەتیدا پەلاماری پیشمرگەی ئازربایجانیاندا ٢٤ ساعەت لە نیوانی ئازادی خواهانی دیکرات وە دەولەت خواهەکان بو بە شەر لەو جەنگی براگوژیدا ٩٥٠ کەس لە بی لاین وە لاین دار کوژران ئەمجا لە دوای دابین بونی وضعیەت.

سەرتیپ هاشمی فرماندەی ستونی اعزامی بەرامبەر بە خەلکی تەوریز بە نوسراوی خوارەوە بیان نامەیکی بلاو کردەوە.

دانیشتوانی بەریزی تەوریز.

لەمەودای دو روژا کە دانیشتوان کومەگ بە لشکر وەستابون بەناوی

حکومەتەوە زۆر سپاستان نەکەم

ئیستا کە لشکر لە ناو شارایە وە لە هەمو باریکەوە دابینی آسایش کراوە پی ویستە هەمو لایک تان لاین گیری ئارام و ئاسودەی بن بچنەوە بو مالی خوتان. لیرە بەم لاوە هەر کەسیک تەقە بکات سزایکی گەورە ئەدری.

هەر لە رادیوی تەوریزا سەرتیپ هاشمی ئەو راپورەی دا بە ستادی ئارتەشی ئیران،

لەبەر ئەوەی کە مهاجرەکانی تەوریز سیمی تلگرافەکانیان بریوە بویە بە رادیو ئەو راپورە پیشکەش ئەکەم،

بو پیک هینانی فەرمانی اعلیحضرت شاهنشا. ئەمرو خوم لەگەل چەند ماشینیکی جەنگی وە چەند تانکو زرەپوشیکا لەکاتی (٥) دوای نیوەرو گەیشتمە ناو شاری تەوریز. خوزگام روژنامە نوسیک لیرە موجود بوایە بو ئەوەی کە احساساتی مللەتی تەوریزیان وەربگرتایە.

بەلام کوچەریەکان لە دەروی شارەوە چەند خانویک یان ئشغال کردوە. تەقە لە سەرباز و دانیشتوانی تەوریز ئەکەن. ئەوا فەرمانم دا کە ئەو خانوانە لە لاین سەربازەوە ئیشغال بکرین ئەگەر مهاجرەکان خویان بە دەستەوە ئەدا بریارم داوە بە کوشتنی یان. بژی ئەعلیحضرتی شاهنشاهی پهلوی. پاینده بی ئیران

هاشمی

فرماندەی لشکری (١) آزربایجان

چەند ئەفەر لە سەرکردەکانی ئەیالەتی ئازربایجان وەکو جعفر پیشەوەری، مهندس ئازەری و و گاویان. پادەگان ـ ژنرال پەناهیان ـ غلام یحی بە ١٠٠ ئوتومبیلی باری وە لە جلفای حدودی ئیران پەرینەوە وە خویان هاویتە باوەشی روسیا.

لە ژیر فرماندەی سرهنگ مقیاسی لە هەمان کاتا لە شاری ئاستارا ـ خو رژیکی تەواو کرا.

لە روژی ٢٥ / ٩/ ٣٢٥دا دوکتور جاویدی ئاستانداری تەوریز و شبستری رئیس گشتی شهرداری کە تلگرافی تسلیم بونیان بو قوام السلطنە نوسی

وە لە میانە پیش وازی لشکری ئیرانیان کردبو. لە جیاتی ئەو احساسات و خذمەت گوزاریە هەردوکیان زیندانی کردن و بە کەلەبچە کراوی ڕەوانەی تاران کران.

سوپاسی شاە ـ بو قوام السلطنە
جنابی ئەشرەف آغای تخست وەزیر
لەو شوینەدا کە بە یارمەتی خوای گەورە. غائلەی ئازربایجان مان لەسەر هەلگیرا. وە سەرکەوتنیکی زۆر بەرزمان دەست گیر بو ئەوا شادمانی خۆم بە تۆ ڕاتەگەینم کە کۆششی بەرزی تۆ تاثیریکی زۆری کردوتە سەر هەلگرتنی مشاکل و ئاژاوەی وەلات.
ڕوحیە و احساساتی تو بیر و دالغەی ئازربایجانی نەهیشت. هیوام وایە بەم قابلیەتە وە ئیصلاحاتی ئیران تەواو بکەیت.

محمد پهلوی

لە ڕوژی ٢٦/ آزری ٣٢٥ (١٧/١٢/٩٤٦) بە پی تەقە دو هەنگی سوارەی لشکری ئیران لە ژیر فەرماندەی سەرتیپ همایونی گیشتە ساپلاغ لە لاین قاضی محمد و ئەهالی ساپلاغەوە بەڕیز و ویلیکی زور گەورە پیش وازی لەو لشکرە کرا. کە لە وەختی خویا بە دریژی ئەو باسەتان پیشکەش ئەکەین.

|| تی بی نی ـ ملاحەزاتیکی شخصی
بەسەرهاتی ئازربایجان و حکومەتی کوردستان قازی محمد ـ بەو پی یەی کە باس مان کرد دامەزرا وە بەم پی یەش لە ناوچە. چاکە و هونەرمەندی وە پشتیوانی ڕوسەکانیش هەر ئەوە بو کە بە عرضتان گیاندرا.
جا دەولەتی جماهیری یکیەتی شورەوی کە بەناوی پاریزەری مللەتان ناویان بلاو بو بووە. بەرامبەر بە قضیەی کورد هەر ئەو دەورەیان بری. کە انگلیس بە ناوی ئیستعمارەیەتەوە بری بوی.

ڕوسەکان ئەو هەمو گوڕ و لافەی ئازاد پەرستیەی کە مللەتانی هەژار بە هیوای بون. بە پێ چەوانەی چاوەڕوان و هیوا خۆیان نیشاندا.

وە بو مللەتانی بی دەسەلاتیان ڕون کردەوە. کە ئەوانیش لە بەسەرهاتی ئیستعماریەت و نفوزی سیاسی و طماع پەرستیدا. طبقی ئەو [کەتەلوکە] یەن کە دەوڵەتانی ئیستعماری انگلیس و امریکای لی دروست کراوە

تەنیا بو هەندی سودی سیاسی وە نەختی نەوتی دروی ئیران. ڕوسەکان ئەو هەمو جەفایەیان بەسەر مللەتی ئازربایجانو کوردا هینا.

لە پیش هاتنی روس بو ئیران. تا ئەندازەیەک ئیرانو کورد ئاشنایەتیەک و خۆشەویستنیەک یان بە یەکەوە گرتبووە. بەلام بە ئەوەڵ هاتنی ڕوس بو ئیران ئەو برایەتیە لێک هەڵوەشایەوە.

کورد و ئازربایجانی بۆ هەندی نەوتی ئیران توشی ئەو بەدبەختیە کرد. وە ختیەوە باوەشی هەژدهایکی ئیران کە بە بی خوین و کوشتن داهینی ئەنمەات

لەو بارەوە دام کە انگیسەکان لە ڕوسەکان بو قضیەی کورد بە پەروشتر و خاوەن زەمیرتر بوین

لەسەر قضیەی کوردستان جنوبی کە انگلیس بو شیخ محمودی دروست کردبو هیچ خوین و خنکاندی تیا نەهاتە ڕو.

هەر وەکو کوردستانەکەشی تیک دایەوە. نەشی هیشت هیچ کەس بکوژری وە تا ئەندازەیکیش سەربەستی دا بە کوردەکانی عراق وە تا حەدیکی پشتیوانی لی نەکردن.

لەبارەی خویندن و نوسین وە چونە ناو وزارەت و دامەزراندن یان چاویکی چون یەکی. وە سەربەستی نوسین و ڕوژنامە و گوفار و چاپ خانە. داخل بون یان بە ئەندامی پەرلەمان بەلام کوردی ئیران کە خۆیان بەدەست ن جماهیری شوروی سوسیالیستی ئەزانی. لە پاش ئەو هەمو فیداکاریەی کە ڕوسیا بە خەرج دا.

لە پاداشتا تەنها خنکانو کوشتن و تالانو ئەتکو سوکیان پێ برا. بەسەرهاتی ڕوس و انگلیس بو کوردەکان بو بە دەرس و تجربەیکی زور گەو

کوردەکان ئەبی ئەو دو بە سەرهاتەی روس و انگلیسە لە هەمو کاتیکا بی ئەوە بەرچاو. لەهەر کاتیکا کە ویست یان شورش بکەن. ئەبی بەراووردی هیزی خۆیان بکەن ئایا ئەتوانن بە بی پشتیوانی مللەتان برگری مالی خویان بکەن. چونکە کورد بە بی قابلیەتی خوی ناتوانی هیچ هەنگاویکی شورش و سەر بە خویەتی خوی ببری.

پارمەتی وەلاتان هەر تەو بروایەی پی ئەکری کە انگلیس و روی بەرامبەر بە یارمەتی کوردەکان بە خەرج یانداوە.

چونکە مللەتانی استعمار. بو ئەوە یارمەتی مللەتیکی دوهەم ئەدەن کە بە هزی ئەو مللەتەوە مصالح یان پیش بکەوی. وە بویان ببیتە پردیک کە بەسەریا پەر ئەوە بو ئەو وەلاتەی کە ئەو مللەتە لە دژی ئەو هەستاوەتە پی وە داوای مافی خوی لی ئەکات. هەرگاه. ئەو مەبەستەیان تا ئەندازەیک پیک هات. وە یا شتیکی لەوە چەورتریان لە جیگایکی تر نیشان درا. ئەو پیلانو بارە ئەگورن بانەددنەوە سەر ئەزمو هەوایکی تر.

هیچ سلی وە مەترسی لە تاوان وە زمیر ناکەن کە بە هوی دەست لە پشت دانی ئەو دەولەتە پاریزەرە ئەو مللەتە بچکولەیە توشی هەزاران مشاکل وە شیرازە پسان بووە. وە بە هەزاران خوین و ئەرک ئیشەکەی وەکو خوی بو لی ناکریتەوە وە لەوەش پی ویست تر ئەوەیە کە کورد ئەبی موازەنەی ئەوە بکات کی بە کەلکی ئەو دی لە ناکامی دوستایەتیدا کە هیچ ئەبی خوی بکات بە دوستی دەولەتیک. کە لە خوی تیر و پرتر بی. وە هەمو کاتیک بتوانی یارمەتی ناشکرایی بدات. وە دەولەتیکی دەولەمەند و جهان گیر بی. نە وەکو دەلەتیکی برسی و سەرشیواو بی. لەسەر حسابی وەلاتان خوی بژینی جا هیوادارم کە مللەتی کورد سودیکی تەواو لەو رووداوەی نازربایجان و مهاباد وەربگرن. وە بە غەلەت و هەلەی لەمەوبەریان. ریگای داهاتویان رون بکەنەوە.

***

## بەشی چوارەم (٤)

### تشکیلاتی حکومەتی قازی محمد لە مهابادا

**گەنجینەی کوردستانی ئازاد**

لە هەوڵی شورشی شهری وەری ٣٢٠ ـ ١٩٤١ مانگی ایلول لە کاتیکا کە ئیرانیەکان ساباڵغ یان چوڵ کرد. خواردەمنیکی باشی یان بە جێ هێشت. لەگەل توتنیکی زوردا.

کاتی کە ئاژاوەی ئازربایجان دەست پی کرا. قازی محمد توتنەکانی بە روس فروشت بە ٦ ملیون تومان. وە لە مقابلی ئەو پارەیە چەکی لە روس وەرگرت بە پی ئیعترافی قازی محمد. بەلام ئەو پارەیە بەشی ئەو هەمو خەرج و چەکو شتەی نەئەکرد ئەگەر روسەکان بە هوی ئازربایجانیەکانەوە دەستی یارمەتی یان بو کوردەکان دریژ نەکردایە. بو نمونەی مسال.

حمە حسین خانی سیف وەزیری جەنگی مهاباد ـ لە روژی ١٠/ تموزی ٩٤٦دا هاتە [سەرا] بە جنرال مایور حمە رشیدخانی ووت پی ویستە خوت لەمەولا سەرپەرشتی خواردەمەنی لشکر بکەیت چونکە باری اقتصادیاتمان زور خەراپە. هەتا لەو روژانە چووم بو تەوریز هیچ دایرە و جیگایکی مەبەست نەماوە کە سەری پیا نەکەم هەتا ٧٠ هەزار تومانم چنگ کەوتوە.

ئازربایجانیەکان فکریان وایە کە لەمەولا چیتر کومەکی یارمەمان نەکەن.

**واریداتی کوردستانی قازی محمد**

١- لە ٩٤٠ دا دەوڵەتی ایران قانونی مالیات بەر دەرامدی ـ ضریبەالعقار و ضریبەالدخل ـ دانا. بەلام بەسەر تطبیق وە ئەنجام هینانە دی رانەگەیشت.

قازی محمد ـ ئەو رەسمیاتەی وەرنەگرت وە تا ئەندازەیک ئەو رسوماتانە

یارمەتی گەنجینەی قازی محمدی نەدا.

٢- لە ئەوەڵی دامەزراندنی بناغەی شورش تعصب دڵ گەرمی وە خۆشەویستی زۆر بو. لەترسی ئەوەی کە دوبارە دەوری زورداری دەوڵەتی تهران نەگەڕیتەوە. کوردەکان ئامادە بون بە هەمو وینە یارمەتیک. ئاغای وا هەبو دەستی لە دیهاتەکانی خوی هەڵ ئەگرت بو خەزینە. زۆر کەسی وا هەبو پیلی ژنو منالەکانی خوی هەڵ ئەگرت وە هەرچی دارایکی هەی بو بە قازی محمد و گەنجینەی مهابادی ئەیەخشی. هەندی کەسی وا هەبو. کورەکەی لە ژیر پی قازی محمدا دریژ ئەکرد ئەی ویست بیکا بە قوربانی کوردستان.

بەڵام داخی گرانم هەتا حاصلات و نوخشەی تازە پی گەیشت ئەو تعصب و خوین گەرمیە سارد بووە.

بەلکو ئیشەکە وای لی هات بە زوری پولیسیش - رەسوماتی بریار لەسەردراویان نەئەدا بە گەنجینە.

چونکە هەندی معاملەی ئاشیانەی پیشمرگەوە ئەفسەرە تازە پی یا گەوتووەکان. بو بو بە هوی ئەوەی کە هەزاران جار پشیمان بوینەوە بو دەوری [ ئەمنیە خوین خورەکانی ] زەمانی رەزا شا.

کردەوەی هەندی موچەخوری یەک شەرەی مهاباد - بوبو بە هۆی ئەوەی کە ئاغا و کرمانج و بەردەست لەیەک تر راست بینەوە وە پەلاماری یەکتر بدەن.

ناژاوە و بلاوەیکی زور خرابو ئەوانی فلاح و مالک. ئەو دڵسوز و مخلسانەی کە گیانی خویو منالەکان یان بە گەنجینە ئەبەخشی ئەگەر بویان بکرایە هەر گەنجینەکەی قازی محمدیان ئەدا بە کولا و ئەیان فراند.

٣- گەنجینە سودی لە هەندی دیاتی ئاغوات کردبو. حما آغای عباسی لە ئاوچەی بوکان ٧ دی هەبو بو دەوڵەتی قازی محمد بە جی مابو خوّی بو بو بە لایەنگری دەوڵەتی وە چۆ بو بۆ تاران. وە غیری ئەوەش نزیکەی ١٠ هەزار پوت گەلی بو شورش بەجی مابو.

٤- حسامی داشکستان - کە دانیشتوی منطقەی هەوشار بو لە ترسی یەکراتی سایەقلا - فرارا چوبو ناو ئەشکەوتیک کە ناسراوە بە [ تەختی

سلیمان ـ قازی محمد به دیلی هینایه سابلاغ نزیکەی ۲۰۰ تمن گەنی گیرا لەگەل هەمو کەلوپەلیکی ناو مالی که تقدیر اکرا به ملیونیک تومان.

ژنەکەی لەو هەمو ناو مالە ئەنگوسیلەیکی الماسی بو دەرچو. ئەوەی تری هەموی بو به مالی گەنجینە.

٥- امین لشکر ـ که سیکی زرە کورد بو لە ناوچەی هەوشار دانیشتو جنسیەتی ئازربایجانی بو خوی وەرگرتبو. وه زور کابرایکی دەولەت پەرست و رەزیل بو [۱٥۰] دی هەبو لە ناوچەی سنه و تیکان تەپە و میاندواو] مەهاباد ـ وه زور دولەمند بو لە شیوەی راجەکانی هندوستان وه یا لورتەکانی انگلترەدا بو. وه یا لە شیوەی سەروکی تایفەی اسماعیلی ـ هندوستان ئاغا خان ـ ناو بو

فەرماندەی هیزی سایتقلا [ئارامی] رمەنی ـ مالەکەی تالان کرد ۱۰۰ سینی نان خواردنیان لە مالەکەیا به تالان برد.

ئەو شخصه خویو ژنەکەی به پەلە پروزه رزگاریان بو. به روتی چون بو تاران. لەو دیهاتانه ۷ دی بەر ناوچەی مهاباد کەوتبو. وه لە لاین احمد خانی خلیل خانەوه ـ سەرپەرەشتی ئەو ۷ دی یه ئەکرا بو گەنجینە.

٦- لە رسومات وەرگرتن دەستیکی بالایان هەبو. هەتا میرزا رحمت الله شافعی ـ که یەکیک بو لە بازرگانه ناودارەکانی سابلاغ. بەناوی مالیاتی بەردرامەد ـ وه لە ژیریشەوه به کینەی ئیران پەرستی ۱٥۰ هەزار تومانیان لی ساند بو گەنجینە.

۷- ئەو کەسانەی که به دوستی دەولەتی ئیران ئەزانران. لە ناوچەی کوردستان دور ئەخرانەوه ملک و ئەساسیەی که هەیان بو بو گەنجینە ئەمایەوه.

عزیز خانی زندی ـ سید محمد نقدەی ـ لطیفی قاچاغ چی ـ لە ساباغ مام بایزی قرەنی آغای مامەش. عبدالله خانی بایز پاشای مەنگور ـ ئەمانه لەو وینه فراریو دورخراوانه بون که ملکەکانیان بو گەنجینە مابووه.

۸- پارەی کارت ـ واریداتیکی باش بو. ئەبو هەر کەسی که داخلی حزبی دیکرات ببوایه حەقی دخولیه وه مانگانه وه پارەی کارتی بدایه به مسئولانی

وب.

جا واریداتی دەولەتی قازی محمد لەو شتانە پیک هات. هەر شتی کە لە دەوری حکومەتی وەربگیرایە. لە دەوری قازی محمدیشا وەرنەگیرا بەلام مصروفات زور لە واریدات بەرەژورتر بو. ئەگەر یارمەتی دەولەتی ئازربایجان وا یا جهتیکی تر نەبوایە. واریداتەکەیان بەشی هیچ مصروفاتیکی نەئەکرد.

لەگەل ئەوەشا لە واریدات کو کردنەوە و دەفتەری صفیاتا دەستی دزین زۆر بو. دەستی پیسی چەپەلی دزەکانی دەولەتی تیران لەناو ئەو حکومەتە تازە پیکولانەیەشا کەوتبو ئیش.

هینتی بازرەسی و لی کولینەوەشیان هەر وەکو ئەو کەسانە وابون کە بە پلکەنی دزی ناوزەد کرابون.

بو نمونەی مثال ـ ماموری گمرگی بوکان ئاغای ئیسحاقی ناو لە واریداتی سالیکی بوکان [ ٥ ] هەزار تومان واریدات نیشاندابو. کە چی لە هەن کاتا واریداتی تەنهای بەشی گومرک سالیک ۷۰ هەزار تومان بوە لە سالی پیشودا. لەسەر ئەم ناشیرینیە ماموری ناو براو برایە سابلاغ لە دوای پیج روژ بەندی بەرەلا کرا. وە کردیان بە ماموری دابەش کردنی زەخیرەی هەبهەکانی لشکر لە سابلاغا کە ئەم وظیفە تازەیەی زور لە ئیشە کونەکەی پەورتر و بی قرەتر بو. دزی ناو لشکریشا بە ئەندازەیکی تەواو پی گەیشتبو و سکالای پیشمرگە بو ئەو بارە زور بو. بەلام لەبەر تشویش نکردنی ناوبانگی لشکر لەو کاتەدا چاوپوشی لەو وینە پرسینەوەیە کرابو.

خواردنی ئەفەریک پیشمرگە بو دە روژ بریەتی بو لەو زەخیرانەی خوارەوە کە لە لاین ماموری تخشائی وە تسلیم بە فەرماندەکانی جبهە ئەکرا.

گرام

۹٥۰ برنج

۲٥۰ رون

۱٥۰ چار

٥۰۰ شکر

۱۵۰۰ گوشت
۱۰ کیلو گەنم
۲ دەستە پەرە سیغار
۲ دانە شغارتە
۱ قالب سابون
۳۵۰ غرام توتن
روژی یەک قران بە نقدی ئەدرایە دەست فەرماندەکان بو هیلکە و ماست و شیر.

جا ئەگر یارمەتی ئازربایجان نەبوایە قازی محمد نەی ئەتوانی بە واریداتی داخلی ناوخوی هیچ مەبەستیکی پیک بی نی.

وە ئازربایجانیەکانیش کە چوبونە ژیر ئەو ئەرک و مخارجەیە بو دو ئامانج بو.

یا بە هیوای ئەوە بون کە مهاباد جزئی ئازربایجان بی وە لە سەر ئەخشەی ئاستانیک لەناو قالبی ئازربایجانا قالی بکریتەوە.

وە یا روسیا بەدەستوراتی نهینی ئازربایجانی ناچار کردبو بو تامین ئەو داخوازانەی قازی محمد. بە پی ئەو اتفاق نامەیەی کە لە وەختی خویا پی گرتبون.

خەیالەکانی قازی محمد بو پرکردنی گەنجینە

قازی محمد بو پرکردنی گەنجینەی حکومەتەکەی زور دەوری خەیالاتی ئالی ئەکردەوە. بەلام هەتا دوایی حکومەتەکەی بەسەر هیچ کامیکیانا زال نەبو. لە هەوڵی شورشەکەیا چاوی لە راپەرینی ئەڵمانیەکان ئەکرد کە لە ساڵی ۱۸۰۷دا خوشکەکانی ئمپراتور [فەردریک] خشڵی خویان خستە ناو گەنجینەی ئەڵمانیا بو پر کردنەوەی گەنجینەکەیان وە رزگاربونیان لە چنگ ناپلیونی فەرانسا.

وە کچەکانی پروسیا و ـ ئەڵمانیا قژەکانی خویان بە ژنە فرانسایەکا

ئەلروشت وە پارەکانیان نەخستە ناو گەنجینەی ئەڵمانیا. تەنها بو ئەوەی کە بتوانی بەم یارمەتیە خویان لە چنگ ناپلیون رزار بکەن.

قازی محمدیش هەر بەم وەرزشو خەیاڵە بلاوی کردەوە. هەر کەسێک هشلی ژنان و چەک و سەعات و شتی نایابی هەبی لە مسەن وە یا مجوهەرات بی خاتە بەردەستی گەنجینەی کوردستان. بەرامبەر بە موور و سند. بو ئەوەی حکومەت بتوانی ئەو مجوەراتانە بخاتە رهنی بانقەکانی عالمیەوە. وە لە مقابلیا پارەی قاقەز دەربی نی لە تاکاما خزینە بە [سگرتوکراوی] ئەو شتانە بو خاوەنەکانیان رەت نەکاتەوە.

بەلام لەبەر ئەوەی کە قابلیەتی کورد و قابلیەتی ئەمسا و ئەڵمانیا نیوانیکی زوری هەبو. بەداخەوە [بەنکە تەسبیحیکیش - یان نەخستە ناو گەنجینەی مهابادەوە. گەنجینە هەروا بە روتی و لاتی مایەوە

٢- ئەمجا قازی محمد هاتە سەر ئەو بیرە کە تحدیدی دارایی خەڵک بکات وە زیادەکەی لە خەلک وەربگری بیکات بە دەست مایەی بانق ەوە سکە لیدان. لە دوایشا ئەو پارەیە بە قائضی نظامیەوە بو خاوەنەکانی رەت بکاتەوە. وە لەمەشا سەر نەکەوت.

٣- ئەمجا قازی محمد هاتە سەر ئەو بیرە کە شەریکەیک لە ساباڵغ بکاتەوە. هەمو وینە حاصلاتیک وەربگری وە هەمو شتیکی دەرەوەش بگری لەو شەریکە شت دابەش بکا بەسەر فروشیارەکانی ناو خویی دا.

هەمو پارەداریک بە پی تەوانا سەهمی لەو شەریکەیەدا هەبی نیوەی واریداتی ئەو شەریکەیە دابەش بکری بەسەر هەمو بەشداریک بە پی نسبەت و مالیات. وە نیوەکەی تریشی بو دەولەتی قازی محمد بی. دیسان لەم فکرەشا سەر نەکەوت وە کەس بە دەنگیەوە نەهات.

٤- ئەمجا هاتە سەر ئەو بیرە کە شرکەتیکی محدود لە خەڵکی ساباڵغ دروست بکات و ئیمتیازی شت کرین یان بو لە دەوڵەتی روس وەر بگری. وە بە ناوی ئەو شەریکەیەوە چەپی ویستیکی دیکراتی یان بو بە هوی ئەو شەریکەیەوە وەری بگرن بعظا بە قەرز و هەندیکیشی بە نەخت کاری.

له ناكاما ئەو شەريكەيە دامەزرا سەرمايەی گەيشتە [٤] مليون تومان لقی ئەو شەريكەيە لە تەوريز و باقی شارەكان كرايەوە بەلام بە پەروشەوە بەمە رانەگەيشتن كە شت لە روسياوە بگەينە سابلاغ كە بومبای تيک چونی نازربايجان تەقی. وە ئەو شەريكەی كوردستانەی لەناو برد.

فەرق لە تيوانی خزينەی نازربايجان و مهاباد

..گەنجينەی آزربايجان لەگەل گەنجينەی مهابادا فەرقيكی زوری هەبو گەنجينەی نازربايجان زور پر بو. چونكە دەست كەوتيكی زوريان لە چەک و ئوتوموبيل كەرستەی جەنگی و جلوبەرگی سەربازی وە خواردەمەنيک زوريان لە دەولەتی ئيرانەوە بو بەجی مابو. شارەكانی ناوچەی تەوريز رەزائيە لە چل شار بەرە ژورتر بون. شارەكانی ناوچەی سابلاغ لە ٦ شار بەرەژورتر نەبون

٢- بی جگە لەوەش ٦ مليون تومانيان لە پارەی [چەوەندەر] لە گەنجينەی مياندوا وا چنگ كەوت. كە ئەم پارەيە بە هی كوردەكان بو چەوەندريان دابو بە كارخانەی قەندی مياندواو وە دەفرپای پارە وەرگرتنەكەی نەكەوتن بو نازربايجانيەكان مايەوە.

وە بی جگە لەو پارەيەش شكری ساليكی كارخانەی مياندواويان بو مايەوە كە تقدير ئەكرا بە ٢٥ هەزار تمن شكر.

حق وابو نيوەی ئەو شكرە بدرايە بە دەولەتی كوردستان چونكە لە دابەش كردنی ئەرازی و دامەزراندنی سنور نيوەی ناوچەی مياندواو بەر كوردستان كەوتبو چونكە زورترين ئەو بەشە كوردی زمان بون.

ديسان حق وابو ئەو ٦ مليون تەومانەش هەر بدرايە بە قازی محمد چونكە پارەی چەوەندەری كوردەكان بو.

كە چی لە بەرامبەر ٦ مليون تومان و نيوەی شكری كارخانەی مياندواو كە ٢٥ هەزار تمن بو ٣٠ تەن شەكريانداً بو بە قازی محمد. وە پارەی خەلكەكەش سەری تيا چو.

٣- بانكی شاهنشاهی ئيران لە تەوريزا هەبو. پارەی ئەو بانقە كەوتە

دەست شورش گیرەکان.

چەند کارخانەیکی فاصون ـ شوشە ـ فەرش سازی ـ چەرم ـ قوندەرە و پی لاو ـ شخارتە ـ دارتاشی ـ لە شارەکانی ئازربایجانا هەبو دەست دیکراتیەکانی آزربایجان کەوت. نزیکەی ۵۰۰ دەولەمەندی قورس لە ترسی تودەی شیوعی هەلاتبون چوبون بو تاران. مالو دەولەتەکەیان بو شورش گیرەکانی تودە مابووە.

دیـــان ملکی مـیـری لـە ئازربـایجـانـا زور بـو. بە پارە و پـولیـکی باش دابەشیان نەکرد بەسـەر فلاح و کاسب کارانا. ئەو پارانەش هەر نەچووە ناو گەنجینەی ئازربایجان.

لەوەش سەیرتر زوربەیان ئەخستە سەر دارایەتی دەولەمەندەکان. بەو ناوەوە دەولەمەندەکان یان روتان بووە بو گەنجینە.

٤- لەسەر راپوری بەدکاران (علی خان وە علی اشرف خان ـ ناوان ـ کە کوردی تابع ئازربایجـان بون گـیـران وە لە تەوریز اعـدام کـران [ ۳۰ ] پارچە ملکیان بە گەنجینەی ئازربایجان برا.

وە لە مـیـراتی امین لشکر ناو ـ [ ۷۰ ] دی یان چنگ کەوتبو. بی جگە لەوەش تنظیمی ئیدارە و سەرپرشتی. ئیش یان لە هی کوردەکان باشتر بو چونکە خویندەوار پیاوی مەدەنی یان لە کوردەکان زورتر بو. بە تای بەتی ئەو مهاجرانەی کە لە روسیاوە بو هەنگاوی جاسوسی هاتبونە ئازربایجان تەربیە و خوندەواری روسیان هەبو زور شارەزای اموری سیاسی و اداری و عسکری بون.

زورترین سەروکی ادارەکانی ئازربایجان لەو پیاوانە پیک هاتبو. لە هەمو باریکەوە ئەوان لە کوردەکان ووریاتر و زیندوتر بون لە کار و فەرمانی ناو حوبەتیدا.

ئالای سەربەخوی کوردستانی ئازادی مهاباد

لەگەل دامەزراندنی کوردستانی ئازاد ئالایک هەل کرا لە ۳ رەنگ بەرهەم هینرابو سور، سەوز، سپی، وە لە ناوەراستی ئالاکە نیشانەی دو گولە گەنم وە لەلەمیکی ـ پی وە هەبو

ەو ئالایە ئەوروترا ئالای ئازادی ـ وە لەسەر دەستوری ئالای ئیرانیەکانا تەنها ڕۆژانی جمعە و ڕۆژانی جەژن هەڵ ئەکرا وە دروشمیکی وەها بەم ئالایەوە نەبو کە شاهدی ئەوە بی کە ئەو ئالایە تمثیلی هەمو کوردستان ئەکا.

دیسان سروشتی ڕەنگ و ئەندازەکەی بە قاعدەیکەوە بەند ئەکرابو کە مروڤ بتوانی مانا بو دروشم و ڕەنگەکانی دروست بکا. ئاخوا مەبەست لە سور و سەوز و سپی دا ـ چیە.

دروشمەکانی بنی اومیە و خلفای راشدین و محمد ـ چە پەی وەندیکی بە سەر دروشمی ئازادی کوردەوە هەیە. کە لە وینەی ئالای ئەوانی ئەگرد تەنیا بو اثباتی وینەی ئالاکە هەڵ بەستیکی بویژی مهاباد [هەژار] ناو هەبو کە بە زەوقی شاعرانەی خوی باسی شەرەفی ئالای کردبو.

لەوە پتر هیچ یاسا و قانونیک نەکەوتبو ناوەوە کە بزانری ئەو ئالایە چیە وە لەسەر چە ڕوداوو [کەتەلوکیک] ئەو ڕەنگانەی پی وە بەستراوە.

شەعرەکەی هەژار

داری ئالاکەم وەکو چەقلیکە بو چاوی عدو
هەر دڵی خوشی ئەوی ڕەبی وەبەر خەنجەر کەوی
داری ئلامان برا سیدارەیە بو دوژمنان
هەر لە ئاسو سەرکەوی پی ویستە کەس ژینی ئەوی
پارچەکەی ۳سی ڕەنگی خوی ئەنوینی ڕەنگی سور ئەڵی
تا تنوکی خوینی کورد مابی قەدی من ئانەوی
یا ئەڵی تا لشکری سور بەر قەرار و زیندوە
قەومی کورد رزگارە هرگیز بەختی کوردان ناخەوی
دو گوڵی کەنمی ئەڵی ئاگا و لە ڕزقی خۆ و هەبی
خۆت کە برسی بۆ چی دوژمنی پێ بژین لێرە و لەوی
پیو دەڵی نوکی قەڵەم گەر ژینی خوشی و پی ئەوی
غیری من دەست ناکەوی بو ڕوی ترەقی و پیشرەوی
ڕەنگی سەوزن یعنی دایکی نیشتمان لەم ڕوکەوە

جوانو سەر سەوزە وە گیری کەوتوە عمری نەوی
سپیەکەی مزدەی بیانی بەختی کوردی کرد بەیان
روژی بەختی کورد پەیدا بو نەما پەردەی شەوی
یا نەڵی لیم سورە دیکرات لە عالم سەرکەوت
مستبد و مرتجع کەوتونە گیژی گیژەوی

هەتا ۱۳۲۵/۹/۲۵ کە ریکەوتی ۱۹٤٦/۱۲/۱٦ ئەکات ئەو آلایە لە هەمو ناوچەی کوردستان ئەلاژایەوە
لەگەل ئەوەشا ئەم ئالایە نرخیکی زور بەرزی هەبو. هەرگا ئالا بو پاسگا وە یا ناوچەیکی حزبی و جیگایکی بنکە و سەربازی ببرایە لە سابلاغەوە نومایندەی قشون بە تاقمی موزیقەوە لەگەڵ ئالاکە دا ئەرویشتن. هەتا لەگەیشتنە ئەو شوینەی کە بوی ئەچون لە لاین عشایر وە دیهاتەکانی سەر ریگا گاو و گەردونیان بو ئالاکە ئەکرد.
ئاغوات وە گەورە گەورەکانی ئەو ناوچەیە لەو شوینە کو ئەبونەوە کە ئالای بو لەچو.
دەست ئەکرا بە تەقەی تفنگ و خطبە و ووتار و شیعر خوندنەوە وە شایو پەلی بەلک و زورناو دهوڵ. ئەو وینە شادمانیە گیانیکی تازە بە تازەی پر هەسر شعوری سەر بە خویو ئازادی ئەخستە ناو لەشی مروڤەوە.
هەتا لە روژی ۲۹ کانون الثانی ۹٤٦ (۹ بهمن ۱۳۲۵) ئالای حزبی. لەدی بوکانەوە برا بو دی [ یەک شەوە ]
من شخصا اشتراکی ئەو ئالا بردنەم کرد. روژەکەی زور سارد بو بەفریکی هەواو روی زەوی داپوشی بو. منیش پالتو. قاپوتم لەبەرا ئەبو زورم سەرما بو.
بەلام بو خطبە خویندنەوە ناچاریان کردم کە بچم ئالایان لەگەلا بەرم. سوارەکان ۷۰ سوار بون کە هەموبان لە عشیرەتی فیض الله بگی و دیبکری بە بانەی پیک هاتبون. لەوی تورگومان گندیەوە چوین بو بوکان.
لەگەل ئاغایانی سلیم آغای ایلخانی زادە و ئەفسر هاشمی ـ دامان گوتایە

خطبه خویندنه‌وه‌ی ئالا له ناو نیروی به‌فرا.

وه به دهوڵه زورنایکی زور دڵ گیر. ئالاکه‌مان له حزبی بوکان هینا ده‌ره‌وه به‌ره‌و یه‌ک شه‌وه ـ که‌وتینه ری.

شه‌وی ۱۹٤٦/۱/۳۰ له‌دی [ آلیلاغ] ئالامان هیشتوه. و آغایانی عزیز خان و محمد خان و علی خانی دادخواه له لاین ئاغایانی ئه‌و دی یه وه زۆر به‌خشنده‌یی له ژیر قدومی ئالاکه‌دا کرا. وه زور به هونه‌رمندانه ئه‌رکی په‌زیرایی ئه‌و ۷۰۰ سواره‌یان به شانازی ئالاوه گرته مل خۆیان.

وه له‌وه خوشتر ئه‌وه بو که ـ محمد خانی دادخواه ئاغای دی [ آلیلاغ] شایی ژن هینانه‌که‌ی له‌گه‌ل شایی آلا تیکل کردبو. شایی بوکو شایی ئالا به یه‌که‌وه ئالقه‌ی دایه‌وه وه به سه‌تها کچ و ژنو کور و پیاوانو لاوانو گه‌نجان دست یان خستو ناو دستی یکتر. وه به خوێن گه‌رمی و گزشه‌ی دڵداری هه‌مو لایک وه کو یه‌ک مه‌ست وه سه‌رشیواو بوبون

وه به زورنا و ده‌هوڵه‌وه له‌لاین چه‌ند گوینده‌یک ئه‌و گورانیه‌یان ئه‌وت.

بای ده‌دا بای ده‌دا کیل کیله‌که‌ی با ده‌دا نیستا نه‌بوه به خانم چون تیلامم لی ده‌دا

جا له‌سه‌ر راویژ و لهجه‌ی کوردی ئیران بو ئه‌و دڵ دوراوانی ناو شایی ئه‌م گورانیه‌یان ئه‌ووت.

ئاغای حمه رشید خانیش ـ له تالاری شیانویه‌که. له‌گه‌ڵ احمد خانی فاروقی ـ و حمه امین خانی قادرخان زاده ـ وورد وورد سه‌یری به‌زمو شایی ئالا و بوکیان ئه‌کرد. به‌لام ریزی ئاوبانگ لی قه‌ده‌غه کردبون که ئه‌وانیش وه‌ک جحیڵه‌کان باڵ بگرن وه خۆیان بخه‌نه ناو شایکه‌وه.

و آغای حمه رشید خان ـ له ژیر پی ئالاکه‌دا سویندی خوارد که هه‌تا دوا تنوکی خوینی به‌ریه‌ره‌کانی له‌گه‌ل ئه‌و گه‌لانه بکات که بو داگرتنی ئه‌و ئالا خه‌ریک ئه‌بن.

وه له‌لاین اسماعیل خانی فرخی وه ـ ئه‌و خطبه‌یه ئیره‌رایه سابلاغ

روژنامەی کوردستان ژمارە [١٦] دا چاپ کرا.

تەرزی چاپ خانەی کوردستان

پیش ئەوەی کە روداوی دیمکرات لە ئیرانا ئاشکرا ببی. لەلاین چەند خویندەواریکی سابلاغ بەوە. بەناوی [نیشتمان ـ گوڤاریک یان دەر ئەهینا. وە پەرگەکەی بە دروشمی [صلاح الدین ایوبی ـ وە رازاندرا بووە.

ئەو گوڤارە مانگی جاریک دەر ئەچو. لە سابلاغ مقالەکانی ریک ئەخراوە لە تەوریز بە دزی وە چاپ ئەکرا.

بەلام لەو دوایەدا چاپیکی بچکولانەیان بە هوی زەبیحی ـ هیمن ـ هەژار ـ قزلجی ـ پیا کردبو ئەو گوڤارەیان پی دەر ئەهینا. هەتا زەبیحی و هیمن لەسەر ئەو گوڤارە ٦ مانگ لە تاران بەندی کران. بەلام لە دواییدا روسەکان چاپیکی گەورەیان بە قازی محمد بەخشی. وە ئەو چاپە بە کارەبا ئیشی ئەکرد. هەتا دواروژی دەولەتی قازی محمد ئەو چاپە ئیشی پی ئەکرا. وە لە گیرانی سابلاغا ئەو چاپەش کەوتە دەست دەولەتی ئیران.

دەولەتی ئیران لە وەختی خویا سکالای ئەو چاپەیان بە سفارەتی روس راگەیاند.

ئوماز علی ئوف ـ کە یکیک بو لە روسە سیاسیەکان و لە بەسەرهاتی کوردا ئیشی ئەکرد بە ئومایندەیکی سیاسی لە میاندوأو دا ئەنیشت.

بو لابردنی تهمەتی ئەو چاپە. لە کوبونەویکی گشتیدا لە قازی محمدی ـ پرسی نایا ئەو چاپەت لە کوی چنگ کەوتوە. قازی محمد ـ لە وەلاما ووتی لەو چاپە چاپیکی تجاریە وە لە تەوریز کریومە. ئەگەر باوەر ناکەن بچن لە تەوریز لە فلان توجار پرسیار بکەن.

ئەمجا ئوماز علی ئوف ـ چەپلەی بو قازی محمد لیدا وە زور سپاسی کرد وە ئەو پرسیار و دەلامەی ئوماز علی ئوفو قازی محمد. لە روژنامەی ٦ ـ ٧ کوردستان بەچاپ گەیشت.

قازی محمد بەناوی کوردستانەوە روژنامەیکی لە سابلاغ دەر ئەهینا

ژمارەی ئەو رۆژنامەیە گەیشتە ١١٢. حکومەت خوی سەرپەرشتی لەو رۆژنامەیەی نەکرد. هێنتی ئەنجومەنی ئەیالتی خویان مسئولی دەرهێنانی لەو رۆژنامەیە بون.

مدیری رۆژنامەکە ـ ناوی سید محمدی حمیدی ـ بو تا ئەندازەیکی باش شارەزای مێژو و نوسینی کوردی بو.

ئەو رۆژنامەیە رۆژانەی بو بەلام زورجار بە حەفتەی جاریک دەرئەچو، مقالاتی ئەو رۆژنامەیە لە لاین هێنتی ئیدارەی سیاسیەوە زۆر بە وردی [سانسور] ئەکرا. هەر شتی کە موافقی سیاسەتی روس نەبوایە نەئەبو چاپ بکری.

زیاتر ئەو رۆژنامە خەریکی مدحی روس و شکانی ئەمریکا و انکلیس و ئاغاو دەولەمەند و کۆنەپەرست بو ـ

نوسەرکانیان پتر مەلای وشکە صوفی متعقلی دینی بون. زیاتر نوسینەکانیان لەسەر ئەو پیتانە ئەبراوە ـ امپریالیزم ـ اقطاعی رەجعی ـ انگلیس و ئەمریکا مستبدن ـ خائن ئەبی بکوژری. بژی ئاستالین ـ بژی ئوردوی سور.

پی نوس و زانایو زمان ـ لەناو ئەو حکومەتەدا ئازاد نەبو. ژیانی ئەویش وەکو ژیانی ئیرە وابو. ئەبو [خوری خوت بە تەشی ] خەلکی بریسی.

خوێندەوار نەی ئەتوانی بە تەواوی مەبەستی ئازادی خوایەتی خوی دەر ببری. لەویش هەر ئەبو لە ژیر پەردەی درو و ریایی دا شت بلاو بکەیەوە لە غیری رۆژنامەی کوردستان گوڤاری ئالەکوک ـ هەلالە ـ ش هەبون مانگی جاریک دەر ئەچون.

وزارەتی قازی محمد

تشکیلاتی وزارەتی قازی محمد لە سەر شێوەیکی وەختی و ئازمودەی هێز و نفوزی بو. نەک قابلیەتی سیاسەت و خوێندەواری. هەر وەکو هێندیک لە وەزیرەکانی قازی محمد هەلیان ئەنەگرت کە ناوی وەزیریان لی بنرایە، هەروەهاش هەتا دوایی وزارەتەکەیان ئیشیکیش یان ـ پی ئەسپیرەرا بو کە بە

ئەنجامی بگەیەن.

قازی محمد لەبەر دروشمی سیاسی و مەدەنی ئەقەی خستبو سەر ئەو چەند کەسانە کە بە ناوی کابینەی وەزارەتی کوردستان ناوزەد کرابون.

هێشتی ئەنجومەنی ئەیالەتی ـ بەسەر هەمو ئیشیکا هەڵ ئەوەستا وە ئەو وەزیرانەش لەو لیژنەیەدا ئەندام بون. قازی محمد و حمە حسێن خان سیف لەو حکومەتەدا ڕیز و جیگایان زۆر بەرز بو وە تیکۆشانیکی زوریان لەخەرج دابو.

**وەزارتی جەنگ**

بە هوی ئەوەی کە چەند ئەفسەریکی عیراقی بە فراری چوبونە ناو تشکیلاتی سەربازی کوردستانی مهاباد.

ڕیز و ڕیکوپێکی دایرەی عسکریان زۆر لە دایرەکانی تر پێش کەوتوتر بو.

لە وزارەتی جەنگا ٤ یارمەتی دەر معاونی وەزیری جەنگ بو وەزیری جەنگ دروست کرابو. صلاح الدین کاظم توف ڕوس یان بە ناوی کاک اغاوە کرد بو بە مشیری دیوانی حەرب.

٢- نانەوازادە بە معاونی سیاسی هیز

٣- جعفری کریمی معاونی سیاسی

٤- جعفري ئیلخانی زادە بە معاونی مالیەی جەنگ.

و غیری ئەو هێنتش لقیکی تر لە وەزارەتی جەنگ جیا کرابووە ناویان لی نابو بولی ٣ ناوەندی ئەو دایرە لە هەمو وینە سزا و فەرمانی چاک و خەراپی لشکر مسئول بو.

ابراهیم صلاح ـ کە پی یان ئەووت برایم خانی [ [ ساروقامیشە بە دەرەجەی مایۆری ئەو دایرەیەی سەرپەرشت ئەکرد ئەو برایم خانە ــ بە بی خویندنی مکتب زمانی روسی انکلیسی، فرانسوی ـ ئەلمانی تورکی عرەبی فارسی کوردی فیر بوبو. بە هەمو ترکیب و قاعدەیک یەوە.

بەلام ئەو فەرماندەیە زور زو لە وظیفەکەی دەر کرا بە تاوانی ئەوەی کە گوایا فرماندیکی تورەیە.

له جیگای ئەو مصطفی خوشناو [ به روتبەی پات پولکونیکی کرا به فرماندەی پولی ۳ ناوەندی هەتا تیک چونی دەولەتی کوردستان.

تشکیلاتی جبهه و قطعات

ناوچەی عسکریان دابەش کردبو به ۳ قول. بەناوچەی میاندواو ـ سایینقلا ـ تیکان ـ محمود جغ ـ یان نەووت پولی (۱) که مەرکەزەکەی میاندواو بو.

بوکان سقز بانه سنه و صاحب ـ هەتا مەرزی [دیواندەرە پی نەووترا پولی [۲] که مەرکەزەکەی [سەرا ـ بو] سەردەشت سابلاغ نغده سندوس ماکو، مربوتی پولی (۳) ناوەندی بو که مەرکەزەکەی سابلاغ بو له ناوچەی مهابادا ئونەی چوار لشکر دامەزرا بو[؟]

وه سەرلشکرەکانیان به روتبەی جنرال مایوری کرابون به مسئولی ادارەی لشکرەکان

۱- جنرال مایور حمه حسین خانی سیف

۲- " " عمر خانی شکاک

۳- ملا مصطفی بارزانی

٤- حمه رشید خانی بانەیی ـ دانیشتوی داروخانی عراق.

بو هەر چوار لشکر تا ئەندازەیک ریزی سەربازی پێک هینرا بو.

۱- حمه حسین خانی سیف ـ به علاوەی وظیفەی وەزیر جەنگیەتی فرماندەی لکی ۱ و ۲ بو که مەرکزەکەی سابلاغ بو.

۲ عمر خانی شکاک ـ فەرماندەی لشکری شکاک و جلالی و عشایری ناوچەی ماکو بو ـ

۳- ملا مصطفی فەرماندەی هیزی بارزنی وه ئەو ئەفەراتە فراریانە بو که له عراقەوە چوبون بو ناو مهاباد.

٤- حمه رشید خان ـ فەرماندەی هیزی بوکان و ناوچەی سقز که بارەگای لشکرەکەی [سەراو سەرچاوە] بو لشکرەکەی بریەتی بو له بانەی . فیض الله بگی. هەندی عشائری جافو سەرشیوی.

بەلام لە عینی کاتا. حمە رشید خان فەرماندەی مسئولی گشتی بو. وە ئەو بە قاندی گشتی تەماشا نەکرا. لە قیادەی لشکری حمە رشید خانا چوار معاون. یارمەتی دەری بو تعین کرابو.

١- مەنگوری بە رئیسی ستادی لشکر تعین کرا بو

٢- احمد خانی فاروقی بە معاونی جەنگی نیشان درابو

٣- معاونی سیاسی و مالی جاری هەر لە عهدەی خویا مابووە لەبەر ئەوا نەکرانی لشکرەکەی و بی جگە لەم چوار یارمەتی دەرانەش. تشکیلاتی هێنیکی ئەرکانی جەنگ یان بو قیادە کردبو. کە بریەتی بون لە چوار ئەندام.

١- میر حاج پات پولکونیک فەرماندی لکی [٢]

٢- پات پولکونیک فرماندەی لکی ٤ بکر کریم حویزی.

٣- پات پولکونیک فەرماندەی لکی [١] مصطفی خوشناو

٤- مایور نوری احمد طه فەرماندەی لکی (٣)

٥- وە رئیس حزبی یەک شەوە لکی (٥) علی بگی شیرزادی کە بە ئەندامی ئیحتیات بو ئەو فەرمانە دیاری کرابو. لەبەر ئەوەی کە ئەو تشکیلاتی سەربازیە بە تەواوی پەرەی نەساندبو هەر وا بە جلی عشائریەوە پێش مەرگە و دەرەجەدارەکان فەرمان یان ئەدی. بەلام جنرالەکان لگل هەندی لە ئەفسەرەکانی عراقی و ساپلاغی جلی رەسمی عسکریان دروست کردبو.

لباسی عسکری لەبەر کردن پەی وەندی بە دەست رویشتن خاوەن دەرەجەکەوە هەبو. ئەوەی کە دەرەجەدار بوایە هیچ بی نظامیکی تیا نەبو کە جلی [نیفورم] بپوشی بو دروست کردنی لشکریکی ریک و پێک چەند جار قاری محمد داوای لە حمە رشید خان کرد. کە ناوی دەرەجەداران و ئەفسەران بدا بە مهاباد بو ئەوەی کە فەرمانی هەل گرتنی دەرەجەیان بو رون بکاتەوە. بەلام حمە رشید خان لە وەلاما ئەی ووت هەتا سقز نەگرم نامەوی دەرەجات ئاشکرا بکری. وە لەسەر هەوا نەخشە ناکیشم.

حمە رشید خان لەو باوەروا بو کە لە پێش گیرانی سقز و بانە و سەردەشت دەرەجات بلا کردنەوە لە عیبداری زیاتر هیچ سودیک تامین ناکات

وه به دەرەجه بلاو کردنەوەش سیاسەتی لشکرکەی پێ تێک ئەچو وه نازاوەیک ئەکەوتە ناو خەلکەوە. لشکرەکەی حمه رشیدخان هەموی له ئاغوات وه خانو بەگ پیک هاتبو. هەمویان چاویان له درەجاتی گەورە بو وه دەرەجاتی گەورەش له لشکریکا هەر ٤ سەرهەنگ و ٤ نایب سەرهەنگ و ٤ مایور و ٤ معاون جنرالی تی ئەکەوت و ١٥٠ نفریکیش به دەرەجاتی ١و ٢و ٣ ئەستیرەی دەرەجاتیان وەر ئەگرت.

بەم نسبەتەش تقریبا ٢٠٠ نەفریک له ئاغایانی دەستەی حمه رشید خان به بی منسەب ئەمانەوە. که له عین وەختا نزیکەی ١٠٠ آغا خۆی بۆ سەرهەنگی و پولکونیکی و مایوری هەڵ گرتبو

ئەگەر له پیش گرتنی سقزا دەرەجات دیاری کرابایە نیوەی لشکرەکەی به توراوی جبهەیان چوڵ ئەکرد و ئەگەرانەوە. بۆ چی وه له سەرچی؟

لەسەر دەرەجه بەر ئەکەوتن. لەسەر رەنج دانی بی سەمەر.

حمه رشید خان. ئەی ئەویست خوشی جلی رەسمی لەبەر بکات هەتا سقز ئەگیریت. بەلام هەندی تنقیدات و رەخنەی بی جی بو بو به هوی ئەوەی که له پیش لەشکرەکەیا جلی رەسمی عسکری لەبەر بکات.

جا لەبەر ئەو دورنەندیشی و لیک دانەوەیە. هەتا تێک چونی کومەڵە. له سقز گیرا وه نه لشکر و درەجەداریش دیاری کران.

### ویلی لشکری شکاک

هیزی شکاک زور بی نیظام و ریز بون. خویندەواریان تیا نەبو هەر لەسەر رەووشتی عشایری و راوو روت ئەیانەویست بجولینەوە.

ناوبانگی لشکری دیکرات و مدەنیەتیان سوک کردبو. ئەو خوراکەی که قازی محمد ـ بوی دانابون ئەیان فروشت وه خویان به خەلکی ئەو دیهاتانه بەخیو ئەکرد که لشکر بەزیان تیا گرتبو.

زور کەسیان وەلاخی یەدەگ لگل خویانا هینابو جەبهه بوچی. بو تالان لی بار کردن له کاتی گرتنی شاریک. لایان وابو هەر زەمانی سمایل آغای

سمکویه که تالانو ڕاوو ڕوت لی نەپرسیتەوە.ئاژاوەیکی زەر ناشیرین یان لەو ناوەیە نابووە. بە هیوای دەرەجە و مەنسەب لەوپەری وەلاتەوە هاتبونە ناو لشکری دیکرات . لشکری شکاک تەخمین ئەکرا بە ۲ هەزار سوار. چەند لەفسەریک یان بە دەرەجەی سەرهەنگ و سەرگورد نیاشان کرابون.

لە کاتیکا کە حمە رشید خان داوا کرا بو بو سابلاغ فەرماندەی گشتی سقز بە وەکالەت بەسەرشانی منەوە بو.

ژنیک خەلکی [نایچی] لای سقز هاتە سەرا ووتی ئەو سوارە شکاکە ـ مایینیکی لی ساندوین ئەوا لەگەل خویا ئەی باتەوە بو وەلاتی خویان بوم وەربگرەوە چونکە هەتیو بار و فەقیرم.

منیش زور بە سادەیو ئاسانی بە عبداللە ناوی ئاموزام ووت لگل ئەو ژنە پیرو مایینەکەی بو لەو پیشمرگە شکاکە وەربگرەوە وە بیدەرەوە با بڕوا.

هە رکە داوای پیرە مایینەکە لە کابرای شکاک ئەکاتەوە کابرای شکاک لی راستر چەپ ئەبی کە عبدالله ناو بکوژی هەتا نیشەکەمان وەکو خوی لی کردەوە زوری پی وە ماندو بوین مایینەکەش هەر لای کابرای شکاک مایەوە.

کە حمە رشید خان هاتەوە ئەو باسەیان بو گیرابووە. زور تورە بوبو کە وا داوای حەقی پیرەژنەمان لە کابرای شکاک کردوە ووتبوی من دلی ۳ هەزار نەفری شکاک بە دلی پیریژنەیک نادەم. ئەو قانونی دادگریە جاری بە مەنگوری ـ تطبیق ناکری.

لەشکری بانەی

لشکری بانەی فیض الله بگی سەرشیوی گەورکی ـ دولی میرەدی کە وەسەی حمە رشید خان بون. ئەوانیش وەکو لشکری شکاک بی انتظام بون بەلام ئەوان وەکو لشکری شکاک دزیان نەئەکرد. تا ئەندازەیکیش گیانی لەاعەت یان تیا هاتبون. ـ حمە رشید خان ـ چەند گەنجیکی کردبو بە سەرپەل و سەرلق و ئامیر هیز. کە ئەوانە تا ئەندازەیک سلیقەی خویندەواریو فەرمان بەریوە بردنیان هەبو هەست یان بە مسئولیەتو شەرمەزاری ئەکرد. بەلام لە

مەرکزی سەرا لە قیادەی فەرمان بەرایەتیدا ڕەسمیات وە دەفتەرداریو شێوەی نوسین و مخابراتیان زۆر تەواو بو بەهوی ڕیکوپیکی دەفتەرداریو مخابرا یانەوە کەم ئیش بە غەلەت نەکرا کە لی نەپرسرێتەوە.

## لشکری بارزانی

تشکیلاتی لشکری بارزانی زور پیشکەوتو بو. چونکە ئەفسەرەکانیان لەو ئەفسـرانە پیک هاتبو کە لە لشکری عراقا وەرزشی ئاداب وە ڕەووشتی سەربازیان وەرگرتبو وە بە هوی ئەو ئەفسەرانە زور ئیشی ڕیکوپیک لەناو لشکری بارزانیدا بە ئەنجام ئەگەیشت وە لە زور کاتا تعلیمی سەربازیان بە هیزی بارزانی ئەکرد. ئەو ئەفسەرانەش بریەتی بون لە ئاغایانی

١- میر حاج ٢- مصطفی خوشناو ٣- بکر حویزی ٤- عزەت عزیز ٥- محمد محمود ٦- خیرالله ٧- عبدالرحمن مفتی ٨- حمە صالح زاژەلەی ٩- جلالی امین بەگ ١٠- شەوکەت عزیز ـ وە زۆر نائب ضابط و عریف و نائب عریف و باشچاوەشی تریشی تیا بون.

لشکری بارزانی کرابو بە چوار لک کە تمثیلی چوار فەوجی ئەکرد. هەر لکەی لە ٢٥٠ نەفەریک پیک هاتبو. هەندی جار ئەگەیشتنە ٣٠٠ نەفەر

فرماندەی لکی (١) مصطفی خوشناو بو.
" " (٢) میر حاج
" " (٣) نوری احمد طه
" " (٤) بکر آغای حویزی

لە هەمو لکیکا تەرز و شیوەی سەربازی بە تەواوی پیک هاتبو. بە پی پی ویست [گروبان و سەرجوخە ـ لە لشکری بارزانیدا دیاری کرابو لەو دوایەدا لشکری بارزانی بە تەواوی جلی سەربازیان لەبەر کردبو دوکتور و دەرماناتو و خواردنیان زۆر باش بو.

ئەفسر و ئەفەرەکانی لشکری بارزانی زۆر شەڕ کەر وە شارەزای پی لائو ئەخشەی جەنگ بون.

له غیرەز ئەفسەرەکانی عراقی ئەفسەری تریشیان لە هۆزی بارزانی دروست کردبو و جلی ئەفسەریان لەبەر کردبو کە لە کاتی خۆیا باسیان ئەکەین.
ئەفەراتی بارزانی زور هیمن و قانع بون بە ئازار و جەفای برسیایەتی وەکو ئەفەراتی لشکرەکانی کە نە ئەکەوتنە شین و شیواویەوە بارزانیەکان زور حەزیان بە تیکلاوی غیری خەلکی خویان نەئەکرد. گیانیکی ئارام و ئەترسی ئەوپان تیا موجود بو. ئەگەر کردەوەی هەندی زابطەکانیان نەبوایە. هەتا دوایی مللەتی بارزان هەر بە خوشەویست تەماشا ئەکران لەناو مللەتی ئیرانا.
بەرام بەر بە ملا مصطفی ئەو عشیرەتە ـ روحیکی عبادەت وە پەرستن یان تیا هەبو. ئەوەکو بەناوی ئاغا و کرمانجی ملا مصطفی یان خۆش ویستبی.
ڕوحا حەزیان لە بنەماڵی شیخانی بارزان ئەکرد. وە ئەو باوەڕ و ا[illegible]ە یان هەر لە کۆنەوە بە میرات بۆ بەجی مابو.
ڕەنجانی شیخانی بارزان لە ئەفرادی ئەو عشیرەتە شتیک بو کە هەر لە بیر نەچوبایەوە. وە بو خۆشەویستن و ڕەزامندیش یان هەر وابو جا بە هوی یەک بیر و باوەڕی و یەک ڕوحی مللەتی بارزان ئیشی ملا مصطفی لە هەمو لایەکەوە پیشکەوتو تر بو لە ئیشی فەرماندەکانی تر.
لەوانە بو ئەفەریکی بارزانی ڕوژی بە دو نانی ووشک ڕای بواردبایە بەلام ئەفەریکی عشائرەکانی تر ئەبو چیشتی برنجی صدری بو لی بنری بە مەرجی کە گوشتی مەریشکیشی بە سەرەوە بوبایە.

## لشکری مهاباد

پیش مەرگەی مهابادیش بە نسبەت لشکری شکاک و بانەی متمدن تر بون. ڕەووشتی سەربازیان ئەزانی. چونکە گەنجەکانیان هەمویان لە لشکری ئیرانا چوبونە ناو کوڕی سەربازیەوە.
بەلام لشکری سابلاغی بە قەت شکاکو بانەی ئازا نەبون. چونکە ئەفەرات و ئەفسەرەکانی سابلاغی هەمویان لە سایە پەروەردە وە خەلکی ناو شار و ناز ئالودەی بون. زیاتر ئەفەراتەکانیان حەزیان لە خۆ جوان کردن و پاکو خاوینی

ئەکرد. بە کەڵکی ئەوە ئەئەشیان کە لە شارەکان دور بخرێنەوە بخرێنە پاو چڵکو موریانی جەبهە و ئوردوگا.

ئەفسەر و نەفەراتەکانیان بە زۆری خوێندەوار بون زوربەیان کەلاسی ٩ سەرەتایی و ١ و ٢ و ٣ متوسطەیان تەواو کردبو. چونکە لە سابڵاغ هەر هەتا کلاسی ٣ متوسطە نارەنجی خوێندن هەبو.

چەکو خواردنو جلو بەرگ وە خەرجیان لە لشکرەکانی تر باشتر بو. لەو لشکرانەدا تەنیا هەر پیشمرگەی سابلاغی موچەی ئەدرایی. لشکری سابڵاغ بە ١٠٠٠کەس تخمین ئەکرا.

لشکری سابڵاغ لە ناوچەی سەردەشت چوبونە ناو پیشمرگەی شەرکەرەوە حمە حسین خانی سیف خۆی مسئولی سەرپەرشتی لشکری سابڵاغ بو. بەلام زیروی بهادری هەرکی ـ لە جیاتی حمە حسین خان تەماشای نیدارە و سەرپەرشتی لشکری سابلاغی ئەکرد لە ناوچەی سەردەشتا بەڕوتبەی سەرهەنگی.

دەرەجاتی سابلاغی لەسەر حساب و پی ویست نەبو. بە پی ئارەزوی خۆیان دەرەجات یان هەڵ ئەگرت. لەو چوار لەشکرەدا تەنها بارزانی و سابلاغی جلی سەربازیان لەبەر کردبو. لشکرەکانی تر هەر بە جلی شارستانی و عشائرەیەوە وەظیفەیان بە تەنجام ئەدا.

قازی محمد و عشائرەکان باوەڕیان بە یەکتر نەئەکرد.

لە کاتی شەڕدا فیشک ئەدرا بەو کسانەی کە تفنگی برنەویان پی بوایە نەفەراتی چکداری ٣ تیر سالدات انکریزی ـ فیشک یان چنگ نەئەکەوت چونکە فیشەکی ئەو وینە تفنگانەیان نەبو.

لەبەر ئەوەی کە قازی محمد زۆر بە عەشائرەکان دڵ خۆش نەبو چەکەکانی بو نەئەگوڕینەوە بە برنەو.

قازی محمد ئەگەر بوی بکرایە بە زوترین کات ئاغواتەکانی لەناو ئەبردن. جا ئەو بی باوەڕ و [دودڵنگیە] بوبو بە هوی ئەوەی کە عشائرەکان سەر لە

فەرمانی قازی محمد بیچ نەوە وە بو نەمانی تی بکۆشن.

لە زور رووداو و مـتینگا قازی محمد نەی ووت هەتا نیـستا بەسـەر چوار شـتا سەر کەوتوم.

١- هەڵ کردنی ئالای ئازادی کوردستان

٢- بی هیز کردنی ئاغایەکان.

٣- دامەزراندنی دایرەی فەرهەنگ

٤- کرینی چاپ

جا بەم هویەوە ئاغواتی عشائرەکان هەست یان بە پاشەروژیکی خەراپی خویان کردبو. بە تەرزیکی نهینی دەرگای مخابرات یان لەگەل حکومەتی تیرانا کردبوزوە.

لەو باوەرەدا بوم. ئەگەر لە ترسی روس و مـلامصـطفی و حمـه رشـیدخان نەبوایە هەر زو ئاغـایەکان لـە قـازی مـحـمـد راتـەپەرین و قـازی مـحـمـد و لەجومەنی ئەیالەتیەکەیان لەناو ئەبرد. حاشایان لە هەزار کورد و کوردستان و لا‌دی ئـەکـرد. چونـکە بـو دەوری دەربەگـیـەتی و ئـاغـا یەتی جـاران یان زۆر پەشیمان بویونەوە.

کە کچی کرمانج بە پارە بفروشن و شیـربایی ژن ئەوان وەری بگرن. وە لـە هەمو شتیکا بر ابمش و شەریکە برا بن لەگەڵ کرمانجا. دار داری ئەوانو پشت پشتی کرمانج بی.

هەتا رادەی لێک هەڵ بەزینەوەی قازی محمد و ئاغایان گەیشتە ئاقاریک کە عـمرخانی شکاک ـ کە یەکیک بو لە سـەر لشکرەکان و کرابو بە پاریزەری ناوچەی سقز بەشی باشور جنوبیەوە لە ژیرەوە لەگەل حکومەتی ئیران کەوتە مخابرەوە ئەگەر [ ٧٠ هەزار تومانی بدەنی جبهەی جەنگ چوڵ بکات.

کاک الله آغای حسن اغای ـ [ قولقولە ] لە هەمان کـاتا. لە ژیرەوە دەرگای مخابراتی لگل حکومەتی سقزا کردبووە موجەی [ ٨٠ ] ئەمنیەی بە دروستی هەمو مانگیک وەر ئەگرت.

لە هەمان کاتا علی آغای اسعدی ـ رئیس عشیرەتی دیبکری و حاجی بایز

آغا و حاجی محمود آغای نیلخان زاده حکومەتی نیرانیان هان نەدا کە هیرش بەریتە سەر قازی محمد. کە لە وەختی خۆیا ئەو باسەتان بە دریزی نەخەینە بەرچاو.

مام عزیزی قرەنی اغای ـ رئیس عشیرەتی مامەش ـ عبدالله خانی رئیس عشیرەتی مەنگور ـ ملا خلیلی گورە مەر ـ محمد آغای عباسی ـ حاجی ابراهیم آغای گەورک. ئەو سەروک عشیرەتانە لە روی بی میالاتی قازی محمدەوە. هەموریان لەگەل حکومەتا کەوتنە ووروتو ویژ و بەلین و پەیمان بەسالی واداری بە مەنسەب و دەسەلاتی گەورەتر.

هەندیکیان هەلاتن چون بو تاران و هەندیکیش یان لە ژیرەوە بەرگی سیخوریان بو دەولەتی نیران لەبەر کردبو لە دژی قازی محمد.

هەندی دەست کاری ساباڵاغیەکان و پیلان هەل بەستراوی عشائرەکان بو بە هوی ئەوەی کە نیوانی قازی محمد و حمە رشید خانیش تیک بچی. حمە رشید خان ناچاری ئەوە بیبتەوە کە خوی فری بداتەوە باوشی پولیس و بەندیو دورخرانەوەی بو رمادیە و کرکوک.

بی سیاسەتی قازی محمد بو بە هوی تکینەوەی زوربەی عشائرەکان. قازی محمد چاوی لە ئازربایجانیەکان ئەکرد کە توانیان زور بە گورجی روحی نیقطاعی و دەرەبگیەتی لە ناوچەی خویانا نەهیلن وە یاسای تودە و شیوعیە تا ئەندازەیک بگەینە جی جا ئەو چاو لی کردنو دەرسەی ئازربایجان لە قازی محمد نەتەوەشایەوە. چونکە موقف و جیگا و ریگا و روژی سیاسەتی قازی محمد و ئازربایجان زور لیک دور بون. قازی محمد وەختی ئەوە هەنگاوی نەبو کە لە گەل عشائرەکان تیک بدا و یاسای شیوعی بخاتە بازاری کوردستانەوە.

ناوچەی ئازربایجان لەگەل ناوچەی کوردا نیوانیکی زوری هەبو ئازربایجانیەکان هەر ئەوەندەیان وەلات هەبو کە چنگیان کەوتبو وە بە تەمای هیچ وەلاتیکی تر نەبون کە داگیری بکەن.

بەلام دەوری قازی محمد زور قوناغی گەورە و منزلی دورتری مابو کە بیانی

بری. وەکو ئازادی عراق سوریا کوردی تورکیا نفوزی عشائرەکان لەو کاتەدا بو قازی محمد زور پی ویست بو چونکە بە پروپاغندە و هیوای نفوز بلاو کردنەوەی عشائرەکان زۆر هەنگاوی قازی محمد جی گیر ئەبو.

لەناو کوردستانا روحیەی عشائرەی زور زیندو وە بە تینە بو بۆ بڕینی هەندی مراحلی نیشتمان پەرستی.

کورد و ئازربایجان فەرقیکی زوری هەیە. ئازربایجانیەکان ناچار بون کە بە گورجی یاسای تودە سەر پی بکرن - بەلام کوردەکان جاری ئیشیان تەواو نەبوبو کە کالای شیوعیەتیان بخستایەتە بازاڕەوە. بە دو ملیون کوردی ئازادکراوی مهاباد [ ١٥ ] ملیون کوردی غیرە ئازاد کراو بترسینن.

جا لەبەر ئەوە نەتوانین بلێین کە قازی محمد نە ئەبو بەم پەلەپەلیە یقەی ئاغوات و خانو بگەکانی بگرتایە و ئیعلانی شەڕی لەگەلا بکردنایە. چونکە لەو کاتە عشایرەکان بە هیز بون پی ویستی بە کۆمەگی ئەوانە هەبو ڕزاشاه. مصطفی کمال - لە دەوری خویانا بە هەزاران ڕینە فرو فێل و هیز و ڕاپەڕین. نەیان توانی ڕوحی عشائری و ئاغایەتی لەناو بەرن. وە بە چەند پەیمانی فیلاوی وەکو پەیمانی سعدآباد و - کاخی سفید و گلستان - ویست یان گیانی عشائرەی بی هیز بکەن بویان نەکرا.

عشائرەکان زو ئەبن بە کومەگ وە زوش نەتورێن - بەلام کە زانایکی هونەرمەند هەبی ئەتوانی بە سلیقە و مێشکی عشائری لەگەلیانا بجولیتەوە ئا ئەندازەیکیش باری تەماعیان نیشان بدا. زۆر لەو سەربازانە باشتر شەڕ ئەکەن کە بە موچە و یاسای زۆر بە هێز پەروەردە کرابن.

عشائرەکان سافیلکە و خوش باوەڕن. ئەگەر لە ڕیگای ڕاستا لەگەل یان بڕوی زور بە ئاسان دێنە سەر ئەو بارەی کە کورد پی ویستی پی ئەبی.

عشائرەکان بە تەماعیکی کەم ئەتوانن لەو حکومەتە بدەن کە وا خاکی کوردی داوەتە بەر لەپ - چونکە ئیستقلالی کورد. یا ئەبی بە خوێن ڕیژی وە یا بە هێزی قەلەم و ئەحزاب گەریەوە تامین بکری.

خوین ڕیژی چەکو بارەیکی زۆری ئەوی کە ئەو مەبەستەی پی ببریتە سەر.

وە هێزی حزبی دیمکراتیش لەوکاتەدا ئەوەندەی تەوانا نەبو کە بە پێشمەرگەی حزبی لە دەولەتو عەشائرەکان بدات جا کە وابو ئەبوایە قازی محمد عشائرەکانی بە گران و هەرزان لە حکومەت هاندابا.

ڕێگایەکی وای نەهێشتبایەوە کە عەشائرەکان پیا ڕویشتبان بو لای حکومەت. چونکە لە ڕوژهەلاتی ناوەندیدا. عەشائرەکان دەستێکی بالایان هەیە لە چەکداری و شەڕکردنا. لە زۆر دەورا دەولەتانی عەرەب و فارس و تورک سودیان لە نفوزی عەشائرەکان کردوە بو سەر شوڕکردنی ئەو دەولەتەی کە ویستویانە شەڕی لەگەلا بکەن.

عەشائرەکان لە شەڕی ناوخویی وە شەڕی لایەلایی چەتەیدا زور لە سەرباز باشتر شەڕ ئەکەن.

ڕوت کردنەوەی عەشائرەکان لە چەک وە داماڵین یان لە ملک بۆ حزبێک ئەگونجی کە دەولەتێکی سەربەخو و دامەزراو بی وە لە هەمو باوێکەوە خاوەنی هێز و چەکو تەوانا بی. لە پڕ و پاگندەی دەرەوە پشت ئەستور بی. وە یا حزبێک ئەتوانی نفوزی ئاغوات و خانو بەگ نەهێڵی کە لەسەر هێڵێکی ڕاست و دیمکراتیەت مەودایکی زۆر بێ لە خەبات وە تی کوشانا بێ. هەمو فلاح وەرزیر و ڕەنج بەرەکانی ئەو عشیرەتە لەناو حزبو سیاسەتا ئاگا بو بێتەوە. بە تەماعی دابەش کردنی زەویو زاری ئاغا مللەتەکە هەستابێتە سەر پێ وە هێزی دەرەبەگ بی تین بوبێ.

بەلام قازی محمد ـ لە دەوریکا داوای نەهێشتنی آغاواتو دەرەبەگی نەکرد. کە هیچ تقریری مصیری ڕون نەکرابو. کەس نەی ئەزانی بەسەربەخویی ئەژی وە یا ئەخرێتە ژێر حکمی ئازرپایجان. دەولەتی ئیران ئیعتراف بەم کیانو ژیانەی ئەکات وە یا لی ئەدات. جا پێش ئەوەی کە قازی محمد ئەو قوناغانە ببڕی. لەسەر نارەزوی شیوعی و شیوعی پەرستەکان جاری لەگەل آغایەکان معرەکە و قرەی میراتی دابەستبو. لە زورترین کاتا ـ عشائرەکان جێگایکی مەترسی بوون بو دەولەتەکانی بیگانە. چونکە چەکی عەشائرەکان بە هەمیشەی بوتە کوسپەیک لەڕی پەلاماردانی دەولەتەکانی بێگانە.

دەوڵەتانی بێگانە مەترسیێکی گەورەیان لە چەکداری عشائرەکان کردوە چونکە ئەو هێزەی هەتا ئیستا لە دەولەتانی عرەبو تورکو فارسو روسیی دابی ـ هەر عشایر بووە. وە یا بە هیوای عشائرەکان ئەو حکومەتانە لە یەکتریاینداوە لە زۆر کاتا.

بەڵی نظامی سوسیالیستی ـ لە دژی چینە و تەبەقەی آغواتو دەرەبەگەتیە.

بەلام ئیمە کە کوردین جاری لەم کاتو ڕۆژەدا هیچ سودیک لەم تطور و ئاڵوگۆڕە ناکەین چونکە هەرچی کە بیکەین بیگانە سودی لی وەرئەگری نەک کورد.

کورد ئەبی تی کوشانی بو کورد بکات نەک بیگانە. کورد ئەبی شورش بو بەرزی کوردستان بکات نەک بەرزی وڵاتانی دەرەوە هەر مللەتیک کە دەست لەداتە چەک وە لە دژی حکومەتەکەی خۆی ڕائەوەستی. مانای ئەوەیە کە ئاسیریک وە دڵ شکاوی و ئارەزایەتی یاساڵێ زۆرداری ئەو حکومەتە ئەو مللەتە ناچار بوە کە بەرگی هەڵ گەرانەوە و شورشی لەبەر کردوە.

بۆ دەورێکی خۆشتر و ئاسایش تر هاتوتە میدانی شورش و خوێن ڕێژیەوە.

بەلام کە دی دەوری حکومەتی پیشوی لە دەوری ئەم حکومەتەی ئیستایەی دا خۆشتر و ئاسان تر و بەسودتر بووە. ناچار ئەبی بو بادانەوە بۆ لای ئەو حکومەتەی کە لی هەڵ گەڕاوەتەوە جا لە ئیرانا عشائرەکان و ئاغوات و خان و بگەکان ئەو مسرەحەیاندی. لەو شیانوی سینەماییەی مهابد بە تەواوی کەوتنە بەرچاوی وڵاتان.

جا لەبەر ئەوەی کە هیچ ڕێنە ئیحترام و ڕیزیک بۆ ئاغواتو خانەکان بەمابوو، لە دەوری قازی محمدا، ناچار بون کە با بدەنەوە بو لای حکومەت وە هەولی لەناو بردنی ئەو حکومەتە بدەن کە لە هەمو باریکەوە سەر و مالیانیان خستوتە مەترسی و نەمانەوە.

من لەگەل ئەو باوەڕە دانیم کە بلێم تەبەقەی ئاغواتو دەرەبەگ مانەوەیان شیکی باش بی. بەلام من ئەڵیم لە وەختیکی ئاوا ئاسکو تەسکا لاوانەوەیان

له توران یان پی ویست تره. چونکه نیشیان پێ تێک نەچی. لەو باوەرەدام ئەگەر قازی محمد توانی بای دڵی عشائرەکان رابگرتایە وە بە مستقلی داهاتو تەمادار و دڵ خوشی بکردبانایە. هیچ آغایک نەئەبو بە لاینگری حکومەتی ئیران چونکە جەفا و رەزالەتو سوکیکی زوریان لە ئیرانیەکان دی بو بەلام لە دەوری قازی محمدا - زۆرتر سوکی مەترسی یان چاو پی کەوت بەیە بە تیکرایی بایاندایەوە لای حکومەت. چونکە لە زەمانی حکومەتی ئیرانا هەر دەوڵەتو دارایەکەیان لە ژیر مەترسی دابو.

بەلام لە زەمانی قازی محمدا سەر و ماڵو ناموسیش یان کەوتبوە مەترسیەوە. بو غونەی مسال ئەو چەند روداوەی خوارەوەتان بە عرض ئەگەیەنم کە من خوم شخصیا رئیس حزبی جەوانان بوم لە ناوچەی سرا و ناوچەی سقزا.

حزبی جەوانان.

لە ژیر سەروکایەتی علی خسرەوی سابلاغی وە بە مستشاریەتی ئەسدئوف - ناوی ممثلی سیاسی روس. حزبیک لە ناوچەی مهابادا پیک هات بەناوی [حزبی جەوانان - گەنجان - ئەندام و مرشحینی ئەو حزبە هەموی ئەبوایە لەدەم روت وە گەنج پیک هاتبایە.

رابەرینەکەیان زور بەسام و مەترسینەر بو. ئەو حزبە لە حزبە خوین ریژەکانی ئەوروپایی نەکرد. هەر فەرمانیک یان کە پی سپیرابایە ئەبو بە بی گیروگرفت پیک یان هینابایە.

ئەفەراتی ئەو حزبە ئیمتیازیکی تای بە تیان هەبو لە هەمو رابەرین و لی کوشانیکا. ئیشەکانیان وەکو بروسکە وابو. نابیو ناکری لە بریارەکانیانا ئەهو.

نیشانەیکی زەرد و سوریان بەسەر سینگەوە دادروابو هەندی نیشانەیان لە مفرەق وە هندیکیش یان لە پەرو دروست کرابو. لە روژی ٣١/ تموزی ٩٤٦ عبد الرحمن ویس و سید بابانی حسینی - هاتنە مەرکەزی سرا تشکیلاتی حزبی جەوانیان لە سەرا کردەوە بەناوی حزبی جەوانانی [ سقز و سەرا وظیفەی سەروکی ئەو حزبەیان بەمن رەوا دی.

ئەو باسە لە روژنامەی کوردستان ژمارە [ ۷۰ ] دا بلاو کرایەوە بەلام لە گەرانەوەی حمە رشیدخان بو عیراق من ئەو وەزیفەی سەروکی حزبی جەوانانم دایە دەست محمد محمود ـ کە لە تەبەکەی محمد قدسی بو جا ئەو حزبە لەناو کوردی ئیرانا سامیکی زوری پەیدا کردبو

ئەگەر ئازربایجان لەو چەندانەدا تسلیم بە ئیران نەبوبایەوە هەرچی ئاغوات و خانوبەگی کوردەواری بون لەسەر دیهاتو شوینەکانیان دەر ئەکران.

بەلام بەختی ئاغا و زورداری دوبارە ئاغا و ئاغازنیان هینانەوە سەر حکم وە دار و فەراقەیان بو مسکین و کرمانجە هەلگراوەکانیان دانایەوە.

ئەو حزبە هیچ گوی نەئەدایە سوکی و بی تەزاکەتی بەرامبەر بە ئاغایەکان. آغایەکان لە هیچ کاتیکا خویان بە خاوەنی سەر و مالو ژن ئەئەزانی. بو دەوری ئیرانی و ئەمنیە ـ سوت خورەکان پەشیمان بوبونەوە.

وە لە پەنای ئەو حزبەشا حزبیکی شیوعی نهینی لە دی یاسی گەند ] لە ژیر سەروکایەتی عزیز خانی ئاغای یاسی گەند ] گرابوەوە کە پی یان ئەووت پالە پشتی حزبی جەوانان ـ بەلام وەکو حزبی جەوانان ئەو خوی ئاشکرا نەکردبو. هەر وا لە پەناوە دەستی ئەخستە ناو ئیشەکانی سوسیالیستی ـ دروست کردن.

سەربەخویو ئازادی بو چینەی دەرەبەگ و شوفینی ـ نەمابوە. هەتا مجیوری مزگەوتەکانیش بە هیوای بەشو میراتی ئاغا خویان خستبو ناو حزبی جەوانانەوە.

قازی محمد هەتا رەشو روتیکی لە چینەی کریکار و فلاح نەهینا ژیر فەرمانی حزبیەوە وە چەکداری لە لاین ئاغاکانەوە وەلی تەفرە ئەدرا وە پشتینەی بەریەرەکانیان لە زد نەبەست.

قازی محمد ئەوەی بەراوورد کردبو کە کورستان لە ۵۰ هەزار [ دی ] پترە. ئەگەر لە هەر دی یکا دو آغا و سە چوار کەسی سەر بە آغای لی بڕبجی دەستەی رەنجاو تورواوان ئەکاتە نیو ملیون کەس.

بی گومان پروپاغندەی نیو ملیون کەسی چەکدار و پارەدار معدەی باقی

دانیشتوانی کوردستان تێک نەدا. ئەگەر تیکیشی نەدانەو مەبەستە نەشێوێنی کە قازی محمد و دەستەی جەوانانی حزبی سوسیالیستی بەقونە خشکی بۆی نەچون.

چونکە دەوڵەمند و ئاغایەکان لە پێش ئەو ئینقلابەدا لایان وابو کە مبدەئی سوسیالیستی دەست کاری سەروەتو نفوز ئاکات خەڵکەکە بە گەورە و بچوکیەوە ئامادە بون بۆ ئیستقبالی ڕوس بەڵام لە دواییدا کە چاویان کرایەوە. تەماشایان کرد هەر آغاژنو کارەکەریکیان بەدەست برا فەلاحیکو برا تی کوشەریکی پیشەسازی وە جەوانیکە لەو جەوانانەی کە قازی محمد چەکی داونەتە دەست بو پاریزگاری کوردستانی مەزن وە کوردستانی هەمو کوردیک. لە پیش دروست کردنی کوردستان جاری پەلاماری ناموسی ئاغایان نەدا بەڵی مللەتان بە لەناو بردنی ئیقطاعیەت وە ڕجعی و دەرەبەگیەتی ـ پێشکەوتنی شورشی فرانسا لە سالی ١٧٨٩ و شورشی اکتوبری روس لە ١٩١٧ دا بەڵگەی ئەوەیە کە بە توانەوەی ئەو خانو بەگو ئاغواتانە ڕوسیا و هەندی وەلاتانی ڕوژهەلات پی گویشتون.

بەڵام ئەوەندەی هەیە ئەو ڕاپەرینە جاری بو کورد دەست نادا چونکە کورد لە مراحلی ژیانو کیانی ئیستقلالیتا هیچ قوناغیکی نەبڕیوە. کە جاری لە پێش هەمو شتیکا بەگژ آغاکانا بچێت. نفوز و مەبەستی سوسیالیستی لە وەلاتەکەیا بلاو بکاتەوە کە ئەو بهرە تەنها بو سودی شیوعیەت تەواو ئەبی نەک کوردیەت قازی محمد ـ بو خویو محمد حسین خان سیف و صدری قازی برای [ ١٢ ] دی یان لە ناوچەی مهابادا هەبو. قازی محمد ئەی زانی کە ژیانو یاسای دەرەبەگیەتی چۆنە وە چ دەنگیک لەم بەسەرهاتە دیتە ڕو. بەڵام وا دەر ئەکەوی کە پەلجەیکی ناچاری ئەو ئیشەی پی کردبی کە ناچار بوە بەسەر ئەم نەخشەی غەلەتەدا بڕوا. وە هەر ئەو پەلجەیەش بو کە داری نازادیەوە هەڵی ناوەسی دیسان ئەو یاسا و نظامەی حزبی جەوانان و حزبی شیوعی وە لەناو بردنی آغا و ئاغاژن لەم وەختەدا بو ڕوسیش هەر هەڵە بو ڕوسەکانیش نەبوایە باریکیان تعقیب بکردایە کە دوریایە لە قڕە و غەوغای ناوخویی. ئەو ڕاپەرینو

ئەما و ئاغاکنە دەرکردنەیان هەڵ گرتبا بو وەختیکی نارام تر و پی ویست تر بەلام روسەکان ئەو نیشەیان بو پەراوە دامەزراندبو. ئایا ئەگەر ئیرانیەکان بەڵینەکانیان نەبردە سەر تا چە ئەندازەیک نەتوانن بە یاسای شیوعیەت لە ئیرانا پەیرەوی بکەن. وە کوردەکان تا چە ئاقاریک حەز لە ژیانی سوسیالیست لەکەن وە ئەرون لەگەڵیا.

جا بو تەدارەکاتی ئەو روژە ئەو [مەتەڵەیان] لە قازی محمد دا هیناوە پەراوەکەیان بە قازی محمد کرد.

لە سەر راپوری حزبی جەوانان. [illegible]ور ئاغای گەورە لە سابلاغ زیندانی وە هانەنشین کرابون. لەوباوەرەدا بوم ئەگەر ئەو حکومەتە تا مەودایکی تر بەو لەرزە مابایەوە. ئەو ئاغایانە پان هەمو لە داری سیاسەتە ئەدان. بەلام بەختی ئاغوات لە بەختی کاکی فلاح بەهیزتر بو.

### دادگای کوردستانی قازی محمد

لەبەر ئەوەی کە روداوی ئازادی مهاباد بە تەواوی رون نەبوبوە لیژنەی وەزیران ئەی توانی بو هیچ وینە قانونیک داینێ.

تەنیا بە عرفو عادەت رەوشت و شەرع ـ محاکەماتی مدەنی حقوقی جزائی شەرعی ئەکرا ـ

حاجی بابە شیخ سەرەک وزارەتی کوردستانی قازی محمد ـ لە بابەت ژنو ژن خوازیەوە ـ وینە مەرسومیکی دانابو وە لە روژنامەی کوردستانیشا بلاو کرابوە

بەلام لەبەر ئەوەی کە ئەو دەستورەی حاجی بابە شیخ دای نابو. لەگەڵ عادەو عرفی ژنو ژن خوازی پیشوی ئەو ناوچە یەکتری نەئەگرتەوە دانیشتوانی ئەو ناوچەیە ئەو مەرسومەیان بلاوە شتیکی زور ستم و ناخوش بو چونکە دەستوراتەکەی حاجی بابە شیخ ریگای لە سەربەستی دڵداری چاو باشقاڵی و هەر لی کردن شایو رەوش بەڵک و ژن هەڵ گرتن بستبو. عادەتا جیگای رابواردن دڵداری نەمابو. گەنجی کردبو بە وشکە صوفی وە جیهانی دڵداری

لی شاردبونەوە. کە ئەم باسایەش هەرگیز بو مللەتی ئیران بەتای بەتی بو کوردەکان دەستی نەئەدا. بە پی نظامەکەی حاجی باباشیخ ـ ژن ڕەدوا کەوتن هەرگیز قەدەغە بو جا لەبەر ئەوەی کە ڕەدوا کەوتن و هەڵ گیران لە ناو عشائری ئیرانا شتێکی زور باو و دسادە و ئاسان بو.

ئەو باسە لەناو ژنو پیاوانا بوبو بە جیگای لاسایی و ڕەخنە. چونکە ڕەدوا کەوتن چە بو ژن وە چ بو کچ لەناو عشائری (منگور ـ سویسنی ـ زەرزە و مامەش ـ پیران ـ دیبکری ـ گەورک) ئیمتیازێکی شەرەفی هەبو.

ئەگەر ژنیک وە یا کچیک بە درێژایی ئەمەنی جاریک ڕەدوا نەکەوتایە لەناو ژنانا ئەو ژنە ڕێزیکی نەئەبو. پی یان ئەووت ئەگەر بە کەڵک هاتبای جحێلیک بۆ خۆی دەبردی.

دیسان بۆ پیاوانیش ئەو تانە و تەشەرە هەر هەبو. ئەگەر پیاوێک ژنی هەڵ نەگرتایە. پی یان ئەووت تو پیاو نی ئەگەر پیاو بای ژنیکت بۆ خۆ هەڵ دەگرت. جا دەستوورە تازەکەی حاجی بابەشیخ غەوغایەکی لەناو گەنجانا هینابو رو. چونکە ئەی ویست کتوپر ئەو عادەتە کونەی چەند هەزار سالەی کوردە لە ناو بەری کە کوردەکان لە بەختیاری میژویی دا تەنها دەست کەوتی دڵداری و علاقەی جنسی و آزاد پەرستی یان بو بەجی ماوە. کە لەم لەنەدا لە هەمو ئەوروپایک کون تر و پیشکەوتوترن.

هەر چەندە تاسیراتی مەلا (هەرمشەی مارو) دویشکی گور وە خوشی و کامەرانی بەهەشت) تا ئەندازەیک ساردی یەسەر ئەو (مبدء الحریە) سەربەستی ژیانە هیناوە. بەلام لەگەل ئەوە شا لە بارەی دڵداری و دەنگو بالۆزە) لە وەلاتە پیشکەوتوەکان بە جی نەماون.

بو دامەزراندنی ڕەگیزە ـ پایەی دڵداری و اثباتی سەربەستی جنسی لە کوردستانا ئەو نمونەیەتان پیشکەش ئەکەم کە لەم سەفری دیکراتی قازی محمدا ـ من خوم شخصا دیومە

لە کاتیکا کە حکومەتی قازی محمد تیک چو. لە هەمو لایکەوە حکومەتی ئیران دەستی دا بە خنکاندنی تاوان باران و فەرمان بەرانی ئەو

ئێشە. وە دەوڵەتی عیراقیش بە چاو لێ کەری ئێران. چەند زابتێکی عیراقیان هەڵکاندبون. و زور کەسیش یان لەو کەسانە بەندی کردبو کە ئیشتراکی شورشی قازی محەمەدیان کردبو. و منیش لەم وەختەدا چە لە عیراق وە چە لە ئێران بە تاوان بارێکی قورس ئەزانرام. زیاتر ئێرانیەکان ئەگەڕان بە دواما. لەو ترسە ژنو ماڵەکەم لە دێ [کندەسورەی] تیران لە بەشی گەورکی میرەدێ بەسەر حماآغای جەوان مەردی ئاغای ئەو دێ یەدا بە جێ هێشت. بە هیوای هەتا ئاسایش و ئارام ئەگەڕێتەوە بو ئەو ناوچەیە. لەگەڵ [سلیمی] ئاموزام بە چەکداری چوم بو ناو عشائری مەنگوڕی بەشی سابلاغ.

چونکە لەو کاتەدا تشکیلاتی ناو عشائری منگوڕ ئەکرابووە. ئەو کوشتار و بڕین و غەوغایەی کە لە ناوچەی سقزا هەبو لەناو منگورایەتیدا ئەبو.

پیش ئەوەی کە بگەمو ناو منگوڕان ـ ڕوم کردە ناو گەورکی مهاباد چومە [دێ سویناس] کە ئەو دێ یە جێ نشینی سەروکەکانی عشیرەتی گەورک بو و ئاغایەکی ئەو دێ یە ناوی حمد آغای حسینی آغا بو.

لە وەختی خویا لە باوکم زانی بو کە چەند خزمێک مان لەو دێ یە هەن لەسەر ناو و نیشانی باوکم لە خزمەکانم پرسی. لە ڕاستیدا چەند ماڵیکیان لەو خزمانە بو هەڵدام. کە برا گەورەکەیان ناوی کوێخا [حسنە مشکە ـ بو. لەبەر بچوکی و بێ چم سزی هەر بە منالی ئەو ناوەیان لینابو.

بەڕاستی بەچاو پێ کەوتنی ئیمە زۆر شادمان بو. منو سلیمی آموزامی برد بو ماڵی خزیان. وەخزمەتیکی زۆر شایستە و خزمانەی کردین.

شەش ڕوژ لەو دێ یە گلی دای ئەوە ئەی ئەهیشت بڕوین زور تەماسی لەگەڵا کردین کە هەر لەو دێ یە بمی نینەوە. وە ماڵو منالەکەش مان لە [دێ کندە سورە] بو بگوێزیتەوە بو دێ سوێناس ـ

بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئەم ئەزانی مصیرمان چون ئەبی وە چەوینە ڕوژێکی ڕەش مان بە دواوەیە گویم ئەدایە داخوازەکەی کوێخا حسن ـ

کوێخا حسن ـ کچێکی باڵا بەرزی ڕێکوپێک چاو برو ڕەشی دەم بە پێکەنینی هەبو. کەمی دەمو چاوی بە نیشانەی ناو لەی وورردیلە دیاری ئەدا.

وا دەرنەکەوت کە کچەکەی کوێخا حسن ـ سکی هەبێ لە مام کوێخام پرسی ـ ئەری مام کوێخا ـ ئایشی کچت شوی کردوە یان نا.

ج – ئەری واللە ـ ئەم ساڵ [ ڕەدوای ] هەتیوەیکی پێشمەرگەی ساباڵخی کەوتوە. پێ چی سەری پێ دەچاوان خستوم. ئیستاش ئەوا. وە سەریان کردومە، هەم تولی پرە و هەم تەڵاکیش دراوە.

س ـ جا بو ئەوەی مام کوێخا تەریق نەبێتەوە لە بەسەرهاتی کچەکەی وتم. خۆ مام کوێخا ئەو رووداوەیە عەیب نیە بۆ چی بوم بەسەرهاتە تەنگ چووی. ڕەدوا کەوتن لەناو کوردایەتیدا زۆر باوە. شتێک کە عرفو عادەت پێ نابێ بە عەیب و شورەی. ژنێک کە ڕەدوا نەکەوی هەر لە ژن ناکا.

ج ـ کوێخا حسن ـ کورە خۆ دەزانم عەیب نیە ـ هەتا ئیستا ئایشی کچم سێ جاری [ دەدی ] ڕەدوا کەوتوە. هیچ پێم ناخۆش نەبوە. چونکە هەمو جاری هاتونە سەر بەرەکەم وە دەست یان ماچ کردوم وە مەسلەتم لەگەڵ کردون بە خوێن و شیربایکی زۆر چاک. هیچ پێم ناخوش نەبوە. دایکیشی بە ڕەحمەت بێ لە میردیم هەڵ گرتبو لە پێش منیشا جارێکی دی ڕەدوا کەوتبو. بەڵام ڕەدوا کەوتنی ئەو جارەم زۆر لە شانان گران بو چونکە ئەو پێشمەرگەی هی من (دەدایی) ناوە هیچ گوێ نەدامی مەسلەتی لەگەڵا نەکردم. منیش لە ترسی قازی محمدی نەوێرام هیچی پێ بڵێم.

جا قضیەی دستور و یاسا تازەکەی حاجی بابە شیخ ئاژاوە و دەنگێکی گەورەی لە ناو کچ و کور و ژن و پیاوان نابوە. لەو کاتەی کە حمە رشید خان گەڕایەوە بو عراق. من لە ئیران مامەوە ئەم ویست وەکو حمە رشید خان وازلە خزمەتی کوردستان بێنم خۆم بکەمەوە دیلی دست پولیسی عراق.

هەر لە ئیران مامەوە. بەڵام یکدو ئەفسر لە ئەفسەرکانی عراقی هەل یان لی دی بوم. لە لای [ اسد اوفی ـ ڕوسی بە سەختی تاوانباریان کردبوم. کە لە گەڕانەوەی حمە رشیدخان بو عراق دستم تیا هەیە. اسد اولیش ـ قازی محمدی هەڵ پێ چا بو بو گیراتی من. ڕوژێک لەناکاو دستەیک پێشمرگە لە دی [ قرتە ] گرتیانم و بردیانم بو سابلاغ و خستیانە زیندانی کوردستانەوە،

لەو زیندانەی کە دەمێک بو بە تاوانبارەوە بوم. ئەم ووت تاخ ڕۆژێک کوردیش زیندانیکی ببوایە. و توانی بایە بە عەدالەتی خۆی محاکمەی تاوانبارانی بکردایە.

تا حەزەکانم ئەیانەویست بە قضیەی حمە رشید خانەوە بم سوتێنن و منیش ئەم ویست وەکو مەلحەمەتیلەکەی [یانارکوتی برداوسلاما علی ابراهیم] لەو ڕوداوەم لی دور بخرێتەوە.

ئەمجا دژی حمە رشید خان دەست کرا بە پرسیار و لی کۆڵینەوە ئەیانەویست کە من تاییدی تاوانەکانی حمە رشید خان بکەم وە ئەمجا بەرەڵام بکەن

وەکو [گوێلەکەی مەلای مەزبورە] هەر لە گوێلکی بەستراوەیان ئەدا. حمە رشید خان یان لە دەست دەرچوبو. ئەیانەویست من بەباسی حمە رشید خانەوە بکەن بە سینمای ئەسەدنوف و برایانی ناحەزم ـ

لە دوایدا بویان ڕون بووە کە من لە بەسەرهاتەکانی حمە رشید خان بی تاوانم و هەر ٢٠ وینە تاوانەکەی حمە رشید خانم لەسەر بناغەیکی زەمیر و ڕوداو بو تەفسیر کردن. کە لا کاتی خۆیا بە دور و درێژی نیشانیان ئەدەین.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشا [١٦] ڕۆژ هەر لە زیندانی [سید پیرەدا مامەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی کە ناظر و نوخری حکومەتەکەی قازی محمد بو ئەم توانی وەکو جاران بچمەوە ناو ڕیزی فەرمان بەری وە خوم بە مسئولی فەرمانی گرنگ بزانم.

جا لەو کاتەی کە من چومە زیندان [٥٠] بەندی لە زیندانەکەدا بون لە تاوانەکانم پرسین ٣٨ کەسیان وەڵام یاندایەوە ووتیان ئیمە ژن مان هەڵ گرتوە لە سەر ژن هەڵ گرتن گیراوین. چونکە [پی مان لە کلکی گوێرەکە] ناوە. بە مانا یاسا و دەستوری حاجی بابە شیخ مان شکاندوە.

دە نەفەریش یان ووتیان لەسەر ڕابوری [عثمان دانیشی مدیری مدرسەی گلاویژ ـ گیراوین. گوایا هەر کەسی کە لە عراقەوە بیتە سابلاغ ترجمەی حالی ئەو کەسە لە کاک عثمان دانیشی ـ ئەپرسن ئەگەر ئەو ئەی گوت ئەیان ناسم

پیاوی باشن ـ ئەوا ئەگیرین. وە لە زیندان ئەمی ئەوە هەتا ئەنوسری بو عراق وە لە عراقەوە راپوری خاوینی یان دی بو سابلاغ ئەو حەلە بەرەلا ئەکرین.
جا ئیمە لەو کەسانەین کە کاک عثمان دانیشی ـ ناماں ناسی. ٢ نەفەریش یان لەسەر قەرز بەندی کرابون.
زوربەی بەندیەکان مانەوەیان لە ٤ و ٥ مانگ تی پەری کردبو داد و داخوازیان بە هیچ لایی رانە ئەگەی. وە لەو مەودایەشدا کەس هیچی لی نەپرسی بون.
سیدە پیرەی ـ مدیری زیندان روژی نەفەری یک تومانی جیرە بەندی ئەدانی. هەمو خواردن و رابواردنیک یان بریەتی بو لەو تومانە. [جا بە کالی یا بە کولاوی ] هەر ئەو تومەنە بو کە ٥٠ فلسی عراقی ئەگریتەوە.
زورم بەزەی بەم خەلکە هەژارانەدا ئەهات کە وەکو ئاژاڵ خراونەتە ئەو زیندانەی پر لە موریانو دل گیریە ـ نە مذکرەی توقیفی وە نە دریژی مودە ـ وە نە روژی لی پرسین و چونەدادگا کرانیان وە نە پرسیاری هەوالی ـ وە نە حوالەي دادگاکرانیان ـ دیاری نەکراوە.
تەنیا لەسەر راپوری سیخوز و یا راپورچی و مدعی کابرا ئەگیرا تقریری نهانی محقق و تصدیقی حاکم بریاری حاکمی صلح و جزائی و ئیستنتاقو تمیز بریەتی بو تنها لە ئیخباری مخبر
جا لە مەودای ئەو ١٦ روژەدا سکالام بو ٣٨ نەفەری ژن هەلگرتو نوسی. بە زور وینەی قانوون و عرف وە دەستور ـ سکالاکانم ئەرازاندەوە. وە بە هوی [سید پیرە] رەوانەی دادگای تای بەتی ئەکران. خوش بەختانە ئەسەقی داواکان ئەکەوتنە بەرچاوی لی پرسەکانی شەرع و دادستین هەر ٣٨ کەسیان بەرەلا کران. بەلام تا ئەو ماوەیە دەستورەکەی حاجی بابەشیخیش ئەختی سارە بوبوە. پتر ئەوە بو بە هوی بەربونیان نەک هەر تەنیا نوسینەکانی من.
بەلام ١٠ نەفەرەکەی کە لە لاین عثمان دانیشەوە گیرا بون هیچ یانم بو بەرەلا ئەکران چونکە بە تهمەتی سیخوری سیاسەت گیرا بون وە لە حزبی پارت و تحرر] پرسیاریان بو کرا بو. مانەوەیان لەسەر وەلامی حزبەکان ئاوا درا

کەوتبو

هێئەتی قضائی ـ لیژنەی دادگای دەولەتی مهاباد

هێئەتێکی شەرعیان بۆ راپەڕاندنی ڕوداوی جزائی و حقوقی ـ لە مەلایان دروست کردبو. وە ئەندامی ئەو لیژنەیە بریەتی بون لە مەلا حسین ـ مەلا محمد و مەلا ابراهیم ـ ئەو مەلایانە تەنیا لە گرتنی خەلکا دەستی بالایان هەبو.

دەنا بەردانی خەلکو ئیش ئاسان کردنا زور ڕەزیل و چروک بون.

غیری ئەو دادگای شەریعەتیە دو دادگای تر هەبو. داوایک کە پەی وەندی لەگەل ڕوداوی لشکر بوایە. ئەدرا بە دادگای زەمانی جەنگ کە سەروکی ئەو دادگایە یات پولکونیک مصطفی خوشناو ـ وە ئەندام جعفری کریمی ـ و نوری احمد طه ـ و خلیلی خسرەوی ـ ناوان بون .

دادگای سێ هەم هێئەتی ئەنجومەنی ملی بو کە بریەتی بون لە ١٤ ئەندامی بەختی کامل و بە سالا چو. کە سەروکەکەیان قازی محمد بو ـ ئەو هێئەتە تەماشای هەمو وینە داوایکی ئەملاک و ناخوشی نیوانو زور شتی حقوقی یان ئەکرد.

وە بریارەکانیش یان قابلی رەخنە و دوپاتەی نەبو.

لەو هەمو مەودایەدا ئەو سێ دادگایانە دو حکم یاندا بو یەکەم حکمی پیاو کوژیک یاندا بو بەیەک سال بەندی و حکمی کابرایکی [ دایکی خۆ کوشتن ] یاندا بو بە مردنی تیرەبارانی ـ حکمی تیرەبارانیەکەیان شتیکی زۆر جوان و عدالەتانە بو. چونکە تاوانەکەی لە تاوان نەئەچو.

کوژراوەکە لەگەل [ زردایک ـ باوەژنەکەی ] ڕیک کەوتبون بو ئیشی خەراپو بی شەرعی.

وە لە سەر ئیتفاق و بریاری باوە ژنەکە. کوڕەکە باوکەکەی خوی کوشتبو و برا بچوکەکەی پی زانی بو ئاگاداری دادگای کردبو. کوڕەکە گیراو ژنەکە خوی شاردبوەوە. وە ڕسما کورەکەی پێ لە تاوانی خۆی نا. زندانی کاک سیدە پیرە

زۆر ـ پیس و ناخۆش بو. باوەڕ ناکرێ کە زیندانی ئیرانیەکان ئەوەندە بە ئەرک و ئازار بوبێ.

تەنیا چەند [بەرەیکی] تالاتی مالی حسامی ] دا شکستانی تیا راخرابو، ئەنا هیچ پێ خەو و شتی تری تیا نەبو.

سابونو حمام و ریش تاشین ـ قەدەغە بو. بەلام لە هەمو شتیک باشتریان ئەوە بو [ تەنوریکیان ] لە ناو حەپس خانەکەدا دروست کردبو بو سیپال لێ ژمشاندن ـ هەر چەندە کە من لەبەر نەزانین شاقەلی چۆخەکەی خۆم سوتاند ـ بەلام لە مسئلەی ڕشکو موریان ئەو تەنورە شتیکی زور بە کەلک و ئینسانانە بو.

لەگەل ئەوەشا کە زیندانو دادگا و بەندی هەموی هەر کورد بون وە بە داخوازی گەلی کورد پیک هاتبون هەر خۆش بو.

لەرهەنگ ـ خویندن لە مهابادا

لەبەر ئەوەی کە لە وەختی خۆیا ئیرانیەکان ئەهمیەتیکی وەهایان بە خویندەواری کوردەکان نەدابو. خویندواری بەرز و خاوەن شهادە و گەواهی لە سابلاغا نەبو.

زوریەی خویندەوارەکانیان لە کلاسی ۳ ناوجی متوسطە تی پەڕنەبوبون.

بەلام لەبەر ئەوەی کە چەند مامۆستایکی باشیان لە عیراقەوە بە فیداکارانە بو هاتبو. خویندەواری حکومەتی قازی محمدیان خستبو سەر باریکی ڕیکوپیک.

معاوني وزیری معارف [ دلشاد رسولی ـ] ناوی باوک ئیرانی بو کە کە لە وەختی خویا باوکی هاتبو کوییی. وە دلشاد لە کویی خویندنی مامۆستایەتی تەواو کردبو. بەلام زور زانا و خۆ پیش خەر بو.

بە هوی تی کەلاریەتی سابلاغی و خزمایەتیەکەی ئەو مەنسەبەیان ڕەوا دیبو. ئەگەر بە ئیستحقاق بوایە بو ئەو مەنسەبە زۆر کەسی خویندەوارتر هەبو کە لە عیراقەوە هاتبون. لە سابلاغا ۸ مدرسەی کور و کچ یان کردبوە. لە

شارانی بوکان سندوس ] نەغدە ] شنو ـ دیمسان ـ خویندن گایان داناىو نسبەت بە ئیدارەجاتی حکومەتی قازی محمد ـ چینی خویندەواران لە هەمو دایرەیکی تر پیشکەوتو تر بون.

مەوجودی شاگردی مدرسەکانی ساىلاغ بە کور و کچیەوە گەیشتبو ١٦٠٠ شاگرد

کچانی مدرەسی زوربە سفور و جلی ئالە فەرەنگە و سەربەستی ئەژیان. جلی مدرسی کچ و کور لەسەر فورمێکی تازە بو بە جلی رەشوکی و نارخویەتیەوە شاگردی کور و کچ لە مدرەسە وەرنەئەگیران.

کچ و کور چون یەک ئەچونەناو بەزمو ئاهەنگ وە نومایشی مدەنی و سیاسیانەوە. هەر وەکو کور بە کچیش سەربەستی تەواو درابو. کچان دەوری خطبە و شیعر خویندنەوە و نوسین و مقالات یان. زور بەسەربەستی ئەگیرا

قازی محمد ـ حەزی بە سفوربو لینگ و قول روتی ئەکرد. زور بە خەیالاتی بەرزی خویندنی کچانەوە سەرگەرم بو. [کودەلەی صیدەلیان ـ و مریم خان ـ ناوانی مدیری مدرسەی کچان بون.

هەتا جاریک متینگێک لە ساىلاغ گیرا. هەمو کچە مدرەسەیەکانی ساىلاغی بە جلی سفورەوە هاتبونە ناو ئەو متینگە قازی محمد هەستایە پی و وتی. من کە خاوەنی ئەو هەمو کچە جوانە روح پاکانە بم هەرگیز نارو‌خێم ـ

ملا مصطفی بارزانی ـ لە زور جیگا تەنقیدی ئەو فەرمودەی قازی محمدی ئەکرد و ئەیوت.

حق وابو قازی محمد ـ وتبای من کە خاوەنی ئەو چوار جەنەرالو لشکرە بم هەرگیز نارو‌خیم. چونکە روخاندن بە هوی چەکو پالەواناتی میدان پاریزگاری ئەکری. نەک لینگو قولی روتی کچان.

هەتا لە روژی ١٠/٤/٣٢٥ (١/ تموزی ٩٤٦) مدیری گوفاری [خواندنیها] لە تاران چاوی بە قازی محمد کەوتبو لە بارەی خوندنەوە لی پرسی بو قازی محمد وەلامی دابووە. کە لە نیازمایە. دەبوستانی ساىلاغ بکەم بە دەبیرستان و دانشکەدە ـ

قازی محمد ریزیکی تەواوی لە ماموەستایان نابو وە لە خزینەی دەولەتی یارمەتی باش نەدران.
موچەی معلم و معلمات لە ۱۰۰ تومانەوە هەبو هەتا ۲۵۰ تومان کە ئەم موچەیە بەرامبەر بەم روژە زۆر بو
لە مدرسەکان هەر کتیبی کوردی عراقی نەخوینرا. چونکە جاری پیرا نەگەیشتبون کە کتیب چاپ بکەن.
وشە و پیتی کوردیان لە روژنامەکانا بلاو نەکردەوە بو ئەو خوینەدەوارانەی کە نەیانەویست فیری نوسینی کوردی بین.
جلی ماموەستایەکان وەکو جلی ئەفسەری وابو سالیانە پارەی جلی ماوەستایان لە گەنجینە تەرخان نەکرا.
محمد ووردی ـ عبدالقادر ـ قانع ـ عثمان دانیش ـ محمود کریم زندی ناوان لە عراقەوە چوبون بو مهاباد بو درس ووتنەوە.

تەرزی نوسین و دەفتەرداری
لەو وزارەتانەی کە دامەزرابون تەنیا نمونەی وزارەتی فەرهەنگ دادگستری ـ جەنگ ـ کشوەری ـ دارایی دیار بو. وزارەتەکانی تر هەر شتیک بون وەکو پیەکەریکی بی جولە ـ
مدیری ئیدارە و نوسەرەکانیان تا ئەندازەیەک سەلیقەیان بە نوسینی شیوەی دەفتەرداری ئەشکا.
چاپی نوسین یان بە زوری پەیدا کردبو. دابەشی لق و پەل یان لە دائرەکانا کردبو. قاقەز و دەفتەریکی زوریان لە میراتی ئیرانیەکان بو بەجی مابو. وە روسەکانیش ۲۰ تەن قاقەزیان دابونی. سەری کلیشەی نوسین و سەری پاکەت یان بە کلیشەوە دروشمی ئەو دایرەیە بە چاپ چاپ کردبو.
نوسین یان پتر بە مەرکەبی جەوهەر بو. پی نوسی قوپیە کەم تر بەکار ئەهینرا
نوسەریک روژی هەر ئەی توانی دو سێ قاقەز بنوسی. چونکە بە دەست

هەت وە وینە لی نوسینەوەی نوسراو شتیکی زور بە ئەرک بو. وە کوردی خویندنەوەیان زور بەلاوە زحمەت بو. مدیری تحریرات سەرەکی نوسرانی بارەگای قازی محمد [یاهو] ناویکی سابلاغی بو. کە لە میرزا چاکیدا ناوی دەرکردبو ئەبو بە چەند جار پەڕاو ـ تەسوید ـ ئەمجا نوسراویکی بو ڕیک ئەخرا.

پیتەکانیان سەر شیوەی فارسی ئەنوسی. کە پی یان ئەووت شیوەی [شکستە] ئەو نوسینە بو عراقیەکان نەئەخوینرایەوە. وە دەست خەتی عراقیەکانیش بە ئەرک بو ئەوان ئەخوینراوە.

ڕوژیک لە [سەرا] لە جیگای وەزیفەکەم دانیشبوم [میر حاج] هاتە لام بو دانیشتن. لەوکاتەدا نوسراویکی احمد خانی فاروقی یان بو هینا. لە جیاتی ئەوەی نوسراوەکە بخوینیتەوە. نوسراودکەی لەسەر میزەکەی من دانا.

لیم پرسی بوچی ئەو نوسراوە ناخوی نیتەوە. ووتی بوم ناخوینریتەوە قالەزەکەم بو خویندەوە وە جوابەکەشم بو نوسیەوە.

احمد خانی فاروقی ـ کە بە احمد خانی خلیل خان ـ و سالار ] ناوبانگی دەرکردبو. یەکەم نوسەر و خویندەوار بو لە زمانی فارسیدا. بەلام کە ویستبای بە کوردی شتیک بنوسی. ئەبوایە لە هەوەڵەوە بە فارسی نوسراوەکەی ڕیک بخستایە ئەمجا هەڵی گیرابایەوە سەر کوردی. بە چەند سەر شکینەیکەوە ئەمجا بوی ئەبو بە نوسراو. ئەمجا کاک میر حاجیش ئەی فەرمو نازانم بی خوینمەوە لەبەر ئەوەی کە نوسین و خویندنی کوردی لە ئیرانا شتیکی تازە بە بارە و نۆ ئەخشە بو. خەڵک لە خویندنەوە و نوسینا سەربەست ئەبو بەلام خویندەوارەکانیان لە هەمو لایکەوە دەست یان کردبو بە شت فیر بونو بن چینەی نوسین و ڕەووشتی؟

بەم هویەوە لە ڕوژنامەی کوردستانی ژمارە ٤٢ بە دورو دریژی شیوەی نوسینی دەنگو ووشەکانم بو بلاو کردبونەوە وە لە زور جیگاوە سوپاسو ستایشم بو ئەهاتەوە.

## نەخوشخانەی مهاباد

هەرچەندە کە حکومەتەکەی قازی محمد ڕیک نەخرابو. بەڵام دەرماتیکی زوریان لە ئازربایجانەوە وەرگرتبو ـ هەندی دوکتور و برین پی چی کور و کچیان لە عراقەوە بو هاتبو کە لە دایرەی شیر و خرشیدا ـ صلیبی احمرا ـ نیشیان نەکرد بەرجستە و بەناوبانگیان دکتور سلام بخش و کمال الدین. و مندید و محمد ناوی برین پیچ بون.

لەگەل ئەوەشا جراح ـ برین تی مار کەرەکانی لادی یەکانیان هینابو ناو خستەخانەکانەوە شان بە شانی برین پی چەکانی فەنی ـ تیشیان نەکرد. و هەندی جار ئەشیان ناردن بو جەبهە بەڵام ئازربایجانیەکان دوکتوری باشیان هەبو. وە بە تای بەتی خستە خانەیکی گەورەی روس لە تەوریزا کرابووە دکتوری تای بەتی هەمو نەخوشیکی تیا دانرابو.

## دەرەجات لە لشکری کوردستانا

لەبەر ئەوەی کە دەولەتی ئیران میدانی نەدابو کە کوردەکان ئەفسەر و خویندەواری لی پی بگا. جا لەبەر هەندی پی ویستی ئەفسەر و دەرەجەدار. قازی محمد ـ هەر وا بە بی لیک دانەوە دەرەجاتی بە سەر ئاغوات وە خەلکی سابلاغا بلاو کردبووە. وە بە تەماعی دەرەجەداری بەشیکی زوری لە ئاغایان و خەلکی سابلاغ ڕاکیشابو ناو فەرمان وە بەربەرەکانی لشکری ئیرانەوە. وە فکریکی زور سیاسیانەی بەکار هینابو. بو ڕاکیشانی خەلک بو لای خوی بە هیوای دەرەجە و تەماعی [نەخشەکیشانی سەر ئاو]

بەڵام قازی محمد لە دوایی‌دا لەگەل عشائرەکانا بیر و باوەری گوری ئینقلابیکی زور سەیری خستە ناو دەرەجەدارەکانەوە. بە گویرەی ئەو بریار و پەی مانەی کە قازی محمد لەگەل ئیرانیەکان بەستبوی کە ئەبی ناوی لشکر بگوری بە [نگهبان] وە ئەو هیزەی کە ئەش می نیتەوە نابی سیمەتی عسکری ـ ئارتەشی ببی ـ دەرەجاتیش بە پی ئەو نسبەتە ئەبی هەل بگری جا لەبەر ئەو هەیەوە. قازی محمد لە کاتیکی زور سەخت و ناخوشا بلاوی کردەوە ئەوانەی

که به شهادەتی بەرز دەرەجاتیان نەدرابی تی وە یا بە رەسمی لە دانشگەی نەفـــەری دەر نەچو بن. دەرەجەکانیـان بە ـ فخری ـ لابار تەماشا نەکری. ئەو وێنە دەرەجانە ریزی دەرەجەی قشونی نیە.

جا بە پی ئەو بیاناتە لە هەمو لشکری قازی محـمـدا ۳۰ دەرەجەداری جەنگی حەربی ـ نەمایەوە.

ئەمجا بیانیکی کەی بلاو کردەوە ئەوانەی کە ئەیانەوی دەرەجەکانیان تابعی یاسای سەربازی بی ـ ئەبی بچن بو تەوریز بو ماوەی دو ساڵ لە دانشگەی جنگیدا نخوین حقیقتا ئەو بیاناتە لایەلایەی قازی محمد زیانیکی زوری لە هەستو تین و تەکانی کوردستاندا و خذمەتیکی گەورەی معنویاتی ئیرانیەکانی کرد.

چونکە ئەو دەرەجەدارانەی کە سالیک بو ئیشتراکی ئەو شورشەیان کردبو. و ئەو کەسانەی کە سالیک بو چوبونە ناو جەنگ و چوڵ پەرستی بە هیوای دەرەجە و مەنسەبی باش.

وە ئەو سەروک عشائرانەی کە بە خویانو پیاوەکانیانەوە بە هیوای دەرەجات و ئیحترام خویان کردبو بە دوژمنی ئیران وە سینگ یان بە گوللەی دوژمنەوە نابو.

لە ئەوەڵ بیستنی ئەو بەیاناتە ساردبونەوە. دەرجە و جەلەکانیان فری دا. بە لوت چرچی و دەم پر لە پرتو بۆڵە ـ ئاش بەتالیان لی کرد و هەر کەسە گەرایەوە بو شوین و جیگای خویان.

لیرەدا حمە رشید خان باشی بۆ چوبو کە ئەی ووت هەتا سقز و بانە و سەردەشت ئەگیری. من دەرەجەداری لشکرەکەم ئاشکرا ناکەم. چونکە ئەی زانی بە فەشەلی دەرەجەداری فەشەلی جبهە پەیدا ئەبی.

قازی محـمـد ئەبو لە تاران بەراووردی ئەم باسەی بکردایە کە لە پیش [ وەلاخ کرینا ] بوچی ئاخوری هەڵ بەستی. بو چی لە پیش تەواو کردنی تثبیتی مەرکەزی حکومەتی کوردستان و اعتراف بە هەمو کیانیکی کورد نژاد. جاری ناوی لشکر ئەگوری بە نگهبان وە لەسەر چوار لشکرەوە هیزەکەی ئەهیناوە سەر

٧٠٠ پولیسیک وە لە سەربازەوە ناوی لە هیزەکەی ئەنا نگهبان ـ بەمانا ئەمنیە ـ پولیس.
مادام خەلکەکە بەبی مرچە و جل و بەرگ ـ بە هەمو مخارجیکی خۆیانەوە تەنیا بە خۆشەویستنی دەرەجەداری هاتبونە میدانەوە ئەو قضیەیەی تاجیل کردبا بو کاتیک کە ئیرانیەکان وادەکانی تریان سەریی گرتبایە. ئەو حەلە دەستەبەری ئەو بریاری جەبهە چول کردنە بویایە.
ئەبو قازی محمد ـ هەر لە تارانەو تی گەیشتبا کە حکومەتی ئیران ضعیف نیە بویە بهانەی وا گەورە نەگری. جا بەربەرەکانی هیز و تەوانا. بە هیزیکی گەورەی سەرباز و عشاتر پیک دی. نەک بە هیزیکی داوەشاوەی پولیس و نیشک چی ناو شارەکان.
کاتی کە لشکری شکاک هاتە جەبهەوە ١٣ دەرەجەداریان هەبو. بەلام کە لشکرەکەیان بلاوەی پی کرا دەرەجە دارەکانیان گەیشتبونە ١٥٠ نەفەر.
هەتا دو نەفەری شکاکە چون بو لایی قازی محمد داوای دەرەجەیان لی کرد. قازی محمد ووتی من لە ترفیع وە دەرەجاتی نیوە بی تاگام. هاوری یەکانتان چون ١٣٧ دەرەجەی بی ئەمریان هەل گرتوە نیوەش بچن دەرەجە بۆ خۆتان هەلبگرن.
لە بەشی رادیوی تاران بە گالتە پی کردن بلاویان نەکردەوە کە قازی محمد شەهپور ـ فیق فیقەیکی چنگ کەوتوە هەر بە فو پیا کردن ئەفسەر و دەرەجاتی لی دەر ئەپەری لە ناو لشکری قازی محمدا ـ ئەفسەریو دەرەجە هەلگرتن بوبو بە خولیایی وە مودەیکی زۆر سەیر.
چونکە خەلکەکە ئەوەندە تی نو بون بو سەربەخۆیەتی و دەرەجاتی دەولەتەکەیان. ئەگەر ئەستیرەیک بە گیان بکرایە وە تەواو بوایە ئەیان کری.
چونکە خەلکەکە ئەوەندە نازاری دەست ئەفسەرەکانی ئیران یان دی بو. ئەیانەویست بە روتبە و مەن سەبی حکومەتەکەی خۆیان و دەرد و ئازارە لە بیربەرنەوە. جا روتبە وە دەرەجە نرخیکی زور بالا و خۆشەویستنی هەبو لەناو عشایر و ناو شارەکانا.

بو نمونەی مسال.

اسماعیل خانی فرخی ـ ئەفسەریکی ۳ ئەستیرە بو وە رسول نەغدەیش ـ ئەفسەریکی دو ئەستیرەدار بو هەر دوکیان ـ لە مەرکەزی سەرا ـ لە ریزی لەشکرا نیش یان ئەکرد وە بە فەرمانی وەزیری جەنگ ئەو ئەستیرانەیان دراببو.

بەلام ئەگەر رسول نەغدەی ـ لە سەراوە چوبا بو بوکان بو فەرماتیکی میری یا حزبەتی. ئەستیرەیکی لە ئەستیرەکانی اسماعیل خانی فروخی ـ دائەگرت وە لەی چەسپاند بەسەر شانی خوبا وە ئەستیرەکانی خوی ئەکرد بە سێ ئەستیرە وە هی ئەکانی اسماعیل خانی ئەکردەوە بە دو ئەستیرە هەتا ئەگەرایەوە وە ئەگەر اسماعیل خانیش ـ چوبا بو بوکان ئەستیرەیکی رسول نەغدەی لەگەل خوبا ئەبرد ـ ئەستیرەکانی ئەو ئەبون بە چوار ئەستیرە و ئەستیرەکانی کاک رسولیش ـ ئەبون بە یەک ئەستیرە هەتا ئەگەرایەوە.

ما خوشەوستی دەرجات گەیشتبو بەم ئەندازەیە لەو باوەرە دابوم ئەگەر ئەو هێز و کوبونەوە و جەماوەریە لە ژیر فەرمانی کەسیکی زانا و قال کراوی شورش دا بوایە هەر بەم لشکر و هیوای دەرەجەداریە هەمو کوردستانی ئیرانیان ئەگرت. بەلام داخی گرانم سیاسەتی سوسیالیستی وە شەریکەی تامیمی دەولی ئیران. شتیکی وەهای کردبو کە زمانی هەمو زانا و کاربەدەستیکی ابرال بو.

پیاوی زانا و بلیمەت خرابو ژیری ئەزانو بەسەر نەهاتو جا هزی لەناو چون و لکانی عمودی فەقری ـ تی غەی پشتی کوردستان شکان. بلاو کردنەوەی لەشکر وە رەنجان وە دل شکانی عشائر ـ و شعور بریندار کردنی دەستە و دەستەیک بو کە بە خاوەن دارایی وە ئەشرافی وەلات ناویان دەرکردبو. وە لە لای دەستەی حزبی جەوانانەوە بە سوکی تەماشا ئەکران.

هەر ئەوە بو کە بو بە هوی تیک چونی کوردستانی قازی محمد وە پاش کەوتنی سیاسەتی کورد بە مەودایکی دور.

ناخوشی نیوانی حەمەرشید خانو لشکرکەی

لەبەر ئەوەی کە لە نێوانی لشکر و ئیدارەی قازی محمدا تەربیەیەکی سەربازی یێک نەهاتبو. رابور و رابوەکاری لە نیوانی هێزەکانو ئیدارەدا ... بو. ناکوکیکی زور تەواو کەتبو ناو لشکرەوە. لە رەئسی ئەوەی ئەفرادی حزب تەلاقو سویندیان خوارد بو کە خەیانەت لە کوردستان و یەکتر نەکەن بەلام ... سیندە لەلای کەم کەس نرخی مابو. ئەفەر و ئەفسەر و فەرماندە و مالک... فلاح وە کویەک لە دژی یەکتر ئەدوان

هەتا جنرالەکانیش لە جەبهەدا نیوانیان باش نەبو. قازی محمدیش ـ ... خوش نەبو کە نیوانی ملا مصطفی و حمە رشید خان خوش بی. ئەوەکو... هەندی فەرمانی سەرپەخزیەتیدا بەریەرەکانی بکری.

قازی محمد لەو کاتەدا بە زوری باوەری خستبو سەر حمە رشیدخان ... کردبوی بەسەر لشکری هەمو جەبهەکان.

ملا مصطفی ـ لەباری لشکر و هاوری خویندەواری و بی تەماعیەوە ... حمە رشیدخان پیشکەوتوتر بو. بەلام حمەرشیدخان لەبارەی ناسین... عشائرەکانی ئیران وە رەووشت وە سابقەی رابوردوی خەلکی ئیران لە ... مصطفی شارەزاتر بو. حمە رشید خان ـ زور سەرکێش بو هەمو بەسەرهاتیک... جیهانی بەبی نرخ تەماشا نەکرد. زور لەگەل دەستەی خویندەواریو قەلەم... ئاشنا نەبو.

دوستایەتی عشایری لە خویندەواری بەلاوە باشتر بو. بەلام مەلا مصطف... هیزی خویندەواری تفضیل ئەدا بەسەر چەکدارا. حمە رشید خان زور ... مبالاتانە ئەجولاوە. لای وابو راستی ژێر درو و بوختانو ناپاکی ناکەوی... هەمو کاتیکا هەر راستی پیش ئەکەوی. بازاری ناراستی و بی چەوانە هەر... سەر یک بازاری ئەبی.

پتر ئەفسەرە فراریەکانی عراقی لە ناقاری حمە رشید خان درو و پیلان ... ریک ئەخست کە دلی ملا مصطفی و قازی محمد لە حمە رشید خان بروخی... و سلطاتی روسەکانیش لە شوین خوی بەم رابورانە ناگادار ئەکرا.

بەلام حمە رشیدخان بە غروری پشتیوانی قازی محمد و حمە حسین خا پشتی کردبو ئەو هەمو نوسینە پر ناژاوەیانە. هەتا گەرانەوەی بو عیرا شکایەتی لە هیچ ئەفسەریکی عراقی وە ساباڵاغی نەکرد، وە هیچ وین دفاعیکیشی لە خۆی نەئەکرد.

دەست پی کرانی ناخوشی

١- حمە رشید خان بو فەرماندەی هیزی ٤ بارزانی لکی سەروچاوە [ بە آغا ] نوسی کە نوردو بەزەکەی لە سەرچاوە بکەزیتەوە بو تاوەتران ـ صالح نا ـ دوزەخ دەرە ـ بو ئەوەی کە بتوانن بە تەواوی گەماروی سەقز بدەن. وە [ بنکەکانی هیزەکانی تری بارزانی نزیک بێتەوە.

ڕونوسی ئەو داخوازەی دا بە مەلامصطفی. وە وەزیری جەنگ.

بەلام فەرماندەی ناوبراو سەری لە فەرمانی فەرماندە حمە رشیدخان پ چایەوە. بو ئەوەی کە سەر پی چانەوەکەی سەر شتیکی علمی بی. تشکیل کومیسیونیکی عسکریان کرد لە نیوانی میرحاج و مصطفی خوشناو و بکرا و نوری احمد طه.ـ وە حمە رشید خانیان لەم بریاری کومیسیونە ناگاد کردەوە.

١- لەبەر تاقی نەکردنەوەی جیگا و شوینی ئەو شوینانەی کە تە باس کردون بو نوردوبەزی. وە لەبارەی تامینی خواردەمەنی و شتی سەربازی وامان بە چاک زانی کە نوردوبەزەکەمان هەر لە [ سەرچاوە ] بی. هەتا کاتیک پی ویست بەلام هینتی ناوبراو بریاریکی زور نالەبار و بە پی چەوانەیان دلب چونکە. تامین خوراکی بارزانی لە ڕی [ سەرچاوە نەبو. سەرچاوە لە ڕیگا ماشین زور دور بو.

٢- شوین گای تسلیمی خوار باریان دی [ آخ کند ] بو کە ٧ کیلومتر بو ئ شوینە لەسەرچاوە نزیک تر بو.

٣- ئەو شوینەی کە حمە رشید خان داوای نوردەبەزی لی کردبون ه [ ٥٠ ] دەقیقە لە مەرکزی سقز دور بو بەلام سەرچاوە و ئەو شوینە ٣٠ ٢/ کا

لێک دور بون.

٤- ئەفەراتی لکی ٤ زور لە ئوردوگاکەیان دور کەوتبونەوە بەم گوازتنەوەی شوێن گایە باشتر ئەکەوتنەوە ژێر سەرکەشتی و تامین خواربار.

٥- ئەگەر پێش دەستی ئەکرایە بو داگیر کردنی ئەو شوێنانە دوژمن زور بە ئاسانی ئەی توانی لە لوڵی [سلیمان کندی] وە بچیتە سەرچاوە و] ئوردوگای سەرا.

چونکە بە گوازتنەوەی ئوردوبەز باڵی باکووری سەقز ـ بە لشکری بارزانی ئەبەسترایەوە.

٦- وە بو پاشەوە گەڕانەوەی ـ عقب نشینی ـ پێنج جێگای گەورە بە دەستەوە بو کە پاشەنشینی لێ بکری ـ وەکو [مامەشا ـ ئالتون] مللرەنی ـ ئاخ کند ـ سەرا ـ

بەلام وا دەرکەوت کە لێرەدا مەبەست تەنیا ئەوە بو کە واریداتی دێ سەرچاوە ـ ئەکەوێتە دەست حمە رشید خان گوایە ـ حمە رشید خان لەو داخوازەیا مەبەستی واریداتی ئەو دێ یە بووە نە وەکو دڵسوزی بارەگا و سەرباز.

٢- ئەفەرێکی بارزانی لە شەرێکی ئێرانا دو تفنگی تالانی چنگ کەوتبو و فروشتبوی بە پیاوێکی بوکانی. فەرماندەی لکی چواری باسکراو ـ کابرای تفنگ کڕ دارکاری ئەکا و تفنگ و پارەکەش لێ ساندبو.

کابرای تفنگ کڕ سکالای بەسەرهاتەکەی لە دێ سەرا ] دا بە حمە رشید خان. وە حمە رشید خانیش بو فەرماندەی ناوبراوی نوسی بە وێنەی خوارەوە.

فەرماندەی لکی ٤ بارزانی پات پولکونیک [بکر ئاغا]

لەبەر ئەوەی کە هیچ فەرمانێکی ڕەسمی بە دەستەوە نیە کە چەک فروشتن لەناو دانیشتوانی ئێرانا قەدەغە بی. چونکە چەک کڕانی عشائری ئێرانیش شتێکی زور پێ وێستە لە ڕیزی دوهەما ئەم پیاوە هەم کاسب و هەم کوردە. بو ئەوەی کە ئەو ئەفەرە بارزانیە هەژارەش سود لە پارەی ئەو تفنگانە وەر بگری کە بە خوێنی خوی چنگی کەوتون. جا تکایە تفنگ و پارەکە بو خاوەنەکانیان

ڕەت بکەوە با زەرەرمەن نەبێ،                محمد رشید قادر خان زادە

فەرماندەی هێزی بۆکانو ناوچەی سەقز

فەرماندەی ناوبراو لەسەر ئەو نوسراوە تورە بو بو وە تیر و پری لە کابرا هەڵدابو. وە پارە و تفنگەکانیشی زەوت کردبو

٣- دیسان سەیدێک ـ هاتە لای حمە رشید خان و وتی فەرماندەی سەرچاوە ـ ٤ ئەمنەکە نەوت وە یەک تنکە ڕونی لی ساندوم. حمە رشید خان بە وێنەی خوارەوە نوسراوێکی بو نوسی.

بو پات پولکونیک فەرماندەی ٤ لکی بارزانی لە سەرچاوە

ئەگەر ئەو سەیدە سکالاکەی ڕاستە حەز ئەکەم معذوری ئەکەی چونکە سیدە و سیدیش لەم ناوەدا محترمەن.

فەرماندەی ناوبراو لە بەرام بەر وەلامی ئەو نوسینە. تیر تیری لە کابرای سید هەڵدا بو.

سەیدە کە بە هەڵاتویی هاتەوە سەرا. ئەمجا حمە رشید خان بە ڕەسمی سوالی لە فەرماندەی ناوبراو کرد بۆ هێزی وەلام نەدانەوەی نوسراوەکەی لەگەل هێزی لیدانی ئەو سیدە. ئەمجا ئەوە وەلامی فەرماندەی ناوبراوە کە لە خوارەوە پیشکەش ئەکری.

بو فەرماندەی هێزی بوکان و ناوچەی سەقز

آغای جنرال مایور محمد رشید خان

وەلامی نوسراوەتانە.

لەبەر ئەوەی کە من فەرماندەی ئەو ناوەم دەسەلاتم هەیە لە خەلک بدەم. بە هەڵ گرتنی گوماتی سیخوری جاسوسی ئەوەم کردوە.

پات پولکونیک

فەرماندەی هێزی سەروچاوە

لە ٢٠/ مایسی ١٩٤٦دا حمە رشید خان و عمرخانی شکاک بۆ هەندی ووتو ویژی ڕەسمی چون بو سابلاغ. وظیفەی فەرماندەی لشکری سقز و بوکان بەرەو

ڕوی من کرابەوە وە ئەم وەکالەتەیەم بە هەمو هێزەکان ڕاگەیاندرا.

لەو مەودایەی کە من وکیل بوم دو نەفەری سەربازی ایرانی لە هێلی (قارەوا) خۆیان بە دەست هێزی ئەو فەرماندەیە (سەرپەخۆیە دابو. وە ئەو فەرماندەیەش یەک سەر ئەو دو نەفەرەی ناردبون بو سابلاغ. و نیمەی لەبەسەرهاتی ئەوانە ئاگادار نەکردبو.

بو تکرار نەکردنەوەی ئەو وینە هەلانە ـ بە بەرواری ۲۲ مایسی ۹٤٦ بەم جی خوارەوە نوسراوم بو فەرماندەی ناوبراو نوسی

بو فەرماندەی هێزی ٤ بارزانی سەرچاوە آغای بکری کویم ئاغا

ئەو سەربازانە کە تسلیمی نەفسی یان بو ئیوە کردبو چیان لی هات. ئایا لیتان پرسیون کە بە هۆی چە فشارێک لە سەربازخانەی لشکری ایران فراریان کردوە.

وە لەبارەی مەعنویاتی هێزی دوژمن و چونی و چەندیەتیان چە وینە ئاگاداریک یان کردون بومان بنوسن.

بۆ خۆت ئەزانی کە ژیانی سەربازی لە خوی ماشینیکدایە لە یەک کەوتنی پارچەیەکی بچکولانەی ئەو مکینە گەورەیە لەکار ئەوەستی.

وە پیشکەوتنی گیانی سەربازیش دیسان بە ئیتاعەت و یاسای سەرباز پەرستان پیک دی. ئیوە بە کەسیکی خاوەن تەوانا و شارەزای سەربازی ناوتان بلاوبوتەوە. هیوادارین کە لە داهاتوشا هەر بەم ناوبانگە گەشە بدەن

میرزا محمد امین مەنگوری

لە جیاتی فەرماندەی هێزی بوکانو سەقز

ڕونوسیکی بو فەرماندەی هێزی ناوەندی مهاباد ـ بو ئاگاداری

فەرماندەی ناوبراو لەسەر ئەو نوسراوە زور توڕە ببو وە قسەی ناشیرینی دەرحەق کردبوم. وە ڕونوسی نوسراوەکەشی دابو بە ملامصطفی لە سابلاغ.

بەلام من گوێم نەدایە ووتە پڕ و پوچەکانی. چونکە ئەم زانی ئەم ئەفسەرە لە داهاتودا توشی لی قەوماندیک ئەبی. کە بو ئەم قسانە زۆر پەشیمان ببیتەوە.

بەلام سەرکێشی و نالەباری ئەو ئەفسەرە ڕۆژ بە ڕۆژ پی هەلاتەچو.

ئەمجا حەمە رشید خان نوسراوێکی خوبەتی ـ خصوصی بو مەلا مصطفی نوسی کە ئەختی بەسەر ئەو فەرماندەیەدا بی. چونکە زۆر لاری ئەروا.

جعفری کریمی معاونی وزارەتی جەنگ بو لیکولینەوەی ئەم باسە هاتە سەرا. بەلام حەمە رشید خان بو بازرسی و سەرکەشی جەبهەکان لە سەرا دور کەوتبووە.

هەمو مخابرەکانم نیشانی جعفری کریمی دا. کە تا چە ئەندازەیێک ئەو ئەفسەرە لە خۆی باهی بوە. ئەمجا بە خلافی ئومید فەرماندەی ناوبراو گوێزرایەوە بو [ آلتونی سەرو ] و فەرماندەی هیزی ٣ نوری شیردل لە جیگای ئەو بو بە فەرماندەی لکی ٤ بارزانی لە سەرچاوە ـ و لە دوایشا ئەو فەرماندە لە خزیا باهیە گویزرایەوە بو سەردەشت بە غیری ئەوەی کە بەرامبەر بە قیادەی حەمە رشید خان سەرکیشی و سەر پی چانەوەی لەو فەرماندەیە ئەبینرا. دایرە گەورەکانی سابلاغیشی دیسان هەر ڕەنجاندبو.

بە بڕواری ٥ کانونی ئەوەلی ٩٤٦ عبدالله ناوێکی سایق راپوری دابو کە ەرماندەی ناو براو لە جبهەی سەردەشتا ١٥ هەزار فیشک چوار فەردە شکری ناردوتەوە بو سابلاغ کە بوی بفروشن لەسەر ئەو ئیخبارێە لە سەردەشتەوە هینرایەوە بو سابلاغ لەو کاتەشا نە ملا مصطفی و نە قازی محمد لە سابلاغ نەبون چوبون بو تەوریز وەکالەتی سەروکی ئەنجومەنی ئەیالەتی درابو بە صدری قازی.

چەند جار لە لاین صدری قازیەوە داوای ئەو فەرماندەیە کرا کە بچێتە مەرکزی پولی ٣ ناوندی بو لی پرسینی لەبارەی ئەو فیشکو شکرانەوە. هەتا نیستا حاضر نەبو کە ئیفادە بدات هەر ئەیگوت کە ملا مصطفی لە تەوریز گەرایەوە دیم بو ئیفادەدان هەتا ملا مصطفی لە توریز گەڕایەوە حکومەتی قازی محمدیش تێک چو. ئەو ئیفادە و پرسیارگایە هەر پێک ئەهات.

وە سانقی مخبریش ـ هەر لە زیندانی سیدە پیرەدا ڕۆژی بەتومانیک جیرمەندی ڕای ئەبوارد. چونکە پەردەی لە ئەهینیەکانی فەرماندەی ناوبراو هەل

مالیەوە. ڕیزی سەربازی پێ شکاوە.

دەستی هاندان لە دژی حمە ڕشید خان

لە جبهەدا پەلجەی درو و دەلەسە و هەڵ بەست زۆر بو. ڕاپوری عرزکاری لە دژی حمە ڕشید خان ئەنوسرا بو ڕوسەکان. هەندی لە ئەفسەرانی لشکر خلکیان هان ئەدا کە بچن شکایەت لە حمە ڕشید خان بکەن

و آغایەکانی دیکری بە تێکرایی حمە ڕشید خانیان خوش نەئەویست چونکە ئەیان زانی کە حمە ڕشید خان لە دوارۆژا لی یان ئەبی بە بەلایکی رەش وە کردەوەکانیان رون ئەکاتەوە.

لە ٢٢ تشرینی ثانی ٩٤٦ لە نوردوبەزی سەرا چاوم بە فەرماندەی هیزی بارزانی عزەت عزیزی ئامیدی ـ کەوت.

فەرماندەی ناوبراو زور بە ڕوسوری و خذمەت گوزاری ئەزانی کە بوی گیرامەوە تا ئیستا ٣ ڕاپوری لە دژی حمە ڕشید خان نوسیوە بو ڕوسەکان

ئەگەر قازی محمد هیشتبای حمە ڕشید خان لەسەر ئەو ڕاپورانە ئەخنکاندرا.

لەگەل ئەو هەمو سوکی و بەد ناویە کە ئەفسەرەکانی بارزانی لەگەل حمە ڕشید خانیان بە ئەنجام ئەهانی. حمە ڕشید خان هەتا ایستا شکایەتی لە هیچ کامیکیان نەکردوە. وە زور خذمەتی ئەفەراتی بارزانی و عائلەکانیانی ئەکردن بە زور خواردن و سوتەمەنی و شتی تری بو لە ئاغایەکان ئەساندن جا بە هوی ئەمەوە کە من لەگەل حمە ڕشید خانا بووم وە لە یەک جبهە و فەرماندەیدا نیشی لشکرکشی و فیداکاری کوردستانی مهابادمان کردوە. ئامەوی لە ڕاستی و پاکی لا بدەم. بە پی ڕوداو و واقع چم دیوە وە چیم بی ستوە ئەی نوسمەوە.

من بە ڕەوی یەی خوصی نازانم کە لاین گری حمە ڕشید خان بکەم وە عیبەکانی بو بشیرمەوە. وە یا نە بە ناحەق شتی دروو دەلەسەی لەسەر بکەم بە مال.

روداو چون بووه ئەمەوی بەم پێ بە بێ نوسـمەوه کەس بە تاوانی کەس هبدار نەکەم.
بو نمونەی مسـال ئەو باسـەی خوارەوەتان بو ئەنوسمەوه بو ئەوەی دەربکەوی کە من گلەیم لە دەستە و دایرەی حمە رشـید خان هەیە دیلی هیچ وینە چاکەیک یان نیم کە ببیتە هزی داپوشینی تاوانەکانیان.
بەلام لەری راسـت و رەوان لا نادەم زەمیری خوم بو مادە وە هەندی شتی تر هبدار ناکەم. راستیم لە مادە و رپایی بە لاوە خوشەویست ترە.
لە مەوبەر عرزم کردن کە من لە نوردوبەزی [سـەرادا] رئیس سـتادی لشکر بوم بـە ناوزدی [ پولکونیک] و بێ جگـە لەوەش رئیس حزبی جەوانانی ناوچەی سرا و سقز و بوکان بوم.
بەلام لە سـەر ئیعتمادی حمە رشـید خان ـ من دوچاری ئەو روداوە بوم کە لە بندیخانەی ساپلاغا ١٦ روژ بگیریم و سزا بدریم.
لە پاش ئەوەی کە حکومەتی قازی محمد دوایی پێ هات. من بە روسـمی مراجعەتم بە آسـتانداری سـلیمانی ـ حسـن طالبانی ناو کرد بو بەخشین وە گەرانەوەم بو عـراق لە تاوانی سنور بەزی و هاتنە ئیـرانم. بەلام آسـتانداری ناوبراو ـ بە مەرجی داوای گەرانەوەمی نەکرد بر عراق کە بم دات بە دادگا لە تاوانی سنور بەزی و داوایی کە بەسـەرمەوەبی.
هەتا سـالی ٩٤٨ لە ناوچەی دولی میـرەدی] مامـەوە. بەناوی گوزار ـ مسـتعاری ـ محـمد امین خرمی] لە لاین محـمدی جەوانمردی سـەروکی عشـیرەتی گەورکی میـرەدی] کرام بە نوسندەی سـەرپەرستی نگهبانی ـ دولی میـرەدی مانگی بە ١٢٠ تومان.
بەلام لە ناکـاما بە هزی ناخـوشی [ آغای محـمدی وکیلی] آغای دی قەپاغلو] و آغای جەوانمردی. هیلانەم لی تیـک چو وە ناشـکرابوم ئیرانیەکان دەست پاندایە سورانەوە بە دواما.
جا بو ئەوەی کە بە تاوانی حمـە رشـید خان و قـازی محـمد ـ نەبم بە

پیشەکیشی ئیرانیەکان.

بە هۆی مدیری ناوچەی پینجوین ـ کاک عزت ئەفندی تەلچی ـ داوای گەڕانەوەم کە آستاندار سید علی حجازی کرد. ئاستانداری ناوبراو بەڵێنی بەخشینی داپوم وە بە نوسراوی خوارەوەی کاک عزت ئاگاداری کردم کە بگەڕێمەوە بۆ عراق.

بو جنابی میرزا محمد امین مەنگوری

بلا قید و شەرت بگەڕێوە بو سلیمانی. وە خۆت بپاریزە لە مخالفاتی قانونی. کە اثباتی بی طرەفی خوت کرد. ئەو وەختە توظیفیش ئەکریتەوە. سعادەتی متصرف بەم پی یە ابلاغی کردوم کە وەلامت بدەوە.

عزت محمد

مدیری ناحیەی پینجوین ١٢/ ٤/ ٩٤٨

لەپاش ئەو هەمو تی کەلی و بەسەرهاتانەی کە لە پیناوی کوردیەتا بەسەرمان هاتووە ئەو دەربەدەریەی کە لە ڕیگای کوردستانی ئازاد چیشتومانە. لە لاین خزمەکانی حمە رشید خان نوسراویکی ئاوام بو هات

محترم کاک میرزا

ئەڵبتە ئاگاداری وەضعیەتی تا چ ئەندازەیک مشبوهە و نیمەش هەر وا لە ژیر مراقبە داین. بە بی معلوماتی حکومەت مانەوەی ئیرەت ئەبیتە هوی زەحمەتیکی زۆر. تکایە لەو بارەوە خۆت تی فکرە و مەی بەرە سەر شتیکی تر.

٩٤٨/٤/٨ فلان

لە کاتیکا کە لە ئیران بە ماڵەوە گەڕامەوە بو عراق لە دوایەی سەرکەوتنی هەوررازی نیوانی ئیرانو عراق کە پی یان ئەووت هەوررازی دی [ هەنگە ژاڵ]

مەفرەزەیکی ئیرانی مان هاتبونە سەر ری لە ناکاو کەوتین بەسەریانا. دایان گرتین بە تفنگ لەبەر ئەوەی کە من چەکم پی نەبو شەرم بو نەکرا. وە لە ڕیگای عراقیشم لی گیرابو ناچار بوم کە هەڵیم. من هەلاتم و ماچو مناکەم یان لەگەل چەند سیدیکی ئەو دی یە بە دیلی برد بو مخفری [ ئەنورا ] بە بارمتەی ٢٠٠

تومان لەو دی یە ڕایان گرتبون. منیش کە ئەو خەبەرم وەرگرت کەوا بە ٣٠٠ تومان بەرەلا نەکرین.
بە پەلەپەل هاتمەوە عراق چوم بو لای خزمەکانی حمە رشید خان لە گەورە و بچوکیان داوای ئەو پارەیەم کرد کە بنیرین بو وی [ ئەنور ] بو نامر مخفەرەکەی ئەوی. بو ئەوەی مالو منالەکانم ئازاد بکات بە داخەوە هیچ کامیکیان دەستە بەری ئەو پارەیە نەبون ئەو نوسراوەشیان لی نوسی بوم.

جنابی میرزا

نوسراوەکەت وەرگیرا. بە داخەوە لە ڕیگای ملیەت دوچاری ئەو حالەتە بووی. نابی گلەی لە ئیمە بکەیت. چونکە دوچار بونت لە ڕیگای ئیمەوە نەبوە. پارەش مان بە دەستەوە نیە والا دریغ مان نەنەکرد. ئیتر ئیحترام
٣٠/٤/ ٩٤٨ فلان
حمە رشید خان خوی لە ناوە نەبو ـ لە [ رومادیە ] دەست بەسەر بو ئەو ئاگاداری ئەو ڕوداو بەسەرهاتە نەبو لەو بارەوە هیچ گلەی لی ناگری.
لە هەمان ڕوژا چوم بو لای شیخ قادری چویسە بو ئەو پارەیە وەکو ڕیویەکم لی هات کە کلکی براپو. هەر ساتە ئەیان نارد بو شوینیک بو ئەوەی کلکەکەی بدەنەوە.
شیردا بو دایە پیردا دایە پیر کلکە قولی وە مام ڕیوی دا.
شیخ قادر بە گورجی ناردی بو لای [ئەحمەدی مینە ڕەندانی لەنگە دی] ئەو پارەیەی پیک هانی وە بەدەرویشیکا ناردی بو کویخا عزیزی گیلە ـ کە بیدات بە نامر پوستی ئەنور ـ بو برەلا کردنی مندالەکان بەلام بەدبەختانە هەتا ئەو ڕیسەوکوریسە کرا ـ منالەکان بەڕی کرابون بو شاری بانە ] وە لەوی [ حاجی ما دلی خندانی ] لە پیاوە بە شەرەفەکانی شاری بانە ئەبی بە کفیلی ١٢ هەزار تومانیان وە ئەیانیاتە مالی خوی. و کاک عبداللە ئعلبندیش یارمەتی باشی دابون. ئەمجا دەرگای مخابرات لە نیوانی حکومەتی عراق و سلطانی ئیرانیدا کرایەوە بو وەرگرتنەوەی ئەو ٦ نەفەرەی خوارەوە.

١- بهی - خیزانی میرزا مەنگوری
٢- احمد کوری میرزا مەنگوری
٣- ناسوی کچی "
٤- ایران " "
٥- رحمەی خەسوم
٦- صبری ژن خوشکم

لە پاش ٧ مانگ امجا عراق توانی ئەو ٦ نەفرە وەر بگریتەوە بە سەلتو قولتی.

ئیرانیەکان ئەو خیزانەیان لە بارمتەی ئەو پیاو کوژراو و ژن هەلگیراوانە گیرابوو ـ کە آغای ئەنوەریکی کوری حمە رشید خان بو ابراهیم بگی مامەی و لە دی بیاندەرەی ـ سەرشیوی ئیران بە ئەنجامی هینابو. لەپاش ئەو هەمو دەوری بی مروەتانە ئەنجا خیزانەکەم لە پیناوی ئەوان خانەبەند کرابون.

جا ئەگەر لەبارەی کەم هەتی ئەو ئاغایانە وە من تێزلەستینی بکەم مانای ئەوەیە کە من هرگیز خذمەتم بە نیشتمان و راست وێژی نەکردوە. وە لە ریگای ئەدیبی و نوسری و بویژی لام داوە.

جا ئەمەوی هەمو رووداویکی ئەو بەسەرهاتی کوردستانە. بە گویرەی رووداو بگیرمەوە وە لاین گری راست و ئینصاف پەرستی بکەم ئەک مادە پەرستی و ریابو خەیانەت کاری. ئەمەوی وەکو رەسامیک بە کامیرای واقع سات بە سات وێنەی ئەو کەسانە بکرم کە لەگەل ئەو شورشانە تیکل بوون.

ناوبانگی ملا مصطفی و حمە رشید خان لەو کاتە

١ - خزمەکانی حمەرشیدخان زۆر بەتەماع بون. وە بە هیوا و ئومیدی تەماع بو حمەرشیدخان ئەهاتنە جبهەوە.

زوربەی لشکرەکەی حمەرشیدخان لە بگو ناعوات پێک هاتبو ئەوانەش ئەبو هەمویان لە مالی خەلک باخلیان پر کردایە.

راو و روتو بی فەری ئەوانە ببو بە هوی ناوبانگی ناشیرینی

حەمەرشیدخان.

لەو دەورەدا حەمەرشیدخان بو یەکێکی لە خزمەکانی دێ [گۆلان] نوسیبو کە بەخۆیو دەستە و دایرەکەیەوە لە تیهران نیلتجائی پی بکات. آغای اوبراو لە وەلاما بوی نوسیبوو ئەگەر دێ بکم لە [دێ یە] کانی حەما آغای سەرا نەدەیتی ئەوا دیم بو لات وە لە پی چەوانەی ئەوەدا پان بەخشە.

بەلام لەشکری ملا مصطفی لە غیرەز ملا مصطفی زیاتر دەم راستی تریان نەبو. شیخانی بارزانی ئیمتیازێکی دینی وە مقدس یان هەبو بەسەر هەمو عشیرەتەکەیانەوە.

مللەتی بارزان بەرامبەر خۆشەویستی خانەوادەی بارزان ـ لەو پەری پەرستن دا بون. مصالحی مللەتی بارزان پێشکەوتن وەسەربەرزی خانەوادەی شیخانی بارزان بو نەک شتێکی تر.

دەستەی حەمەرشیدخان لەسەر ٢٠ کیلو شەکر محاسبەی حەمەرشیدخانیان نەکرد. بەلام مللەتی بارزان لە مقابل ٢٠ هەزار تومان داوای نانێک یان لە ملا مصطفی نەنەکرد.

٢ - لە ئاژاوەی شهری وەری ١٩٤١دا بە هۆی هەندی کردەوەی ناشیرینی هرمەکانی حەمەرشیدخان. ناوبانگی حەمەرشیدخان بە تالان چی و پیاو خەراپو لەماع کار بلاو بوبوەوە. عشائرەکانی ئیران حەزیان بە نفوزی حەمەرشیدخان نەنەکرد لە ئیرانا.

بو ئەوە پەلەقاژەیان ئەکرد کە حەمەرشیدخان لە حکومەتی قازی محمدا پیش نەکەوی چونکە حەمەرشیدخان شارەزای هەمو هەستونەستێکی عشایرەکان بو کە تا چ ئەندازەیەک دەستی فرۆلێل یان هەیە.

ملا مصطفی تازە هاتبو ئیرانەوە. هیچ کەسێکی تووشی ئازار نەکردبو ناو بانگێکی مللی تازە بە تازەی بە دواوە بو.

عشائرەکانی ئیران ملا مصطفی یان هان ئەدا کە شتێکی و ابکات کە حەمەرشیدخان نخریتە ژیر چاودێری حکومەتی مهابادەوە. بو ئەوەی کە لە هارایکی شیراوا دزی بکەن. وە لە ناوی لیلا ماسی بگرن.

٣- حمەرشیدخان ـ بەرامبەر بە دەستەی خویندەواری زور ئاشنایەتی نەبو، وە گیانیکی سەرکیشی و غروری تیا هەبو. هەمو شتیکی بە بی نرخ هەل ئەگرتەوە.

بەلام ملا مصطفی بە پیچەوانەی ئەو بو. هەر لە زووە لە شتی بچوکی ئەکولیەوە ئەی ئەویست زل بی. وە لەگەل دەستە و دایرەی خویندەواریدا زور ئاشنا بو. وە لە هەمان کاتا رئیسی حزبی دیموکراری کوردستان بو کە لەو کاتەوا بە ئیضافەی هیزی لشکرکەشی و تەوانای خویەوە. حزبیکی گەورەی دیمکراتی کورد پشتیوانی لەناو بانگو بیر و باوەری ئەکرد.

٤- حمەرشیدخان علاقەیکی مادە پەرستی هەبو ئەیەویست شعور و دەسەلاتی عشائری و دەولەمندی خوی بپاریزی. و ملکو دیهاتەکانی ئاوەدان وە زورتر بکات.

بەلام ملا مصطفی ئاوبانگی مدەنی و قومیەتی پی لەو شتانە باشتر بو وە زور بە تەنگ دەولەت و ملک و [مەر] داریەوە ئەبو. چونکە تەبیعەت وای هینابو کە شیخانی بارزان خزیان لەگەل دیهات و ملک داری ئەبی. هەتا بە هەمو شیخوکانی بارزان. لە بارزانا باغیک ـ یان هەیە. ئەهمیەتیان بە دەولەمەندی و ئاغایەتی ئەداوە. چونکە هەمو مللەتی بارازانی خزیان بە ملکی شیخانی بارزان زانیوە. وە شیخەکانی بارزانیش خویان بە مالی مللەت زانیوە بە بی فەرق و نیوانی.

ئەو شتانەی خوارەوە بو ئەتەهوی ئەوەی کە ناوبانگو بیر و باوەری حمەرشیدخان و ملا مصطفی ـ بەیەک تەرازو ئەکیشرین لەو کاتەدا. ملا مصطفی بی ملکە ـ حمەرشیدخان خاوەنی ١٢ دی یە. ملا مصطفی جەنگی لگل عراقا کردوە ـ حمەرشیدخان هیچ تهمتیکی عراقی بەسەرەوە نیە.

ملا مصطفی ـ حکمی اعدامی عراقی بو دەرچوە ـ حمە رشید خان هیچ تاوانیکی عراقی بەسەرەوە نیە

ملا مصطفی ـ بوچونە روسیای ناچار بو ـ حمەرشیدخان هیچ حکمیکی چونە روسیای بەسەرەوە نەبو. خوی بەناچاری ئەو کوچە نەزانیوە.

هاتنەوەی حەمەرشیدخان بو عراق ـ وە چونی مەلا مصطفی بو روسیا هەر یکەیان بەستراوە بە سەهاتیکی قولو دریژ. وە پەنجەیکی تجباری و ناچاری هەر دوکیانی بەم ریگایانەدا بردوە بەریدا. کە ئەویان کەوتوتە ناو دەولتیکی سوسیالیستی. و ئەویشیان هاتوتەوە ناو باوەشی دەولەتیکی استعماری و امپریالیزمی. لەوە زیاتر بە پی ویستی نازانم کە ئەو باسە لیک بکیشمەوە. و محکمەی ناوبانگی ئەو دو جەنەرالەی قازی محمدی پیشەوای کوردستانی مهاباد ئکەم.

تاوانی حەمەرشیدخان لەناو کوردستانی مهابادا

حەمەرشیدخان لە ئیرانا لە حکومەتی قازی محمدا ـ بەم تاوانانەی خوارەوە تاوان بار کرا بو.

١- سێ هەزار تومان و سێ تفنگی لە ئاغامامندی یازی بلاغ] ناوچەی سقز ساندوە

٢- شەش تفنگ و هەزار تومانی لە علی رضا خانی ئاردەلانی ـ ساندوە

٣- هەزار توانی لە شیخ اسعدی ئاغای دی کەس نەزان ساندوە

٤- سیصد سەر حیوانی لە ئاغواتی ناوچەی گەورکی سقز ـ ساندوە

٥- دە هەزار پوت گەنمی لە حما آغای سەرا چنگ کوتوە لەگەل واریداتی [٧] دیدا.

٦- ٢٠٠ لباد و ١٠٠ لیفە و ٤٠ بەری لە خەلکی دەور و پشتی ناوچەی سقز ساندوە.

٧- زەخیرەی ١٥٠٠ نەفری وەرگرتوە لشکرەکەی ئەوەندە نەبوە

٨- دار و سوتەمەنی [تەپالەی] لە خەلک ساندوە

٩- گەنمی حمە امین خانی ئاخ کند] و حاجی سلیم خانی قشلاغ] و امیر خانی مرخوز] و ئاغا مامندی یازی بلاغی ـ دەست بەسەرا گرتوە.

١٠ نزیکەی ٥٠ تفنگی لە ئەهالی ناوچەی سقز ساندوە

١١- حما آغای سەرای تالان کردوە.

١٢- تفنگ و فیشەکی دیمکراتی خواردوە. فیشکی تەواوی بەسەر لشکرا دابەش نەکردوە

١٣- لە ٢٩ نیسانی ٩٤٦ دا نەی هیشتوە مصطفی خوشناو [گەلی باڵوقای احمد ناوا] بە جی بیلی و بچی بە هاواری بکر آغا ـ مانای ئەوەیە کە لگل قازی محمدا ڕاست نەبوە

١٤- لە ١٦ حزیرانی ٩٤٦دا کە شەڕی [مامشە] کراوە لەگەڵ ئیرانیەکانا. حمە رشید خان فیشکی نەداوە بە فەرماندەی ئەو ناوچەیە کاک مصطفی خوشناو. بو ئەوەی ئیرانیەکان سەرکەون و لشکری بارزانی شکست بی نی.

١٥- بە برواری ٢٨ تموزی ٩٤٦ نوینەرایکی گیراوە کە بو سەرهەنگ فیروزی ـ نوسیوە بو سقز.

١٦- بە برواری ١٠ / آبی ٩٤٦ چاوی بە [سید علی حجازی] فەرماندەی پولیسی بافستیانی ـ عراق کەوتوە لە دی [سیران بەنی ـ ئیرانا

١٧- ئاغا صالحی سلطان پەناه ـ گەورەی ناوچەی سەرشیوی سقز ـ کە نەهاتوتە ناو هیزی دینکراتی کوردستان ـ لەبەر حمەرشیدخان بوە

١٨- ئاغا رشیدی ـ تازە قەلا ـ بە فەرمانی حمەرشیدخان تفنگی پی ڕە نراوە

١٩- حمەرشیدخان بە فەرمانی انکلیسەکان چوتە ناو دیمکرات وە بە فەرمانی ئەوانیش گەڕاوەتەوە بو عراق.

٢٠- مخابرات و ئیخباراتی ئیدارەی لشکری فەرماندەیەتی لەگەل خویا بردوتەوە بو عراق نەی داوەتەوە دەست جی نشینی خوی لە [سەرادا ـ مانای ئەوەیە کە بو انکلیسەکانی بردوتەوە بو عراق.

جا حمەرشیدخان لە پاش ئەوەی کە گەڕایەوە بو عراق ئەو شتانەی سەرەوەیان بو کرد. بە تاوان وە بەتار و موسیقای هەمو کوردیکی ئیران لی نەدرا.

جا لەبەر ئەوەی کە من ئاگادار بووم بەسەر ئەو ڕوداوانەدا ئەوا وەکو

روداوەکانی تر لە ریگایکی راستو زەمیر پەرستیدا بوتانی رون ئەکەمەوە. هەر وەکو کە لە مهابادا بو دایرەی پرسیاری تای بەتی قازی محمدم رون کردوتەوە.

بەرگری لە تاوانەکانی حمە رشید خان.

١- آغا مامندی یازی بلاغ ـ کەسیک بو ئیرانی پەرست. وا بلاو بوبووە کە موچەی سیخوری و نهینی لای حکومەتی سلز هەیە.

لە روداوی شهری وەری ١٩٤١دا کە حکومەتی ئیران ئیعادەی تشکیلاتی بانەی کردەوە لە ٩٤٤ دا ئەو آغایە پیش لشکری ئیران کەوتبو لەگەل عشائری [ تیلەکو] دا دیهاتی ـ ئەنور ـ کیلە ـ خورپادا ـ یان سوتاندبو. کە ئەو دی یانە پەی وەندیان بە حمە امین خانی قادر خان زادە ـ و حمە سعید بگی ـ مامەی حمەرشیدخانەوە هەبو.

لەکاتی کە حمەرشیدخان لە ٩٤٦ دا هاتە سەرا وە بو بە فەرماندەی لشکری دەولەتی قازی محمد. عشائر و پیاوە ناسراوەکانی ئەو ناوچەیە هەمویان بو پیروزیادی ئازادی کوردستانو تشکیلی لشکریان لەوناوە، هاتنە سەرا. بەلام آغا مامەند گوی نەدایە ئەو مراسیم بە جی هینانە.

بو چاو ترسانی ئەو وینە دەولەت پەرستانە حمەرشیدخان ئەو پارە و تفنگانەی لی ساند. پارەکەی کرد بە مصرفی لشکر و تفنگەکانیشی دا بە شەرکەرانی بی چەک.

٢- علی رصا خانی ناردەلانی ـ ناوی بە ئیرانی پەرست بلاو بوبووە. بەلام حمەرشیدخان لە لای قازی محمد زەمانەتی پاکی بو ئەو آغایە وەر گرت و کردیان بە رئیس حزبی دیمکرات لە ناوچەی سلز. وە بە دوستایەتی حمەرشیدخان ئەو آغایە بەرز بوبووە.

لە سەر ریز و عادەتی ئیرانی بە ناوی مهمان پەزیریو ئەرکی یارمەتی هەر لە خویەوە هەزار تومانی بو حمەرشیدخان هینابو. وە بو حسابی تفنگەکانیشی لە روژی ٣٠/٤/ ٩٤٦ دا میر حاج و بکر آغا فەرماندەکانی لشکری بارزانی

راپوریکی دو و دریژیان بو حمەرشیدخان نوسیبو. کە خەلکی مەرخوز ـ آخ کند ـ نالتون ـ بازی بلاغ ـ قشلاق ـ لە شەری روژی ۲۹/ ٤ / ۹٤٦ بە هاوری بەتی لشکری دەولەتی شاهنشاهی جەنگیان لەگەل لشکری دیمکراتا کردوە. لەبەر ئەوەی کە بروا بە چەکداری عشائری ئەو دی یانە ناکری. وای بەباش ئەزانین کە چکداری ئەو دی یانە لە چەک روت بکرینەوە

ئەمجا حمەرشیدخان ئەو راپورەی بە همندی دەست کاری وە نارد بو قازی محمد وە داوای لی کردبو هەتا چونی حزبی دیمکرات بو ئەو ناوە وە دلخل کرانی خەلکی ئەو دی یانە بو ناو حزب وای بە باش ئەزانم کە چەک لە چەکدارەکانی ئەو دی یانە وەر بگریتەوە.

لە ناکاما ئەوەی چو ناو حزبەوە تفنگەکەی بدریتەوە. و رونوسی ئەو نوسراوەشی دا بە فەرماندەی هیزی بانەی عبدالله بگی سرحدی) کە لەگەل آغای میر حاجا ـ دەست بکەن بە کو کردنەوەی چەک. بە پی مستند وە تسجیلی ژمارە و ناو نیشانی تفنگەکانیان.

بەلام لە پیک هاتنی تشکیلاتی حزبی تفنگەکان بو خاوەنەکانیان لعادە کرانەوە تەنیا ۱۵ تفنگی محمد امین خانی ناخ کند و امیر خانی مرخوز ـ نەبی هەروا لای حمەرشیدخان مانەوە. هەتا قازی محمد دو سێ جار بو ئەو تفنگانە حمەرشیدخانی هەل پی چا. بەلام حمەرشیدخان هەر گوی نەئەدایە ئەو باسە چونکە ئەو تفنگانەی دابو بە پیاوەکانی خوی و ناردبونی بو جبهە هەتا لە روژی ٩٤٦/٩/١٤ دا لە (گەمارو) درانی بوسطی) میرەدی ـ ۷ پیاوی لە هەلگری ئەو چەکانە شهید کران و چەکەکانیش یان کەوتبونە دەست سەربازی ایرانیەکان و هەلگری ۸ تفنگەکانی تریش هەر یەکەیان بەلایکا بلاوەیان پی کرابو. لە وەختیکا قازی محمد داوای ئەو چەکانەی لە حمەرشیدخان کردەوە کە لشکرەکەی حمەرشیدخان بلاوەی پی کرابو. نەی توانی ئەو ۸ تفنگە دەست بخاتەوە.

ئەصلا لە کاتی خویا حمەرشیدخان بو قازالجی لشکر ئەو تفنگانەی بەسەر خەلکا دابەش کردبو. لە دوایشا کە لەگەل قازی محمد نیوانیان روی کردە

ساردی بۆ ڕانەگەی کە تفنگ چیەکان بدۆزیتەوە و چەکیان بکات ئەو تاوانە لە مل خوی داماڵی.

٣- لە دێ کەس نەمزان ـ لە ناوچەی سەقز ـ حەمەرشیدخان هەندی زەوی کشتوکاڵی هەبو [ شیخ اسعد و شیخ حامد ] ناوان دەست یان بەسەر ئەو زەوی یانەدا گرتبو. چەند ساڵ بو واریداتی ئەو زەویانەیان نەدابو بە حەمەرشیدخان هەزار تومان یان لە جیاتی واریدات بو هینابو ـ ئەم هەزار تومانە ورادتی ملک بو نەک تعدا و زۆرەملی.

٤- حەمەرشیدخان ٣٠٠ سەر حیوانی لە ئاغواتی گمورکی ئیران ساند بەناوی یارمەتی لشکرەوە. وە لە وەزیری جەنگیش موافقەتی کۆ کردنەوەی ئەو حیوانانە وەرگیرابو.

میرزا هاشمی هەزەی] فەرماندەی هیزی گلۆلان] ماموری کۆ کردنەوەی ئەو حیواناتانە بو. لەو حیوانانانە ٥٠ سەر درا بە لشکری بانەی و ٢٥٠ سەریش بە لشکری بارزانی. بە موری ناظر خەرجی بارزانی آغای میرزا حسین نالبندیان ـ تا وتو کرا.

٥- حما آغای سەرا کە دیهاتەکانی خوی بە جی هیشت وە چو بو ناو حکومەتی ئیران. نزیکەی ١٠ هەزار پوت گەنم و جوی لەسەرا و دیهاتەکانی ترا بە جی هیشت. بەڵام لەبەر ئەوەی کە حەمەرشیدخان میوانداریکی زوری لشکری بەسەرەوە بو. و هیچ ڕینە موجە و بەراتیکیشی لە لاین قازی محمدەوە بو دیاری نەکرا بو پی ویستی سەرلی سەر ئەوەی کرد کە ٣ هەزار پوت لەو گەنمە بفروشی هەر پوتی بە [ ٥ ] تومان بو مخارجی قوناغ و میوانداری ئوردوبەزەکەی.

وە بەر ماوەی گەنمەکەی تریش بو لشکری بارزانی بانەی فیض الله بیگی ئەرخان کرد، و هندیکیشی لە جیاتی موجە و بەرات دابە نوکەر و دەست و پیەکانی لشکر.

حەمەرشیدخان ـ بو صرف و قبض ئەو گەنمە لیژنەیکی لە ئەندامی حزبی سەرا پیک هینابو کە سەروکەکەیان قازی عبدالرحیم ناو بو. ئەو لیژنەیە لەو

فەرمانانە مسئول کرابون.

لە وەختێ خویا خیزانی حمەرشیدخانو براو خزمەکانی لە عراقەوە فراوا هاتنە ئیران لە سالی ١٩٤٥دا قازی محمد ئەو دیهاتانەی بەرەو روی حمەرشیدخان کردەوە کە واریداتەکەیان وەربگری بۆ خۆی. بەلام لە واریداتی ئەو سالە بقایکی کەم لە لای خەلک مابوەوە. لەسەر ئیعترافی مختار وە وکیلی حما آغا ئەو بقایەیە لە خلک وەرگیرا کە ئەوە رسمیاتیکی نیوانی آغا و فلاح بو. کە داب بو لە هەمو دیهاتیکی ئیرانا. وەکو [فروجانە] رونانە] سالی لە ٣ تومانەوە هەتا ٢٠ تومان ـ بە پی نسبەتی چاکو خەرابی زەوی.

جا ئەگەر لەوە پتر شت وەرگیرابی نەدراوە بە حمەرشیدخان ئەو لیژنەیە مسئولن لەم تفت و توانایەدا ـ

٦- وەختێ کە بارزانیەکان خرانە جبهەوە ئەوەڵی بهار بو زور سەرما بو. بارزانیەکانیش زۆر پوشتە نەبون. نەخوشی و هەژاریان زۆر بو. حمەرشیدخان ناچاری ئەوە کرا کە ٢٠٠ لباد و سەت لیفە و ٤٠ برە و ٢٠ لەردەجی و هەندێ سەرین وە کەلوپەلی پی خەف بەناوی ئەمانەتەوە لە خەلکی ئەو ناوە وەربگری و بیدات بە لشکری بارزانی. ئەو شتانە هەتا نهایەت هەر لای لشکری بارزانی مانەوە. بەلام لەبەر ئەوەی کە بە ناوی حمەرشیدخان وەرگیرابون عیبەکەی بەناوی ئەوەوە بلاو بوبوە. لەبەر هندێ ظروفی ناهەموار نەتوانرا ئەو شتانە بدریتەوە بە خاوەنەکانیان.

٧- لە هەوەڵەوە قازی محمد لە حمەرشیدخانی داوا کرد کە زەخیرەی دەوڵەتی بو لشکرەکەی وەربگری. بەلام حمەرشیدخان ئەوی ویست ئەو ئەرکە نخاتە سەر گەنجینەی کوردستان. لەشکرەکەیان هەر بە خەلکی ئەو ناوە بەخیو ئەکرد بەلام لە دوای ٦ مانگ حمەرشیدخان داوای زەخیرەی لە قازی کرد بو ئەوەی خەلکەکە نەختێ وەچان بدات.

ئەمجا قازی محمد نازر خەرجیکی سابلاغی بەناوی [خاتەمی] ناردە سەرا لە دەوری ئەوەڵا بو ٢٠ روژ خوارەباری ٩٠٠ کەسی دا بە حمەرشیدخان بەناوی لشکری بانەی و فیض الله بگی ـ گەورک ـ غەوارە وە لە جاری

درهەما بو ماوەی ٢٥ روژ خواردنی ١٥٠٠ نەفەری وەرگرت.

اصلا خانەوادەی حەمەرشیدخان لە داخلی مالی خویانا ٧٥ کەس بون بی جگە لە میواندار کە تیکرایی روژی نانی دوسەت کەس لە مالی حەمەرشیدخان دروست ئەکرا.

حەمەرشیدخان هیچ وینە یارمەتیکی لەلاین قازی محمدەوە نەئەدرایی تنها ئەو واریداتە نەبی کە لە دی پەکانی حما آغا وەری ئەگرت. و جاریکیشی ٣ هەزار تومانی نقدی لە قازی محمدەوە بو هاتبو. جا ناچار بو کە لە خواردنی لشکر تامین ئەو خواردەمنیە بکات کە لە مالو دیوانخانەکەیا بو لشکرچیان و علاقەداری فەرمانی دیکراتی بەخش بکات کە بو ئەنجامی فەرمانی رەسمی ئەهاتنە سەرا.

لشکری حەمەرشیدخان ئەگەر ١٥٠٠ کەسیش نەبوبی شتیکی وای فەرق نەبوە چونکە ئەو موجودە لە سەر تقریری فەرماندەکانی جەبهە نیشان ئەدرا. حەمەرشیدخان لە مەودای ٩ مانگا تەنیا ٤٥ روژ خواردەمەنی لە قازی محمد وەرگرتوە. باقیەکەی یا لە سەر حسابی خوی وە یا حما آغای سەرا وە یا ئەهالی دیهاتەکان ژیاوە.

٨- لە ناوچەی بوکانا ـ داری سوتاندن نیە. هەمو خواردنیک بە ئاگری [ تەپالە ] پیک دیتن. جا مادەی سوتەمەر و لەو ناوەدا شتیکی گرنگە هەمو مالیک دستە بەری ئەوە کراوە کە سالی [ چەند تغار ] تەپالە بدات بە ئاغا. جا بەرماوەی تەپالەی ـ حما آغا لەسەر دیهاتەکانیەوە چی مابوە حەمەرشیدخان لی ساندن کە فەرمانی خواردنی لشکری پی پیک بی نی. جا ناحەزەکانی حەمەرشیدخان لە دواروژا ئەو باسە پوچەیان بو کرد بو بە شهید کرانی [حسن و حسین]

شورش لە هەمو کاتیکدا شیرازەی هەندی یاسا و عادەتی پساندوە. ئەلمانیا بەم هەمو قانونو صنعەت کاری و کونیەوە. لرن یان بو خەلک داناو پیرو منالو دیلی وولاتانیان ئەخستە ناوەوە. وە تالانی مجوهەرا توشتی بەنرخی مللەتانیان ئەکرد.

ئەم هەمو تالانو کوشتار و خەلک و وەلات سوتانەیان بە قەدر تەپالەکانی حەمەرشید ئەهمیەتی پیدا نەکردوە کە بو فەرمانیکی پی ویستی سەربازی و شورش بەکار هینراوە.

٩- فەرماندەی هیزی بارزانی لکی [٢] میر حاج راپوریکی دا کە آغایانی امیر خان ـ حمە امین خان ـ حاجی سلیم خان ـ هەلاتوون بو سقز ـ لە دی یەکانیا گەنم هەیە. کە بەناوی خزیانەوە کردویانەتە چالٚ حەمەرشیدخانیش بوی نوسی کە گەنمەکانیان دەر بهینن وە لە ژیر ماموری دابەش کردنی خواردەمەنی دەولەتی [ حسین نالبندیدا] بو بارزانیەکان بکەن بە نان. حەمەرشیدخان لەو باسە هەر بە نوسین ئاگادار کراوە بو ئەو فەرمانە نەک بە عمل.

١٠- چەک ساندنەوەی خەلکی ئەو ناوە لە سەرا راپوری فەرماندەکانی بارزانی بو وە لە مادە [٢] دا ئەو باسەمان بە عرض گەیاندن.

١١- حما آغای سەرا لە هەوەلی شهری وەرا زور کومەگی بە تیرانیەکان کردبو و زور [شاە] پەرست بو. چەند کەرەت لەگەل حەمەرشیدخانا پەیمانی هاوبیری بەستبو بەلام تیکی دابووە.

لە ٥ مارتی ١٩٤٦دا حەمەرشیدخان لە سەر فەرمانی قازی محمد بە ٢٥٠ نەفەرەوە لە دی [تورکمان کەندیەوە] چو بو دی سەرا. بەلام پیش ئەوەی کە حەمەرشیدخان بگاتە ئەو دی یە. حما آغای سەرا هەر چیکی نەخت و پولێی هەبو رای گویزتبو. چەند شتیکی نیوداشتی لە مالو دیوانخانەدا مابوو. شتەکانی بریەتی بون لە ١٢ تفنگی پیاوەکانی و ١٢ تاک فرش و بەرەی نیوداشت ١٠ تاق لیفە و دوشەکە و سەرین و هەندی کورسی و سینی و مەنجەل و صندوقی پولا و صندوقی دار و هەندی فخفوریات و کەلوپەلی نان خواردن.

کە ئیمە چوین بو سەرا خیزانەکەی حما آغا ـ لە سەرا مابو ئەو ژنە زور بە ویلیکی ریزدارانە خذمەتی ئەو ٢٥٠ نەفەرەی کردین وە نانو خوراکی مرەتمی

٣ جەمی نەداینێ بۆ مەودای ٤٠ ڕۆژ لە دوای ئەو مودەیە داوای اجازەی ڕۆیشتنی لە حەمەرشیدخان کرد. آغای حەمەرشیدخان دەسەلاتی دا بەو ژنە کە چی لەگەل خۆیا نەبات بی بات.

دە گامیش ٣٠ سەر ڕەشە وەلاغ ١٠ ماین و ئەسپ ٦ ئیستر ٢٠٠ سەر حیوانی لەگەل خۆیا برد. تەنیا فرشەکانی دیوانخانەی لەگەل کەلوپەلی ئاشخانە بۆ حەمەرشیدخان بە جی هیشت.

بەلام لەو دوایەدا لە زدی حەمەرشیدخان جبهەی کردبووە. بارزانیەکانی لە حەمەرشیدخان هان ئەدا. پیاوی مدەبری دروست نەکرد سکالای پی ئەنوسین لە دژی حەمەرشیدخانو ئەیدا بە قازی محمد بۆ ئەوەی ناوبانگی حەمەرشیدخان بشکین.

حەمەرشیدخان لەو سکالا و شکایەتانەی حما آغای عباسی ڕەنجا کە گەڕایەوە بۆ عراق چەند فەرشیکی حما آغای لەگەل خۆیا بارکرد.

حەمەرشیدخان تا حەدیک بەرامبەر بە حما آغای سەرا تاوانبارە. چونکە بۆ کەسیک کە داوای زەعامەت و گەورەی بکات جوان نیە تەماع بکاتە مالی خەلک بە هەر وینەیک کە بەدکاری لەگەلا کردی هەمو تالانەکەی حما آغا پای ٢٠ هەزار تومان نەبو کە حەمەرشیدخان بردی بۆ عراق. نە ئەبو لەبەر ریزی عشائرەی وە ناوبانگی کوردایەتی و فەرماندەی لشکرەکەی دەستی بۆ ئەو نیشە بردبایە. بەلام لیرەدا حەمەرشیدخان وا حالی بوبو هەرچیکی کە لە مالی ح.ا اغا بە جی هیشتبایە بارزانیەکان ئەیان برد وە بە ناوی حەمەرشیدخانیشەوە عیب داریەکەی تەواو ئەبو. حەمەرشیدخان ئەگەر مەبەستی ئەوە بوایە. ئەی توانی لە کویخا و ڕیش سپی ناوایی لیژنەیەک پیک بینی شتەکانی حما اغایان مقابل بە مستند و مدرک بداتەوە دەست وە مدرەکە بخاتە باخەلی وە لە ڕوژیکا حما آغا ئاگادار بکاتەوە بەم ڕوداو و دەور و تسلیمە بەلام سەرکیشی و لە خۆ باهی حەمەرشیدخان ئەو وینە مراسیم و دەورانەی بەلاوە پوش بو. هەر بویە بە مکروفونی پروپاگندە ئەو نیشە

بچکولانەیان بە تالانو چەتەگەری بو بلاو کرایەوە.

هەر چەندە حەمەرشیدخان بەو شتانەی کە باسمان کرد دەستی لە حمە آغا عباسی ـ وەشاند بەلام حکومەتی عراقیش لە پیناوی سەفەری دیکرات وە کوردستانی قازی محمدا ـ هەلی لە حەمەرشیدخان دی و مالی حەمەرشیدخانی لە وینەدار و خانو پینجوینا تالان کرد کە زەرەرەکەی تقدیر نەکرا بە ۳سێ چەندانی دەست کەوتەکەی

۱۲ - حەمەرشیدخان لە دیکرات چەکی وەرنەگرتبو. چەند جار بو قازی محمدی نوسی بو ۱۵۰ تفنگ کە پیاوی بی چەکی هەیە پرچەکیان بکات. لە بەلێن زیاتر هیچ چەکی نەدرایی.

بە بڕواری [ ٥ ] نیسانی ۹٤٦ حمە حسێن خانی سیف لەگەل [ وارشینوفی روسی ـ و کاک آغا ] ڕوا هاتنە سەرا (۱۱) تفنگی برنەو (۲) تاتیریان بە خەلات دا بە حەمەرشیدخان. وە ئەویش بەسەر خزمەکانیا دابەشی کردن.

لە وەختی خویا بە هوی سەرکەوتنی بارزانیەکان بەسەر هیزی دەولەتی ئیرانا لە ناوچەی [ قارەوا ] ـ قازی محمد چوار دەمانچەی تەماتیری بو ئەفسەرکانی بارزانی مصطفی خوشناو بکر آغا میر حاج [ وهابی حاجی علی آغای ] ڕەواندزی ناردبو بو حەمەرشیدخان کە دابەشیان بکات بە سەر ئەو ئەفسەرانەدا. بەرامبەر ئەو پیشکەوتن و ئازایەتیەی کە بە خرج یانداوە.

بەلام لەبەر ئەوەی کە ئەو دەمانچانە هیچ وینە نوسێن و مخابرەیک یان لەگەلا نەبو. حەمەرشیدخان وای زانی بو ئەمیان ناردوون. هەر گورج دابەشی کردن بەسەر خزمەکانیا.

لە دوایدا کە ڕون بووە ئەم دەمانچانە هی ئەفسەرەکانە و پەی وەندیان بە حەمەرشیدخانەوە نیە. حەمەرشیدخان نوسی بو قازی محمد کە ئەو دەمانچانەم زایە کردوە نیوە چوار دەمانچەی تر بدەن بەو ئەفسەرانە. چونکە لەڕوی سهوەوە دەمانچەکانیان نەگەیشتوتە دەست.

حەمەرشیدخان [ ٤٥ ] هەزار فیشکی بو هات کە بیدا بە لشکر. لە ژێر

معلوماتی [اسماعیل عارف] ناوی سلیمانی کە ماموری دابەش کردنی هواربار و فیشک و چەک بو لە هیزی حمەرشیدخانا. ئەو فیشەکانە بەسەر لشکری عشائرەکانا دابەش کران. بەڵام [٥] هەزار فیشک درا بە خزمەکانو لشکرەکەی حمەرشیدخان لەو ٤٥ هەزار فیشەکە. باوەڕ ناکەم کە لەوە پتر فیشک درابی بە حمەرشیدخان لە لاین قازی محمدەوە

ئەو چەکانەی کە هەتا دواڕوژی تورانی حمەرشیدخان کە لە سەری تاوان باریوە بریەتین لەو چەکانەی کە لەو جدولەدا نیشان ئەدرین.

| ژمارە تفنگ | وینەی چەک | لەکویوە دستی کەوتوە |
| --- | --- | --- |
| ١٢ | تفنگی برنەو | لە حماآغای سراوە |
| ١١ | " | لەلاین قازی محمدەوە پی بەخشرا بو |
| ١٥ | ستیر و پینج تیر | کە لە اهالی وەرگیرابووە |
| ٣ | ـ١ ـ برنەو سی تیر | آغا ماندی بازی بلاغ |
| ٢ | دەمانچەی تەماتیری ٣١ تیری | قازی محمد |
| ٤ | " " " | عاندی ئەفسەرەکانی بارزانی |
| ١ | رمشاشی دیکراتی بچوک | وەستاو و پەک کەوتو |
| ١ | " " " | لە شەری ئموتە گیرا بو |
| ٤٩ | هەموی | |

نزیکەی ٣ هەزار فیشک لە حما آغای سەراو وە عشیرەتە چەک کراوەکان بە حمە رشید خان گەیشتوە بە علاوەی ئەو پینج هەزار فیشەکەی کە لەمەرپیش باسمان کردوە.

حمەرشیدخان لەو ٤٩ تفنگو دەمانچە و تەماتیرانە تەنیا ١٠ تفنگ و ٢ دەمانچەی بردەوە بو عراق ئەوانی تر چنگ عشائر و چەکداری لشکر کەوت کە هەندیکیان لە شەرا کوژران و هەندیکیش یان دور کەوتنەوە چەکەکانیان اعادە ئەکردبووە حەقوابو حمەرشیدخان ئەو چەکانەی کە بردنیەوە بو عراق بو قازی محمدی ناردبایەوە. چونکە ئەو گلەی و نوسراوانەی قازی محمد بو ئەو چەند چەکە خوتیانە ئەوەی هەڵ نەئەگرت کە حمەرشیدخان ئەوەندەی خو پی وە

ماندو بکات. هەر چەندە کە بوشیانی بناردایەوە لە ناکاما هەر چەنگ عجممەکان نەکەوتەوە. چەنکە کە قازی محمد تسلیم بو نیرانیەکان بیانیگ یان بلاو کردەوە بو دانەوەی چەکەکان. خەلک بەهار تفنگی برنەوی بو دەولەت نەبردەوە. چەکەکانی قازی محمد هەموی کەوتەوە دست حکومەتی تهران.

لە روژنامەی نارتشی نیرانا بە بروارێ ١٥ بهمن ٣٢٥ بلاو کرابوە کە هەتا ئەو تاریخە لە کوردستانی مهابادا ١٧ هەزار تفنگ دراوەتەوە دست حکومەت.

قازی محمدیش شتیکی بی لطفانەی دەرحەق بە حمەرشیدخان کرد هە خوتیپکی راست ئەبوە قازی محمد ٢٠ و ٣٠ تفنگی خەلات نەکرد. حمەرشیدخانیکی وا خاوەن دستە و حزمو لشکر وە فەرماندەیکی وا زلی جبهە. باوەری ١٥٠ تفنگی پی نەندەکرد. وە هەمو روژیکیش نوسراویکی نەکردە سەر بو ئەو چەند تفنگە قاپوریتا شکاوانە.

وەختە پیاو بلی کاشەکی هەمو تفنگەکانی قازی محمد چنگ حمەرشیدخان کەوتبایە. هیچ نەبایە نەندەکەوتنەوە دست نیرانیەکان کە کوردەکانیان پی بکوشتایە.

١٣ - شەوی ١٠/ ٢/ ٣٢٥ کە ریکەوتی ٣٠ نیسانی ٩٤٦ نەکات کە لە (قارەوا) ی سقز لە نیوانی بکر آغای لکی ٤ بارزانی و حکومەتی تهران کرا لە سەر پیلانی حکومەتی نیرانو عشیرەتی دیبکری ـ بو. عشیرەتی دیبکری لگل حکومەتی نیرانا ریک کەوتبون. هەر گا حکومەت توانی لە جنوب وە روژهەلاتی سەراوە ـ پەلاماری نوردوبەزی سەرا بدات. عشیرەتی دیبکریش لە شمال و روژآوای سەراوە پەلاماری بارەگای لشکر نەدات. و ئەو هیزە نەخوش و هەژارانەی بارزانی لەگل حمەرشیدخانا لە مەرکزی سەرادا بەدیل تەگرن لەسەر پیلانی ناوبراو دەولەتی تهران لە ساتی خویا پەلاماری هیزی بکر آغای دا لە (ملقرنی و بیژنگ بەسەرا) دیبکریەکانیش سێ روز پیش ئەو پەلاماردانە پردی میراوای ) بوکانیان سوتاندبو. خەتی هاتوچویان لە نیوانی سابلاغ و بوکان بری بو ئەمجا حمەرشیدخان تی گەیشت کە ئەو پەلاماردانە

لەسەر دمیەی دیکریەکانە.

مەترسی لەوە پەیا کرد کە نە وەکو لە پاشدا لشکری دیکری بێتە سەرا. دستوری دا بە مصطفی خۆشناو کە لە جێگای خۆی نەبزوێ وە بە کومەکی میر حاج و بکر آغاوە نەچیت. لە کەلی بالوقای احمد آوا ئیستحکامات بکات.

ئەگەر مصطفی خۆشناو ئەو شاخەی چوڵ بکردایە بە ئاسانی دیکریەکان ئەیتوانی بێنە بو سەرا.

دیسان چوڵ نەکردنی ئەو شاخە پشتیوانیک بو بۆ هیزەکانی میر حاج و کاک بکر. لەکاتی خۆیا ئەو باسە بە جوان تری ڕوون ئەکەینەوە. حمەرشیدخان بەرامبەر بەم تخطیط و نەخشەیە تقدیر ئەکری ئەک تەگدیر. بەلام دەستی غرمز لە هەمو کاتیکا بە پێی چەوانە شت هەڵ ئەگیرێتەوە.

١٤- شەڕی مامشاه ـ لە ڕۆژی ١٦ آبی ١٩٤٦دا کە لە نێوانی هێزی دەولەتی ئیران و لشکری دیکرات بو بە شەڕ. حمەرشیدخان لە بیستنی خەبەر بە تاقمیکی چکدارەوە چو بو کومەگی مصطفی خۆشناو هەتا کاتی ١٠ ئیوارە نەگەڕایەوە بو سەرا هەر لە نێو لشکرەکانا بو.

ئیرانیەکان لە چوار قولەوە پەلاماری هێزی دیکراتیان دابو بەم هیوایە کە خەتی نێوانی سقز و بانە و سرا و سابلاغ هەڵ بکرن

بێ فیشەکی بارزانی و لشکرەکان بوبو بە هۆی ئەوەی کە لشکری بارزانی و جبهەکانی تر خۆیان ڕانەگرن.

حمەرشیدخان لەگەڵ ٣٠ سوارەکەی خۆی هاتەوە سەرا بەم هیوایە کە عقب نشینیکی سەخت بکات لە کەلی (بالقوقا) و سەرا خوشی بە هیوای جەنگیکی گەورە بو. لەبەر ئەوە ئەی توانی بو فیشەکی ئەو ٣٠ سوارەی خۆی بدا بە مصطفی خۆشناو.

بارزانیەکان هەر ئەفرەیان ١٠٠ فیشەکی پی بو. بو شەڕ کردن لە بەرامبەر لشکریکی دوژمن کە بە ملیون فیشک یان پی بو.

لیرەدا حمەرشیدخان تاوانبار نیە کە فیشەکی پیاوەکانی نەداوە بە مصطفی خۆشناو چونکە ئەویش هەر لەم ڕۆژەدا بە هیوای شەڕ بوو. لیرەدا مسئولی

گەورە قازی محمد ـ بوە کە نەی توانیوە چەند صەندوق فیشەکی ئیحتیاط بنیری بو جبهە کە بە هەزاران صەندوق فیشەکی لە مخزەنەکانی مهابا دانابو سەر یەک.

۱۵- حەمەرشیدخان دەسەلاتیکی تەواوی دراوبوی کە مخابرە لەگەل فرماندەکانی دەولەتی تیران بکات.

جا بو لابردنی مشاکلی ریگاوبان وە نیشوکاری سەربازیو پشکنینی زور جار رەزم ئارا ـ رئیس ستادی لشکری تیران ـ سەرهنگ فیوزی سەرهنگ مغروری ـ سرهنگ غفاری ـ سەرگورد خاکسار ـ ئەهاتنە سەرا. و هەندی جاریش چاویان بە قازی محمد و حاجی بابەشیخ ـ ئەکەوت بەو بونەوە سەرا بوبو بە جیگای ئیتصالات و فیلی تیرانیەکان.

و تیرانیەکان لەوسەروبەندەدا زور تەلاشیان ئەکرد کە حەمەرشیدخان لە قازی محمد هەل بکەرینەوە. و حکومەت ئەو شتانەی خوارەوەی بو پیک بی ئی.

۱- هەمو مانگیک ۳۰ هەزار تومان موچەی هەبی

۲- ناوچەی سەرشیو و خۆرخورەی هەمو بدریتی

۳- کە لیک ئەمینن بون ـ بانەی بو چول بکەن. لەسەر ئەو شەرتو پەیمانەی کە لە وەختی خویا لەگەل سەرهەنگ ئەرفەعی ـ ریک کەوتن پیک هاتوە لە ۹٤۲

هەتا بو ئەو باسە محمد آغای عباسی ـ بە نهینی شەوی ۱۵ مارتی ۹٤٦ هاتبو [سەرا] وە چاوی بە حەمەرشیدخان کەوتبو. وە نوسراوی تای بەتی حکومەتی تیرانی بەم بەندانە بو هینابو

بەلام حەمەرشیدخان رەفزی ئەو دلخوازەی کردبو. ووتبوی من لە غیرەز پیشکەوتنی قازی محمد و ئازادی کوردستان شتیکی ترم مەبەست نیە تیرانیەکان زور لە حەمەرشیدخان ئەترسان ـ ناویان لی نابو [گورگی سیاه] گورگی رەش. چونکە لەهەسەرهاتی [بانەدا] زەربەی چاکی لە تیرانیەکان دابو. باوەریان وابو ئەگەر قازی محمدیش تسلیم بێ. حەمەرشیدخان جاریکی تر ئەو هیزەی بو تیران ئەترینیتەوە. هەتا نهایەت بەربەرەکانیان لەگەلا بکات.

جاریک سەرهەنگ فیوض ـ هاتە سەرا چاوی بە کوریکی ٩ ساڵانەی ئەنوەر بەگی کوری حەمەرشیدخان ـ کەوت کە ناوی ئازاد ـ بو ووتی ئازاد خان ـ کە چوەوە بو سەقز ـ صندوقیک توقلت ـ بو ئەنیرم سەرهەنگی ناوبراو کە گەرایەوە صندوقیکی بچکولانەی چیکولات ـ وە شیرینی بو ئازاد ـ ناردبو لەسەر بەڵینەکەی خوی.

لە لایکی ترەوە حەمەرشیدخان ٢٥ فەردە توتنی سپی لە ملکەکانی خوی لە عراقەوە بو هاتبو کە توتنی ووردەی سپی لە عراق بی ترخە. حەمەرشیدخان ئەو ٢٥ فردە توتنەی ناردبو بو سقز کە لە دوخانیانی ئیرانیەکان بوی لحص بکری

وە بو ئەو باسە نوسراویکی لە رئیس ستادی سقز سەرگورد خاکساری نوسی بو کە پارەی توتنەکەی بو تسلیم بە معتمد [علي رضا خاني آردەلاني بکات.

وە لە مقابل سەرهەنگ فیوضی ـ نوسراویکیشی بو ئەو نوسی بو سپاسی ئەو شیرینیەی کردبو کە بو ئازادی ناردوە. کاغذەکان دراپونە دست مەلایک کە بیان گەینیت.

لە پوستی مەلارمنی ـ ئەو نوسراوانە ئەکەونە دست مصطفی خوشناو بو ئەوەی کە حەمەرشیدخان سوکە بکەن. هەر دو نوسراو ئەنیرن بو ملا مصطفی و قازی محمد. و عبارەتو مانای قالەزەکانیان هەڵ گیرابوە سەر مانایکی خەراپ.

لیرەدا حەمەرشیدخان هیچ ریتە تاوان و فیڵیکی لەو دو نوسراوانەدا نەبو ئەگەر ویستبای خەیانەت بکات ریگای ئاسان تر هەبو کە پیا بروا.

حەمەرشیدخان لە ئیرانیەکان هیچ شتیکی چەنگ نەکەوتوە. ئەوەی کە بە شەر لی ئەساندبن.

بەڵام حەمەرشیدخان لە کاتی کە لە قازی محمد تورا و ویستی بگەریتەوە بو عراق. بواسطەی شیخ جلالی نقشبندی و علي جوانمردی ـ داوای پیک هینانی ئەو شروتانەی لە ئیران کرد کە لەمەوپیش عرضم کردن. بەڵام لە پیش ئەوەیا کە ئیران یەکان وەڵامی بدەنەوە حەمەرشیدخان گەرایەوە بو عراق. کە لە کاتی خویا بە دور و دریژی بوتانی ئەگیرمەوە.

١٦- بە بروارى ١٠/ ابى ٩٤٦ حمەرشیدخان ملاقاتى فرماندەى لشكرى پولیسى گەروك ـ سیارى بافستیانى ـ كرد لە دى سیران بەنى ـ بانە. لە نیوانى فرماندەى ناوبراو سید على حجازى و آغاى جنرال مايور حمەرشیدخان ريك كەوتن سەرى گرت. كە خان بگەريتەوە بو عراق وە نوسراويك لە نيوانى هەر دو لا نالوگورى پى كرابو بە مور ئمضاى هەر دو لا كە لە وەختى خويا عرضتان ئەكرى.

حمەرشیدخان بەرام بەر بەم هەنگاوەيەى زور تاوان بار نيە چونكە قازى محمدى لە خوى دلگیر كردبو ئيستقالەى لى قبول كرابو ـ وە بريار و بەندەكانى ئيرانيش جى باوەر نەبون ئەگەر هەلى عراقيشى لە چەنگ چوبايە ئەبو چى بكا و بو كوى چوبا.

جا لە دەورى ٣ هەما ناچارى ئەو مذاكرە و رى پاكردنەوەيە بوبو.

١٧- آغا صالح سلطان پەنا ـ لە پى يان ئەووت اغا صالحى رەنگەريژان ـ كە سيك بو بارە و بارگەر. وە بە هەمو هيزيك يەوە ئيران پەرست بو. موچەى ٦٠ نەفەر چكدارى بەناوى ئەمنيە ـ لە حكومەتى ئيران وەر ئەگرت. بە هيچ رەنگيك دوستى ديكرات نەبو وە حەزى بەسەركەوتنى قازى محمد نەئەكرد. بەلام هەندى فروفيلى كلاوسازى ئيرانيانەى بو ئەو باسە بەكار ئەهينا.

جا بو ئەوەى كە لە ناوچەى سەرشيوى سقزا نفوزى ئەو ئاغا صالحە تهديد بكرى. حمەرشیدخان هيزەى ناوخوى بو دروست كردبو. حمە صديقى سليمان خانى جافى ـ هينابو بو ئەو ناوە. وە ديهاتى خلوزە ـ دگاگا ـ كاوملیان ـ كە علاقەيكى جافەكانى بە سەرەوە بو دايەوە دەست حمە صديق خان وە لە بەرامبەر آغا صالحى ـ راوەستاند.

ئەمجا آغا صالح كەوتە پەلەقاژە. لە ژيرەو نوسراوى نارد بو قازى محمد كە وەرى بگرن بە لاين گيرى حزبى ديكراتى كوردستان. قازى محمد ـ موافقەتى كرد. آغا صالح هاتە دى سرا. وە لەوى چو ناو حزبەوە.

ئەمجا بو ئەوەى كە حمەرشیدخان و حمە صديق لەبەر چاوى قازى محمد

ناشیرین بکات دەستی کرد بە راپۆردانو افسادات کردن لە زور ریگای حساس و شارەزاوە.

رۆژی مرافعە بو محکمەی ملکەکانی حمە صدیق خان و آغا صالح لە سابلاغ لە لاین ئەنجومەنی ملی کوردستانەوە معلوم کرا. بەلام آغا صالح نەچو بو ئەو محکمەیە.

چەند مضبطەیکی بە خەلکی ئەو ناوە کرد کە لەبەر حمەرشیدخان دانیشتوانی ئەو ناوچەیە ناهیتە ناو حزبەوە.

لەلایکی تریشەوە لەگەل عمرخانی شکاک کلکیان لیک هالاندبو بەهەردوکیان شتی خراپ یان لە حمەرشیدخان ئەنوسی. و هەر دوکیانیش مەبەستی تای بەتی خویان یان هەبو لە نوسینی ئەو راپورانەدا.

وە زوربەی راپورەکانیان ئەگیران وە لە سەرا ئەخوینرانەوە لە پاش رونوس و خویندنەوە ئەنیرەران بو قازی محمد و جیگایانی تر. بەلام حمەرشیدخان گوی نەئەدایە ئەو مضبطە و شکایەتانەی کە لی ئەکران.

حمەرشیدخان لەبارەی آغا صالحی سلطان پەناشەوە تاوان بار نیە چونکە آغا صالح کابرایکی دەولەت پەرست بو موچەی پولیسی نیرانی وەر ئەگرت وە لە هەمو شەریکی نیران و دیکراتا نیشتراکی هەبو.

١٨- آغا رشیدی تازە قەلا ـ لە لاین فتاح بگ و محمود و حمە امین ناوانی پیاوانی [ عبدالله بگی سرحدیەوە ـ بریندار کرابو ـ لە ئەصلا عبدالله بگ داوای بەشیکی دی [جەوشەنی لە ئاغا رشید ئەکرد گوایا بەشیکی ئەو دی بە هی عبدالله بگە. و ئاغا رشیدیش ئەو ملکەی بە هی خوی ئەزانی

جا عبدالله بەگ بە غروری بانەیەتی و ئەستیرەی گەشی سەرشانی حمەرشیدخان ـ ناردبوی کە آغا رشید بکوژن بەلام بویان نەکوژرا بو هەر بریندار کرابو.

حمەرشیدخان کە ئەو باسەی بیست تورە بو نوسراویکی پر عتابو لومەی بو عبدالله بەگ نوسی. کە حەق نەبو کاریکی وا سەر بە خو بکەیت مادام

محکمه له سابلاغ هەیه حەقی شکایەتت هەبو نەک کوشتن. ئیمه لەلایەکەوە بو خزمەت ئەو وەڵاتە هاتوین نه تەناوەوە. وە له لایکیشەوە دەست مان به خەڵک کوشتن و راووروت کردوە.

ئەوا [ میرزا کریم برین بی چی بەناوبانگی پیاوی حسن خانی بدالیم] بو ناردی بە گورجی بەری یەکەی بو لای آغا رشید بو دی تازه قەلا بو تی مارکردنی ـ نابی ئەو جراحه بگەرێتەوە هەتا ئاغا رشید خاس نەکاتەوە. و [ تەن بی تان نەکەم کە شتیکی ناواتان له داهاتودا لی ئەبی ممره.

١٩ – حەمەرشیدخان نه له بەسەرهاتی شهری وەرا وە نه له بەسەرهاتی قازی محمدا ـ هیچ پەی وەندیکی بە ئنگلیسەکانەوە نەبوە. لەو باوەڕەدام ئەگەر حەمەرشیدخان لە شهری وەرا لە انگلیسەکان نزیک ببوایەوە وە توانی بای ڕەزامەندی انگلیسەکان پیک بی نی. سەرکەوتنی زور گەورەی چنگ نەکەوت.

حەمەرشیدخان تەنیا بو خزمەتی قازی محمد و کوردیەت هاتبو ناوچەی مهاباده‌وە وە له هیچ جهتیکیشەوە نیعاز نەکرابو بو خزمەت وە یا خەرابە کردن.

بەڵام خەڵک رایان لیک ئەدایەوە کە حەمەرشیدخان بە فەرمانی انگلیسەکان چوبتە ناو کومەڵە وە بە فەرمانی ئەوانیش گەڕابێتەوە بو عراق.

چونکە بە گەڕانەوەی حەمەرشیدخان باری دیکرات گوراوە خەلک لە هیوا و ئامانج دڵ ساردیکی پەیدا کرد. وە لە راستیشا ئەو وینە [ رەمل و استرلاب] کاریە لە لاین ناحەزەکانیەوە پێک ئەهات. و هەر ساتە بە وینەیک تاوانیان پاڵ ئەدا.

لە کاتیکا کە حەمەرشیدخان چوبو ناو دیکرات ئەو ناحەزانە قالەزیان بو قازی محمد و روسەکان ئەنوسی کە حەمەرشیدخان بە قسەی انگلیسەکان هاتو بو ئیران بیگرن وە باوەری پی مەکەن.

کاتی حەمەرشیدخان لە قازی محمد تورا و هاتەوە عراق. هەر هەمان دەستە و تاقم رایەوری دور و درێژیان ئەدا بە حکومەتی عراق کە گەڕانەوەی

حەمەرشیدخان لەسەر ئیعازی روسەکانە پی ویستە بیگرن ئەوەکو ناژاوەیکی وەکو تیرانیش لە عراق پێک بی نی.

کاتی کە حکومەت. حەمەرشیدخانی گرت و دوری خستەوە بو [ رومادیە ئەمجا ناحەزەکانی ئەیان ووت ئمو گیرانە راست نیە حکومەت بو باوەر پی کردنی گشتی وای لی ئەکات ئیشیکی گەورەی بە حەمەرشیدخان هەیە.

جا لە هەمان کاتا هەر هەمان ناحەز بون کە لە سەر سێ تەناف یاری یان بە مقدراتی حەمەرشیدخان ئەکرد.

زور شت هەیە کە لە نظریەی منطقی نزیک نەبیتەوە. بەلام لە هەمان کاتیشا را نیە.

بەڵ عقل ئەی گری کە حەمەرشیدخان بە قسەی انگلیسەکان چویی بو تیران وە بە قسەی ئەوانیش گەرایەوە بۆ عراق.

وە یا نە حەمەرشیدخان منصبی جەنەرالیەتەکەی بویە واز لی هینا بی کە لە عراق شتیکی تر دروست بکات بو سودی روس.

بەلام ئمو ئەزەریاتە و رەمڵ بازیە ـ هیچ یان راست نین. بەلام ظرولی شخص و حالاتی ناهەمواری حزمەکانی بو بە هۆی ئەوەی کە بەسەر ئمو هەمە تەنافانەدا باز بدا وە بەم پی یە خۆی بکا بە جێگای تانەی زور کەس

- ٢- دەفتەر و پەروەندەی ـ لشکری کە هێنا یەوە بۆ عراق وە لە مقری سەر، ئەی دایە دەست بارزانیەکان. لەوە ئەترسا کە ئمو نوسین و ئیقتراحانەی کە بۆ مصلحەتی لشکری دیکرات بو قازی محمد وزارەتی جەنگی نوسی بو نیشانی خاوەنەکانیان بدایە. پەردە لەسەر هەندی ئیهینی گەورەی حەمەرشیدخان هەڵ مالی. وە ناحەزەکانی رئی عامی لە دژ بەکار بی نن وە خۆیان بەم ناوەیەوە پیاو چاک بکەن. لە حقیقەتا ئیدارەجاتی ستاد و نوسین زور بە تنظیمی پێک خرابو بە هەمو شعوریکی نوسینەوە وزیفەی ستادی لەشکر پێک هاتبو ژمارەی صادرەی ستاد گەیشتبو ٩٤٠ .

بە شیوەی خوارەوە تشکیلاتی ئیدارەی ستاد بە نسبەت وەخت رێکخرابو.

١- میرزا محمدامین مەنگوری رئیس ستاد لشکر بو

٢- اسماعیل عارف ـ ماموری تخشانی و چەک
٣- عبدالرحمن حاجی علی ـ معاونی رئیس ستاد
٤- یحیی چروستانی منشی شبت
٥- محمدی ئەیازی ـ پاریزگاری ئوراق
٦- احمد بگی مینجەلان ـ منشی فارسی

بەم پێیە فەرمانی نوسین ریک خرابو. جا حەمەرشیدخان باوەری وابو رۆژێک نەبێ کە محاسبەی حەمەرشیدخان بکەن بو تاوان وەیا دلسوزی ئەی ویست ئەو ئەوراقانە هەڵ بگری کە تێ کوشان و دلسوزی خۆی بو حکومەتی کوردستان اثبات بکات.

بەلام ئەوەی کە حەمەرشیدخان لە محاسبەی ئەترسا هیندەی بەسەرا تێ ئەپەری کە محاسبە کراوە بە داری فەنای ئیرانیەکانەوە هەلاوەسرا تەنها تاریخ ماوە کە محاسبەی حەمەرشیدخان بکات نەک دەستەیکی تر جا تاوانەکانی حەمەرشیدخان لەناو حکومەتی دیکراتی کوردستانی مهابدا ئەوە بو کە عرضم کردن. من لەو باوەرەدا نیم کە ئەو رودا وانە ببیتە هۆی ئەوەی کە حەمەرشیدخانی پێ وە بەدناو وە گوناهبار ببێ بەم ئەندازەیەی کە گوناباریان کردبو.

بەڵێ لە هەند جیگادا ـ مادەپەرستی بەکار هیناوە. وە لە هەندی جیگادا ویستویەتی دەستی غەرەز بوەشینی. بەلام ئەو وێنە شتانە لەناو جەرگەی شوریشا بە طبیعەت ظروفو زەمان دروست یان ئەکات کە مروف بە ناچاری بکەویتە ناویانەوە.

ناخوشی نیوانی حەمەرشیدخان و عمرخانی شکاک

حەمەرشیدخان زور لە دژی عمرخانی شکاک ئەدوا. وە بە روسمی سکالای لە دەست ئەکرد. چونکە لشکری شکاک زور چەپەڵ و بێ ریز بون. رەووشتی گەورە و بچوکیان ئەئەزانی ئەو لشکرانەی کە لە سابلاغەوە رەوانەی جبهە ئەکران هەر لەوێوە جیگا بەزیان بو دیاری ئەکرا. وە ئاگاداری حەمەرشیدخانیش

نەکرا کە سەرکەشیان بکات.

حەمەرشیدخان بەناو فەرماندەی گشتی بو. بەلام شکاکەکان هیچ گوێ یان نەئەدایە فەرمانەکانی حەمەرشیدخان.

حەمەرشیدخان بە گلەیی و رەخنەیەکەوە بو وەزارەتی جەنگی نوسی کە عمرخان بەلای نیتاعەت وە گیانی سەربازیدا ناچی. لەسەر ئەو نوسینە عمرخانیان بە هەمو لشکرەکەیەوە خستە ژێر چاوەدیری حەمەرشیدخان لە کاتیکا کە قازی محمد لەگەل نیرانیەکان سەرگەرمی مذاکرات بو بو چوڵ کردنی سقز و بانە و سەردەشت و نیعتراف بە حکمی خودموختاری کوردستان. وە فەرمانی سەختی بلاو ئەکردەوە کە هەتا دوایی مذاکرات نابی تجاوەزی سنوری حکومەتی نیران بکری. وە کەس لە ئاقاری خۆی بچیتە پیشەوە.

بەلام لە رەغمی ئەو فەرمانانە. عمرخان بو خۆیو لشکرەکەیەوە (١٠) روژ گەماروی پوستی [میرەدی] دابو وە لەگەل سەربازی ئەو مخفرەدا کەوتبو تەقە کردن وە دو تەفەری شکاکی بە کوشت دابو.

قازی محمد لەو رووداوە لە حەمەرشیدخان و عمرخان دلگیر بو هەر دوکیانی لە ٢٠ مایسی ٩٤٦ دا بانگ کرد بو سابلاغ. بو قازی محمد رون بویوە کە عمرخان سەریی چی لە فەرمانی حەمەرشیدخان ئەکات. ئەمجا ناچاری کردبو کە بۆ هەمو ویێنە لەرمانیکی ئەو سەر دابنوینی.

لە بارەی دزران و تالانو راوورووت کردنی شکاکەکان حەمەرشیدخان زور ناموژگاری عمرخانی ئەکرد. و رونوسی ناموژگاریەکانیشی ئەنارد بو هیزی سابلاغ. بۆ ئەوەی کە شەرم لە کردەوەکانی خۆی بکێشی. لە ئاکاما لە لاین ئەرکانی جەنگەوە لە سابلاغ کومیسونیک ـ یان گرتبو. لەو کومیسونەدا بریاریاندابو کە عمر خان لەو ناوچەیە دور بخریتەوە. وە گەماروی پوسطی میرەدی ـ بخەنە ژێر فەرمانی ملا مصطفی بارزانی.

وە لە هەمان کاتا حەمەرشیدخانیش کەمیسونیک ئەگری بریەتی بون لە سەروک حەمەرشیدخان نانەوازادە معاونی وزارەتی جەنگ. بازرەسی جبهە میر حاج ـ نوری احمد طە فەرماندەی هیزی بارزانی و بریار ئەدەن بە دور خرانەوەی

هێزی عمر خان و خرانه محاصرەی پوسطی میرەدێش ـ لە لایەن حەمەرشیدخانەوە بکرێ. وە لە دی ێلەجێ ئەو بڕیارە بە ئیمضای هەمو لایەکیان نەگات.

وەختێ ملا طفی گەیشتە جبهە کە ئیستلامی گەمارۆی پوستی میرەدێ ـ لە عمرخان بە ت. کە عمرخان دور خرابوە و محاصرەی پوستیش لە لایەن دەستەی حەمەرشیدخانەوە پێک هاتبو

وا دەرکەوت کە ملا مصطفی ئەو ڕوداوەی پێ خۆش نەبوبێ. کە حەمەرشیدخان پێش دەستی کردبێ. بەڵام ئەو پاسە دوایی هاتبوو ڕەبطی شێوەیکی فەرمانی هێنتی ارکانی جەنگی جبهە کرابو ئەمجا عمرخان چوبو ناوچەی سەرشیو و خورخورە ـ لەگەڵ آغا صالح کەوتنە ڕاپۆر نوسین لە دژی حەمەرشیدخان.

بەڵام ڕاپۆرەکانی عمرخان نرخێکی نەبو. چونکە عمر خان لەلای لشکر و قازی محمد ئیمتحانی ڕاستی و خاوێنی خۆی دابو. شکایەتی هەزاران خەلکی ئەوناوە سیمەتی خۆیو لەشکری شکاکی شکاندبو نرخێک بۆ خۆیو لشکرەکەی نمابووە.

چونکە کردەوەکانی ئەم کردەوەکانی حەمەرشیدخانو لشکری بانەی داپوشی بو. لەبەر سوکی کردەوەکانی لشکری شکاک سەری قازی محمدیش پێ شور بوبو.

زێرووی بهادری ـ فەرماندەی هێزی سەردەشت

حەمەرشیدخان هەتا ئاخر بەسەرهاتی سەردوشت. علاقەیکی بەسەردەشت و زێرو وە نەبو. لەباری دوهەمیشا ڕێلیکی خوێنێ کەوتبو ئەوانی زێرو و حەمەرشیدخانەوە.

پێش ئەوەی کە ئاغوات وە بگزادەکانی هەموویان یەک بگرن وە بچن بە دەنگی حەمەرشیدخانەوە. دەولەتی تهران هەلی لە هەندی بگزادەی بانە دیبو دەستەی [حاجی ئانبی ـ کردبو بەلایەن گیری خوی وە پارێزگاری [ ڕەحمەت] وە هەلی ـ هەورازە دریژە و [کلوێ] دابونە دەست.

لەو کاتەشا دەستەی زێرو ـ لە دێی [بانەڕێز] بناوێلە] ئەبن. محەمەد بەگی کوڕی احمد بەگ حاجی نائب ـ کە چاوی بە ئاڵای دیکرات ئەکەوێ تەعەسوبی قەومی دڵی گەرم دائەهێنێ. تفنگەکەی دائەنێ وە بە ئیستقبالی ئاڵای کوردستانەوەی ئەچێ لەگەڵ چەند پیاوێکیا بەڵام سەربازە ناشێەکانی زێرو. وا ئەزانن کە ئەو خەڵکە بۆ گرتنی ئاڵاکە ئەچن بۆ پێشەوە. دایان ئەگرن بە تفنگ. محەمەد بەگ لەگەڵ دو نەفەری تر ئەکوژن.

جا کوشتنی ئەو آغا و دو نەفەرەی خزمی حەمەرشیدخان بو بە هۆی ئەوەی کە هەتا دوا ڕۆژ حەمەرشیدخان پەی وەندی لەگەڵ هێزی زێرودا بپرێ.

جا لە ڕاستیدا. لە هەمو بارێکەوە ئیدارەی سەربازی نقصان بو گەورە و بچوک واجبی خوی نەئەزانی. ئەو مەنسبو دەوەجاتانەی کە هەڵ گیرابون لەسەر یاسایەکی ئیستحقاق و بەرجەستەی نەبو. هەمو لایەک یان وەکو تایەری ئوتوموبیل بە دەورەی غلط و هەڵەیی دا ئەسوڕانەوە.

ڕوسەکانیش تداخلی هیچ وینە ئیصلاحاتێک یان نەئەکردن چونکە هیوایەک یان بەم وضعە نەمابو. فشاری دەوڵەتی ئێرانیش بو ڕەزاکردنی ڕوس و دامەزراندنی شریکەیەکی مشترکی نەوت لە ئێرانا شەڵی لە هەمو وینە دڵسۆزێکی ڕوس هەڵدابو بەرام بەر بە لاوانەوە و ئاموژگاری کوردەکان.

***

## بەشی ٥

**هەمو بەسەرهاتی حەمەرشید خان هەتا ٩٥٧ -**

حەمەرشیدخان - کوڕی قادرخانی بارامی - بە کە بنە ماڵێکی گەورەن لە بگزادەکانی بانە. وە بە بەرەبابی ئەولن ئەووتری بارامی - ئیختیاردینی.

حەمەرشیدخان لە دێ شیوەگیزانی - عراق هاتوتە دونیاوە لە ساڵی ١٨٩٨م دا. بەرەبابی حەمەرشیدخان گەورەی بانەیان کردوە. بە بونەی هەندێ فشاری تیرانیەکانەوە قادر خان هاتوتە عراقەوە. وە ناوچەی [شلێری] پێنجوێنی خستوتە ژێر بەرهەلستی خویەوە. بەلام قادر خان زورتری ژیانی بە شەر و ئاژاوە و پەلاماردانی دەولەتی تیران ڕابواردوە.

لە ساڵی ١٩٢١دا کە قادر خان وەفات ئەکات حکومەتی تیران بە هەلی زانیوە هەندێ لشکری عشائری گەورک دیبکری فیض الله بگی - کۆ ئەکاتەوە لەگەل سەربازی دەولەتیدا. بو سوتان وە تالانی دێ [وینە و داروخان - دینە عراق حەمەرشیدخان لە وەختی ئەوەی کە عمری ٢٣ ساڵان ئەبێ بە ٤٢ نەفەر دەستەودایرەی خویەوە [ لە قەلاتی وینە و هاریر (و مران - لەگەل ئەو هێزەدا ئەکەوێتە شەڕ.

شەو و روژێک بەرامبەر بەم لشکرە ڕائەوەستێ. لە ئاکاما لشکری تیران ئەشکێنێ وە کوشتارێکی زوریان لێ ئەکات. وە تالانو ماڵێکی زوریان پێ ئەبرێ.

ئەو سەرکەوتنە بو حەمەرشیدخان ئەبێتە هوی ناوبانگێکی زور گەورە. بەم سەرکیش و غروریەوە دەست ئەکات بە خەراپە کردن لەگەل تیرانا.

حکومەتی عراق لە سەر شکایەتی تیرانیەکان گرتی و دوری خستەوە بو موصل. چوار ساڵ لە دورخراوەی موصلا مایەوە.

ئەمجا کە گەڕایەوە بۆ داروخان. دیسان سەر لە نوێ دەستی دایەوە ڕاووڕوت و پەلاماردانی ئێرانیەکان. ئەمجا لەسەر شکایەتی تەهران دوبارە حکومەتی عراق گرتی وە هێنایە سلێمانی ساڵو نیوێک لە سلێمانی خانە نشین کرا.

بەڵام هەندێ ڕاپۆری ئێرانیەکان بۆ بە هۆی ئەوەی کە متصرفی سلێمانی مجید یعقوبی و مدیری شرطە سید علی حجازی لە ۹۳۸ دا گرتیان وە فڕێیاندا زیندان.

وە لەو کاتەشا چەند کونە چەتە و پیاوێکی ئەو گیرابون. لە زیندانا پەیمان ئەبەستن وە ڕێک ئەکەون شەوی ۱۲ / ۱ ۹۳۹ لەگەل چەتەی بەناوبانگ سید عطا) و مجید گلباخی ـ و علی آغای پژدەری و بلە خزان ـ و شیخ رشیدی سەر زەلی ـ و محمود قمولەی ـ پەلاماری ـ پاسەوانی زیندانی سلێمانی ئەدەن. ۱۲ تفنگی پاسەوانەکان بە سێ فیشکدانەوەیان چنگ ئەکەوێ. لەگەل ۴۲ ئەلەری بەندیدا هەڵدێن.

وە هەر بەم شێوە لە سەرفراری حەمەرشیدخان ـ حما آغای عبدالرحمن آغا ـ و احمدی عزیز آغا ـ مدققی بلدیات و محمد امین خانی قادر خان زادە ـ علی بەگ ) و حمە عزت بەگی برای) لەگەل مجید خانی کوری ئەخرێنە زیندانەوە لە جیگای ئەمو چەتە هەڵاتوەکان. حزبی برایەتی کە لەو کاتەدا ناوی دەرکردبو و علاقەیکی لەگەل ئەو ڕوداوەدا هەبو. وە ئەندامی بەرجەستەی ئەو حزبە بریەتی بون لە حما آغای عبدالرحمن آغا و شیخ لطیفی حفیدزادە و شیخ جلالی حفید و ملا حسنی قازی و میرزا محمد امین مەنگوری. و نجم الدین حاج ملا رسول ـ و ملا مصطفی صفوت ملا اسعدی محوی ـ اسماعیل شاویسی ـ صدیق شاویسی ـ حمە سعید بگی هزاری جاف ـ عمری احمد بگ ـ شیخ لطیف دانساز ـ حما آغاژی خولەی بلە ـ یەکتابگ ملا جلالی حیدری ـ دکتور نوری فتوحی ـ سعید ناکام ـ عبدالله بگ ـ سلیم بەگ ـ خرشید عزیز ـ عارف قرەچەتانی ـ حارس عبدالله ـ محی الدین قرگەی ـ علی

کانی درکەی ـ ئاوان

لەسەر ئەو گیرانە حزب کەوتە فعالیەت و خو نیشاندان ـ تفنگ یان بە مالی متصرف مجید یاقوبی وە نا. و دوابەدوای ئەوە بومبایان خستە مالی سید علی هجمازیەوە. وە لە حاکم عبدالعزیز خلوسیاندا ـ و پالەوانانی ئەو هونەرانەش ـ حارس عبدالله عارف اسماعیل ـ محی الدین قرگەی ـ علی کانی درکەیی بون ـ جا ئورەبونی حزبی برایەتی بو بە هوی نقل کرانی متصرف و مدیری شرطە و حاکم حاجی رمضان پاشا ـ بو بە متصرف و علی غالب بە مدیری شرطە و ملا صدیق بە حاکم ـ ئەمجا لە دەوری ئەو حکومەتە تازەیەدا حەمەرشیدخان بخشرا وە نیرمرایەوە بو جیگای خوی.

هەتا شەهری وەی ل ـ ٣٢ ٠ آزەری کە ریکەوتی ایلولی ١٩٤١ ئەکات حەمەرشیدخان بە بی دەنگی لە دی داروخان لی دانیشتبو بە لەرمانی کشتوکالەوە خوی سەرگەرم کردبو.

چونە سەر بانە و سلز و سەردەشت

بە داخل بونی انگلیس و ئەمەریکا و روس بو ئەرازی ئیران. حەمەرشیدخان مکروبی تاخت و تاز و راپەرینی چونە سەر ایرانیەکانی زیندو بووە. بە دەستەیکی [ ٧٠ ] ئەفریەوە چو سەر بانە. لە پاش جەنگیکی دو شەو و روژی توانی بانە بگری. حەوت هەزار تفنگی برنەو ئەستیرنیشانی سالدات و دەمانچە و کەرستەیکی جەنگی زوری خستە دەست عشائری بانە. وە بەم سەرکەوتنو پەلامار دانە رانەوەستا هەتا سەردەشت و سلز و دیواندەرە] ئەگری بەلام سەرکیشی لشکرەکەی بو بە هوی کە ئەتوانی لەوە زیاتر تی پەر بکات. دیواندەرەی ـ بو بو بە [ علمین رومیل ـ و ستالینگرادی بالوسی ـ نالمانی.

بەد ئاوی وە کردەوە ناشیرنەکانی دەستە و دایرەکەی خوی بو بە هوی ئەوەی کە ئەتوانی هەتا نهایەت مەرکەزیکی سیاسیانە بو خوی و هوزی کورد پیک بینی. ئەو شورش و پەلاماردانە بە سامو ئەووژمەی بە دەست کەوتیکی راووروتو چەتەگەری بو ئەواو بو. جا تاسیری کردەوەی ناریانکی لشکرەکەی بو

به هۆی ئەوەی کە انگلیسەکان ئەیانەوێ ئەو لەشکری [ هەلاکو ]یە لە ناوی خورخورە تی پەر بکات.

انگلیسەکان لەو کاتەدا وایان ئارەزو ئەکرد کە ئەو ئاژاوەیە ڕو بکاتە ناوچەی [ تیکاب سایینقلا ـ زەنگان ـ نە وەکو ناوچەی سنە و ئەتی ئەوتی کرماشان کە لەوان مسئول بو. بو ئەوەی کە سیاسەتی روس لەو ناوەیە دا بشێوێن.

ڕوسەکانیش لە هەمان کاتا ملاقاتی حەمەرشیدخانیان ئەکرد و هان یان ئەدا کە لەسەر دیواندەرە و سنە ـ گرتن بێن گەرم بی لەبەر ئەوەی کە حەمەرشیدخان لە فێڵ و مەتەڵی ئەو دو دەوڵەتە فێڵبازانەیە ئەگەیشت هەتا تهایەت ئەی ترانی لەگەل هیچ کامیکیان نزیک بونەوەیکی سیاسیانە بکات. وە ئەو بی تفاهمی وە کەنارەگیریەی بو بە سببی تیاچونی هەمو پیشکەوتن و رزگاریکی خۆیو کوردایەتیەکەی

ڕوسەکان لە هەوەڵەوە وایان ئەزانی کە حەمەرشیدخان انگلیس پەرستە بۆیە وا بە سارد و سڕی و بی مبالاتانە لەگەلیان رفتار ئەکات.

انگلیسەکانیش وایان ئەزانی کە حەمەرشیدخان ستالین پەرستە بویە وا لە انگلیسەکان گوریز ئەکات.

وە لە راستیشا لە هیچ لایکیان ئەبو. ئەزانیایەتي مەدەنی ئەو سارد و سڕیەی بەسەر هینا ئەو هەلە باشەی لە چنگ دا.

ئەمجا کە ڕوسەکان لە حەمەرشیدخان گەیشتن کە بە کەلکي ئەو فکرە ناشی کە ئەوان ناوات یانە. قازی محەمەدیان دوزیەوە وە وازیان لەو هینا بۆ انگلیسەکان.

انگلیسەکانیش کە زانیان حەمەرشیدخان لەگەل سیاسەتی [ سەتفرق ناگونجی وە ئەو رەنجەی کە لەگلیا بەدەن ئەومندە ناهینی کە زەرەرەکەیان بو پر بکاتەوە. ناچار مان کە عشائرەی [ تیلەکو ـ گلباخی منحس ـ وە خانزادەی ناردەلانیەکانی لی راست بکەنەوە بو ئەوەی کە نتوانی نشاطی ئاژاوە لە هیلی کرماشان پێک بی نی.

سەقزیان بو جاری ئەوەڵ لی ساندەوە

## گیرانی سەقز بو جاری دوهەم

حەمەرشیدخان بو گیرانەوەی سەقز تەرتیباتی خوارەوەی دامەزراند

١- علی جوانمردی بە داروودەستەی خۆیەوە خۆی خستە دەوروبەری دیهاتی نایچی - مامەشا - قشلاغی قاز -

٢- حەمەرشیدخان بە تاقمیکەوە - دەوروپشتی [ خیدەر - کانی کەوەی خستە ژیر چاوەدیریەوە.

٣- احمد خانی فاروقی سەر خوی خزاندە دیهاتی - کاریزە - خرم ئو وە دەوروپشتی صاحب.

٤- سلیم خانی کیوەرو - خوی لە مامشاو - صالح آوا — دوزەخ دەرە دامەزراند

هەم پی بە پەلاماری ئوردوی دەوڵەتی ئیرانیاندا لشکری ئیران سەر لە نوی شکایەوە بە کوژرانو بریندارێکی زور و دەست کەوی ١٨ ئوتومبیلی جەنگی زرەپوش سەرلشکر سەرهەنگ ئەرفەعیان - بە پیادەی رەتان دیسان ( حەمە امین خانی قادر خان زادە) لە کێوی حاجی ئاوا - شەرێکی زور گەورە و هونەرمەندانەی لەگەڵ لشکری ئەرفەعیدا کردەوە. لەو شاخە بەرزەیەدا دو توپی ئیرانی بە غەنیمەت گرت و ئازایەتیکی پاڵەوانانەی لە میژوی ئەو روژەی کوردا تثبیت کرد.

## جەنگی سەهەمی شاری سەقز

ئەمجا پاش خو کوکردنەوەیکی زۆر سامدارانە دەوڵەتی ئیران لە ژیر فەرماندەی (سەرلشکر امین) وە سەرگورد جلالی شا و لشکری گلباغی ) و منمی و تیلکوی - حەمەرشیدخانیان لە سەقز دەرپەڕاند وە. ئەمجا حەمەرشیدخانیش لە بانەدا لشکریکی زور ریکوپیکی ئامادە کرد شەوی ١٠/ ٢ / ٩٤٢ هاتەوە سەر سەقز. هەتا ئیستا لە میژوی کوردا شەرێکی ئاوا بە

هەڵمەتو قارەمانانە ڕوی ئەداوە. لەشکری دەوڵەتی بە هێزی عەشائرەوە تەخمین ئەکران بە ١٥٠٠ نەفەر لەناو ماڵان و سەختومانی حکومەتی و قەراغی شار ـ سەنگەر بەندیان کردبو وە هەرچی پێی وتستێکی بەرگری بو عەجەمەکان بەکاریان هێنابو.

حەمەرشیدخانیش لەگەڵ ئاغایانی خوارەوە پەلاماری پاسگاکانی دوژمن ئەدەن لە ژێر فەرماندەی محمد امین خانی قادرزادە و عبداللە بەگی سرحدی و قادرخانی ئازمردە و احمد خانی فاروقی و سلیم خانی کەوەرو و عبداللە خانی شهیدی مح و علی جوانمردی و رسولی محمودی ـ ئاوانا ئەکێشن بە لەشکری تیرانا قرچە و هاژەی تفنگ و ڕەشاشو دەمانچە ئەو شارەیەی کردبو بە نمونەیەکی مەعرەکە و کارزاری کوردایەتی دەنگی شەیرانە ڕوڵەکانی کورد جەرگی سەربازەکانی تیرانی بڕی بو گورانی لەتار و ئەلاوەیسی وە لاوەکە و بەستەی پێشکەوتن بو پێشەوەی لاوانو گەنجان بەراستی پیاوی ترسەنوکیشی ئەکرد بە لێهاتو و نەترس.

جا بو ڕاوی سەربازە تریاک خۆرەکانی تیرانی ڕوڵەکانی کورد پێشڕەویان بە مزگەوتو ماڵانو سەختومانەکانەوە ئەنا و پیا سەر ئەکەوتن بو دەست گیری سەرباز و عەشیرەتە خویڕیە نیشتمان فروشەکان وە دەستەیەکی تریش لە ڕوڵە نەبەردەکان بە تەور و تەوورداس پەلاماری دەرگای قلایچە و ساختومانو مزگەوتو ماڵەکانیان ئەدا. وە دەرگاکانیان ئەشکاند و ئەچونە ناو ژورەکان تارای زەرد و سوریان بەسەر ئاغەواتی عشائرە خۆفروشەکاندا ئەدا. بە تلی لی لی ـ بوە ئەفسەر و خانە زوڵەکانیان ئەبردنە خزمە آغای حەمەرشیدخان. جا بەم تەوروژمو سامە ٨ سعات شەڕ لەناو شاری سقزا خایاندی. بەم پێیە شاری ستالینگرادی ] سقز بو جاری سێهەم گیرایەوە. وە ئەو گرەوشیان دیسان بردەوە. تیرانی و تیران پەرستەکانیان لە ماڵانا چەک کردن.

هەر ئەو شەوە لە لایەن احمد خانی فاروقیەوە سەر لەشکر [ امین] کوژرا علی خانی حبیبی ـ رئیس عشیرەتی تیلکوش ـ بە خەنجەری حمە امین خانی قادرخان زادە لەناوچو

سەربازی کوژراوی حکومەتی و عشائری گیشتبو ۳۰۰ نەفەر ـ و شەهیدی ئازادی خواهەکانی کورد بەرستیش گیشتبو ۵۰ نەفەر. وە هەر لەو شەرەدا ئاغایانی ـ سیف الله خانی أردەلانی ـ قائمقامی سقز و آغای خانان ـ و علی رزاخان ـ ناوانی ئاردەلانی بەدیل گیران لەگەل چەند نەفەریکی دەولەتی ـ وە بە دیلی نیرمراه شاری بانە و ئەو ۱۵۰۰ نەفەرەش بە تەواوی چەک کران.

## تی بی نی

مروڤ نابی لە واقع لابدا. وە نابی بەوە برەنجین کە بلێم حەمەرشیدخان کەسیکی زور لی هاتو وە آزا و لەشەر زانە. و فەرماندەیکی زور چابکو بە پیلان بوە

بی ئەوەی کە لە هیچ مدرسەیکی عسکری فنی تخطیط و نەخشە سازی وەرگرتبی لە زور پیلانی عسکریدا پیش پیلانی ئەفسەرەکانی ئیرانی نەکەوتەوە. بەلام بەختی کورد هەر وای هیناوە کە پیاوە گەورەکانمان تا سەر لە ئیشوکاری حکمداری سەرنەکەون وە گیانی ئازایەتی یان لە گیانی خوێندەواری سیاسەت گەری بەهێزتر بی.

بەلام ئینصافا قسە بکەین. لە نیوانی سیاسەتیکی وا گەورەی روس و انگلیس و ئەمەریکا و ئیرانا. حەمەرشیدخان چی بکردایە وە کام لای بۆ خۆی هەل بژارتایە. وە لەسەر مسرەحی کام لا هەل بەرپیا.

لاین گری کاملای کردبایە بو کورد سودی تیا بو. کاملایان لە کام لا بو کورد دلنواز و میهرەبان تر بون.

هەر دو لایان ئەو بی چارەیان لە یەکتر هان ئەدا. روسەکان بی یان ئەووت برو بو لای سنە و کرماشان. انگلیسەکانیش لە ناوی (خورخورە) ئەیان ئەهیشت پەری تەوە تەیان ووت برو بو لای تیکابو زەنگانو سایینقلا.

و هیچ لایکیان بەرویکی راست و رەوان تی یان نەئەگەیاند کە چی بکەی باشە و ئیمە تا چە ئەندازەیک یارمەتی ئامالجت ئەدەین.

جا بەراستی لە موقفیکی ئاوا پرسیاسەتو ئاژاوە رون کردنەوەی مەبەست زور گرنگە.

بە تای بەتی بو حەمەرشیدخان کە هەمو لشکرەکەی بو تەماع و راووروت بە دوای کەوتبون. لشکرەکەی لەو ناوە گەیشتبو [١٢] هەزار تفنگ کە زوریەیان سوارە بون. ئەو هەمو لشکرە بە نانی خەلک بەخیو ئەکران وە لەسەر وورگی ئەهالی ئەژیان

دەولەتیکی گەورەی وەکو ئەلمان لەو وەختەدا نەی توانی لە سیاسەتو مەبەستی روس و انگلیس بکات چە جای کەسیکی وەکو حەمەرشیدخان. من لەو باوەرەدام ئەگەر چرچل و ستالین ـ لەو کاتەدا کورد یان وە کرابان بە سەرپەرشتی نیشوکاری کورد. باوەر ناکری کە توانی باین لەو شوینە چەوتو چویرەدا لە حەمەرشیدخان باشتر نیشی کوردیان بەرواندبایە. لەگەل ئەوەشا بی لایەن گیریەکەی لەوە باشتر بو کە خوی بەسەر پەلیکی سیاسی دا دابایە و ئەمشی توانی با بە ریوەی بەری. چونکە آزاد بونی کورد دەستیکی هەرە بە قوەت و سیاسەتیکی هەرە قولو لی زانی ئەوی.

ریکەوتنی حەمەرشیدخان لەگەل ایرانا

انگلیسەکان هەر ئەوەندە ئاژاوەی حەمەرشیدخانیان بەلاوە باش بو تا لەگەل تهرانیەکانا نیتفاقی سی قولیان بەست. بو ئەوەی کە لە هیلی کرماشانا ئاژاوەیک نەمینی ئەوەکو لە پاشەروژا بەدەست کاری روسەکان شتیکی ناشیرنی لی بەرهەم بی. انگلیس کەوتە مشور خواردنی دامرکانەوەی ئەو ئاژاوەیە. سەرهەنگ [ ارفعی ] بو جاری چوارەم بە لشکریکی زورەوە هاتە سەر حەمەرشیدخان. بەو بەندانەی خوارەوە بە هوی سید فهیمی والی خراسان ـ چاو پی کەوتنی حەمەرشیدبگی بلەکی و مجید خانی حەمەرشیدخان و نصرالله خانی روستمی و قادرخانی آرمردە و محمود خانی کردلە لە مرکزی سلزا لە روژی ٨/ ٩٤٢/٤ دا ریک کەوتن لە نیوانی حەمەرشیدخانو حکومەتی تهرانا مور کردا.

١- لەگەلی خانەوە هەتا کورتەکی سەردەشت عائد بە عشیرەتی بانە بی.

له ژیر چاوەدیری حەمەرشیدخانا نگهبانی بکری
٢- مامورینی دەوڵەتی ئیران عالاقەیک یان بەسەر ئەو ناوچەیەوە نەبی.
٣- جیگای دانیشتنی حەمەرشیدخان بانە بی.
٤- دی شوی کە ملکی ئەمیریە بۆ حەمەرشیدخان بی.
٥- ئیدارەی دوخانیات بلدیە پولیس و امنیە مالیە ـ لەلاین ئەو مامورانەوە سەرپەرشت بکرین کە آغای حەمەرشیدخان ناو نوسیان ئەکات وە بە دەولەتیان ئەناسی.
٦- موچەی مامورینی ئەو ادارانە وەکو موچەی مامورینی دەوڵەتی لە بوجەی دەولەتی دەر ئەچی.
٧- خوار و بار و خواردەمەنی یان وەکو شارەکانی ئیران پیک دی
٨- دەوڵەتی ئیران چە مافیکی داوە بە شارەکانی ئیران لە ڕیزی ئیقتصاد و سیاسی و جامعەدا هەمان مافیش ئەدا بە دانیشتوانی شاری بانە و مەرزی ناوبراوی.
٩- موچەی مانگانەیان بە پێ بڕیاری مقطوع ٢٥ هەزار تومان بی
١٠- ڕسما عفوی شاهنشاهی بو تاوانبارانی بەسەرهاتی شهری وەر دەربچی و بلاو بکریتەوە وە بە هەمو دەستەودایرەی حەمەرشیدخان ڕابگەیندری.
وە فعلا لە روژی ٣٠ تموزی ٩٤٢ دوایی بەم ئیتفاقو تسویە نامەی آشتی و ڕیک کەوتنە هات وە لە دی [گلولان] ئەو ئەمرە بە حەمەرشیدخان ڕاگەیاندرا.
لەلاین رئیس عشیرەتی دیبکری علی آغا ایلخانی زادە و حما آغای عباسی وە فەرمانی عفوی شاهانە و بڕیاری ئەو ڕیک کەوتنەیان بو حەمەرشیدخان هینایە بانە.
تقریبا لە سەر شیوەیکی خودمختاری بە نسبەت شاری بانە و سەردشت و سنورەکانی تشکیلاتی ئیداری بە شیوەی خوارەوە کرا.
اولا حەمەرشیدخان بو خوی قبولی هیچ گونە موچەیک نەکرد.
٢- حمە امین قزدرخان زادە ـ برای حەمەرشیدخان کرا بە فەرماندەی گوردان

٣- سلیم خان محمود خان ـ مدیری بانە.
٤- نصرالله خانی روستمی ـ مدیر مالیات
٥- عبدالله بگی سرحدی ـ رئیس دوخانیات
٦- عبدالله خانی شهیدی ـ سەروکی شهرداری
٧- قزدرخانی ئارمردە ـ سەرپەرشتی ئەمنیە ـ پولیس بەم پی یە سەروکی ئیدارەکان بۆ پێک هێنانی ئیشوکاری دەوڵەتی کەوتنە ئیش کردن. و شورشی بانەی ـ بەم تشکیلاتە بچکولانەیە دامرکایەوە. ئەم تشکیلاتە لە ٣٠/ تموزی ٩٤٢دا دەست پی کرا وە لە ١/ کانون دوهەمی ٩٤٥ دا دوایی هات

قرەی ناوخویی بەگزادەکان

قرەی ناوخوی حەمەرشیدخان و سلیم خانی [گیرەروی بانە] بو بە هوی ئەوەی کە هەتا تهایەت ناوچەی سەردەشت لەژیر حکمی بانەی دا نەبی. لەبەر تەماع کاری بگزادەکانی بانەی سەردەشت بو بە جیگای بگرە و لی نشینی عشائرەکان.

لە هەوەڵەوە لە دەستەی قومیتەی پژدەری باپیری باپکری محمو آغا. حسن رشید آغای دەروینە و حمە بچکولی علی آغا و درویش آغای وسمان آغا گەورەی سەردەشتیان ئەگیرا.

دوای ئەوان فەرماندەی سەردەشت کەوتە دەست کاک اللهآغای پاراستانی گەورک ـ دوای ئەو احمدی قادری قاسم آغا و ـ براهیم آغای سویسنی بون بە گەورەی ئەو شارە

ئەمجا شیخ لطیفی حفیدزادە لە سلیمانیەوە هەلات چوبو سەردەشت وە لەلاین حمەرشیدخان و سلیم خانەوە یارمەتی درا کە گەورەی سەردەشت بکات.

بەلام لەو بینەدا سلیم خانی منافسی نفوسی حمەرشیدخان وهاتی کرد. میدانی رەقابەت و بەریەرەکانی بۆ حمەرشیدخان چۆل کرا. هەر چەندە سلیم

خان به ڕوالەت بەرپەرەکانی حەمەرشیدخانی نەکرد. بەلام لەبارەی خزمایەتی و پێشکەوتنی کوردایەتی دا لاوێکی زور تێ گەیشتو و بەکەلک بو.

سیاسەتی غلەتی حەمەرشیدخان

ئەمجا لە پاش مردنی سلیم خان حەمەرشیدخان لە پەروازی خیالا وە هوش هاتەوە. کە سەرنجی لە کردەوەکانی خۆی گرت بوی ڕون بوە کە چەند هەلی گەورەی سیاسیانەی دوڕاندوە وە زور هەلی پیروزی لوریانی تیلی) دلداری کردوە. ئەمجا وەکو یەکێک لە کاروانی تمدونا بە جی مابی. بە بی هیچ لێک دانەوەی موقفی سیاسەتو ڕوژ کەوتبو تاودان بە هەمو لایێکدا.

ئەمجا لەگەل قازی محمدا دەرگای مخابراتی بو دروست کردنی کوردستانێکی ئازاد کردەوە. لەوەختێکا کە ئەمان سەرگەرمی ئەو بیر و مذاکەراتانە بون. انگلیسەکانیش بو بەرهەلستی بلاوە پی کردنی نفوسی ڕوس لە ڕوژهەلاتی عراقا. وە بو ئەبز گرتنی دەستی ڕوس خواهەکان بە تاری لامەرکەزیەت هەوای کوردستانیان بە گوی خەلکا ئەدا. بەم ناوەوە (ماجد مصطفی) ناویان کردبو بە وزیرالدولە وە بە هوی علی کمال و حما آغای عبدالرحمن آغا و میرزا توفیق قەزاز و بهاءالدین نوری متصرفی سلیمانی پروپاغندەی لامەرکەزیەت یان بلاو ئەکردەوە

لەسەر ڕاسپاردەی ماجد مصطفی وەزیرالدولەی عراق لەسەر حسابی حکومەت احمد تقی ناو ـ کە یەکێک بو لە نەخشەگیرەکانی ئەو ڕوداوە [تویی لێک دارانە] وە زۆر جار بو ناماڵجی ئەو وێنە کوردانە فیداکاری بەکار هێنابو و شارەزای تناف بازی ئەو وێنە ممثلانە بو کە لەسەر مسرەحی کوردستانی پی چەوانەدا کێ خاوەنی دەسەلاتو نەخشەی فیل بازیە. دلوا کرا بو بغدا. وە چاو پی کەوتنی رئیس الوزرا نوری سعیدی کردبو وە ئەو پروگرامو دەستوراتەی لی وەر ئەگری کە مەبەستی خۆ پیشاندان یان پی یەتی. وە بە هێزی پولیسەوە دەست کرا بە هاندان و خەلک وریا کردنەوە بو ئەم سەربەخویەتیە خۆشەیە.

وە لە هەمان کاتا کاک علی کمالی تی کوشەر و کوردخوشەویستیش لە

گەلاویژی ژمارە (٧) ١٩٤٤دا ئەو باسە بە دریژی بلاو کردەوە.
بەلام نەک بەو تەرزەی کە بە نهینی بە گوی خەلکیاندا ئەدا. و خەلکیان پی داخ ئەکرد. بلاو کردنەوەی ئەو پروپاگندەیە بو بە هوی ئەوەی کە حزبی ئازادی ـ هیوا ـ لە عراقا بکەونە تی کوشان وە چەند ئەفسەریکی بی تجربە و هیچ بەسەر نهاتو ئەفرە بخون و بکەونە ناو ئەو تەلەیەی کە کوردە فیلاویەکان بویان نابونەوە وە بەم ناوە ئیرمرانە لای کاک مصطفی بارزانی ـ کە ئەویش تی وە بگلین وە بەم تەلەیەوەی بکەن.
وە لە هەمان کاتیشا نوماینەیان لە حەمەرشیدخان داوا کرد کە بچی بو بغدا داخلی هەمان مذاکراتو داخواز بی.
حەمەرشیدخانیش لەم وەختەدا ئەیەویست لەسەر دو تەناف بازی بکا. وە تولەی سیاسەتە دوراوەکانی بکاتەوە. مجیدخانی کوری لگل حمە امین بەگی گولی) و بە همراهی حمە صالح زەنگەنەی) ممثلی معهدی ثقافی بریطانیا لە کرکوک نارد بو لای (کاک ماجد مصطفی وزیرالدولە) بەلام لەبەر ئەوەی کە (ماجد مصطفی) پی وتبون ئەو لامەرکزیەتە تەنیا بو کوردی عراق ئەبی تاسیرناکاتە سەر کوردستانی ئیران و تورک و سوریە لەم کاتەدا. نوماینەکانی حەمەرشیدخان گەرابونەوە. لیرەدا انکلیس نەی ئەویست کوردستان دروست بکا بەلام ئەیانەویست نیزی روس وەربگرن. ئاخو ئەگەر انکلیس شتیکی وەها لە عراق بینک بی نی ئەبی روسەکانیش بەرام بەر بەوە لە ئیرانا سازمانیکی کوردی دابمرزینن.
ئەم مەتەلەیان ـ تەنیا بو ئەو نیزەیە داهینا بو. کە زور کەسی ساویلکە و نەشارەزاشیان تی وە گلاندو نان براویان کردن. بەلام ئەو وینە هەنگاوانە بو سیاسەتی استعماری شتیکی زور سادە و ئاسانە بو سودی خویان هەزاران کەلەکی ] وا دروست ئەکەن ئەمجا کە لە ئەواپا و بیروباوەری روس گەیشتن کە روس وەکو [تیری تلنگ] ئامادەیە بو ئەو سازمانە لە کوردستانی ئیرانا. ئەمجا انکلیسەکان پاشە و پاش کشانەوە [ وە جانتا ] پر فیتلەکانیان لە کاک (ماجد مصطفی) وەرگرتەوە. وە تاش بەتالیان لەو فکرە کرد وە چش یان لەو

ئەفسەرانە کر کە بەم دەنگەوە چوبونە دەرەوە. لە ناکامی ئەم خولیایەدا لە داری سیاسەتی عراق دران.

پەلاماردانی حەمەرشیدخان بو مەریوان.

ئەمجا لە کاتیکی ئاوا تەنگوچەلەمە و پر لە مکروبی سیاسەت و غازی نفوزی ئیستعمار و جاسوسیەتا. آغای حەمەرشیدخانیشم تازە سەری لە هەورازی مەبەستا دەرهێنابو بە گەردن کەشی نەیەویست بچیتە ناو ولاتی هەوراماتو مەریوان. بە بهانەی ئەوەی کە چەند ئاغایکی مەریوانی ـ وەکو (علی خانی ولەژێر) و فتح علی بک ـ وە چەند ئاغایکی تر لە دەستەی حیدەربەگی ـ پەنایان بو خان هیناوە بو رزگارکردنیان لە چنگ محمودخانی ـ مریوانی و هیندی لە خزمەکانی تریان.

لە عەینی وەختا قضیەی دیمکرات لە ئیران ئاشکرا بوبو مانەوەی حەمەرشیدخان لە بانە. و شیخ لطیف لەسەردەشت لەوە زیاتر بە موافقی سیاسەتی انکلیسەکان نەنەزانرا.

چونکە شیخ لطیفیش لەو سەروبەندەدا دەرگای مخابرەی لەگەل عبدالله نوفی روسی کردبوو. وە روژ بە روژ رونوسی مخابرەکانی ئەگەیشتە دەست زابطی ئیرتباطی بریطانیا لە سلیمانی و مشاوری سیاسی قواتی بریطانیا لە کرکوک. ئەمجا لە ترسی گورانی باری سیاسەت. بابە علی حفیدزادە) و شیخ قادری حفیدزادە) چون بو سەردەشت کاکە شیخ لطیف یان هینایەوە بو عراق.

بەلام حەمەرشیدخان لە [داری هەر تەنەهاتە خواری] بو وەرگرتنەوەی مالی ئەو ئاغا دەرکروانە، لشکریکی بی سامانی بردە سەر محمود خانی کانی سانان ـ کە لە هەمان کاتا محمود خان بە روتبەی سەرهەنگی فەرمانداری قەلای مەریوان بو لە لاین لشکری ئیرانەوە. ئەمجا انکلیسەکان ئەو هەلمەتی کتوپری حەمەرشیدخانیان بەدەست کاری قازی محمد زانی.

لایان وابو ئەوە مناورەیکە بۆ بلاوەی نفوزی روس لە ریگای ئموتی کرماشانا. بە هزی متصرفی سلیمانیە [عارف جیاووک ـ ئینذاری

حمەرشیدخان کرا کە واز لەو لشکرکەشیە بی نی وە بگریتەوە بۆ جیگای خۆی.
شوتر ناوی ظابطی اتخباراتی انگلیس لە سلیمانی بۆ هەمان مەبەست حمە امین بەگی حمە صالح بگی گولی ـ نارد بو لای حمەرشیدخان. بەلام لەو وەختەدا ئەو وینە نوسراوانە لە لاین آغای حمەرشیدخانەوە نەنەخوینرانەوە.

حمەرشیدخان ـ محمودخانی دەرپەڕاند. محمود خان قرارا چویو سنە شوتەر ناوی انگلیس ـ ناچار بو خۆی چو بۆ قەلای مەریوان وە فلسەفەی ئەو پەلاماردانەی لە حمەرشیدخان پرسی.

حمەرشیدخانیش بەناوی وەرگرتنەوەی مافی ئەو بگذادە دەربەدەرانە چیروکی لشکر کەشیەکەی بە عەرز گەیاند. وە بەم پی یە لە نیوانی شوتر و حمەرشیدخانا ووتوویژ دوایی هات شوتەر ـ ئاغای حمەرشیدخان ئەو لشکرە تجاوەزاتی تر نەکات حمەرشیدخان ـ ئەگەر محمودخان نەگەریتەوە بو ئەو ناوە ـ نەخیر

سوتانی بانە

ئەمجا حکومەتی ئیران هەلی لە آغای حمەرشیدخان دی. بە ناواتی چەند وەختی لەمەوپیشی خۆی گەیشتەوە. لەسەر بریاری جنگاپانی بەرزی سیاسی ئەو وەختەی ئیران. بۆ سەر نەرم کردنی حمەرشیدخان لەژیر فەرماندەی سرلشکر ئەفشاری ـ حەوت هەزار نفری سەربازی ئیران و [ ٢ ] هەزار ئەفەری عشائری داخداری گلباخی و تیلەکویی منمی ـ سەرشیوی خورخورە و ـ مەریوان ـ هاتنە سەر آغای حمەرشیدخان لە مەریوانا.

لشکری حمەرشیدخانیان بە شکانیکی زور ناشیرین دەرپەڕاند. ئەو لشکرە نەگەرایەوە هەلی کرتایە سەر بانە.

لشکری آغای حمەرشیدخان ـ معنویات یان بی هیز بوبو و ورەیان لەدەست دابو. تین و تەکانی جارانیان نەمابو کە بە پیشرەودا بو سەربازەکانی ئیرانی ئەچو ناو قلا و سەختومانەکانی سقز. لشکری خان ـ تاک تاکو دو دەست

یان بە مەیدان چۆڵ کردن کرد. حەمەرشیدخان کاتێ بە خۆی زانی لەشکر نەماوە دەورەی چۆڵ کراوە.

هەر بەوە ڕاگەی کە شاری بانە بە مزگەوتو خانەقا و محرابەوە بسوتێنێ. حەمەرشیدخان لە سوتانی بانەدا مەبەستی ئەوە بو ئەگەر بانە ویران بکات ئێرانیەکان ئەگەڕێنە دواوە. وە ئەویش ئەتوانێ بە ترتیبی چەتە گەرێ. هەر ڕوژ و هەر شەوە بە لایەکی خێوەتەکانی ئێرانی دا بدا و دەریان پەڕێنێ. ئەگەر بەم پێیە شەڕی چەتەگەری بکات. ئێرانیەکان ناچار ئەبەن بو چوڵ کردنی ئەو ناوە.

بەڵام ئەی ئەزانی ئەو ڕوژە نیە. کە لە سقزا سەرلشکر امین بکوژی و علی خانی حبیبی بە خەنجەر هەڵدڕی و آغایانی [ئاردەلانی] بە تارای بوکانیەوە بەری بو بانە. ئەی ئەزانی کە چنگی سیاسەت و ڕوژ هەمو هیوایکی ئەمی تار و مار کردوە هەر چی ڕوناکایی هەیە لە ڕوی داخراوە. سزای چونە مریوان و ئەشغالاتی هیلی کرماشان ئەوەی بە سەردینی هەر لەو سەر و بەندەدا حکومەتی ئیران فەرمانی بەخشینی بو هەمو وینە تاوانیاریک بلاو کردەوە.

ئەوانەی کە چوبوشن بو عراق هەمویان لەسەر ئەو بخشینە گەڕانەوە وە داباریبنەوە ناو شاری بانە و دەست یان کرد بە ئاوەدان کردنەوەی شار. وە حکومەتیش یارمەتی خانومالی سوتاوانی دا. بە فورمیکی جوان تر لە جاران مزگەوتو شاری بانە دروست کرایەوە.

و آغای حەمەرشیدخانیش وەکو ئەی ویست جەنگی لایەلایی بکا بوی نەکرا. بە ناچاری داوای بەخشینی کرد لە حکومەتی عراق و فەرمانی بەخشینی بو وەرگیرا بە شەرتیک سالێ لە کرکەک خانە نشین بکرێ.

ئەمجا لە ١/١ / ٩٤٥ آغای حەمەرشیدخان گەیشتە کرکوک و ئێرانیەکانیش بە بێ قرە تشکیلاتی بانە و سەردەشت یان کردوە و انگلیسیش لە غموغای خەتی ئەوتی کرماشان پشت ئەستور بوە و لەرماندە کاربەدستەکانی حەمەرشیدخانیش هەر یەکەیان بەلایکا پەرتو بلاوەیان پێ کرا.

احمد خانی فاروقی ـ هاتە عراق وە لە دوای بەینیک گەڕایەوە بو ایران لە

دێ (تورکومان گندی) بوکان ـ دانیشت.
علی جوانمردی ـ رئیس عشیرەتی گەورک چو بو ناوچەی مهاباد. و لە دواییدا خوی خستەوە بەردەستی میری و بڕایە سنە لەوێ خانەنشین کرا. و عبدالله خانی شهیدیش ـ چو بو ناوچەی مهاباد تا ماوەیەکی دور لەوێ مایەوە. وە بەم پێ یە فەرماندەکانی تریشی وەکو عبدالله بەگی سرحدی و حمە امین خانی قادرخان زادە هاتنەوە عراق و قادر خانی ئارمردمش هەر لە ناوچەی بانەدا خوی کنارەگیر کرد وە بەم پێ یە دوایی بە حرەکاتەکەی حمەرشیدخان هات.

## بڕو باوەڕی سیاسی بەرامبەر بە حمەرشیدخان

حمەرشیدخان لەبەسەرهاتی سیاسیدا زور جار خوی پاراستوە ـ زور جاریش لە ناوەختا تی هەڵ چوە. لە هەوەڵی ئاژاوەی شهری وەرا. چەند جار لە لاین ـ کولونیل ریچ ـ فلیچەر ـ روکشاد ـ شوتەر) لە ناوچەی سنە چاو پێ کەوتنی حمەرشیدخانیان نەکرد. وە پێ یان ئەووت کە بو لای زەنگان سایەنقلاوە بچیت ئەمجا بگەڕێتەوە بو لای سنە.
پێ یان ئەووت ئەگەر هاتی بو سنە ـ هەر ئاگات لە هیزی بریطانیا بێ. چی ئەکەی ئازادی ـ روسەکانیش لە سقز ئەهاتن بو لای وە پێ یان ئەووت کە بچیت بو روسیا بو چاوپێ کەوتنی ستالین ـ بو ئەوەی بە باوەڕی خوی سەربڵندت بکات.
بەڵام گوێ نەئەدایە ئامۆژگاری هیچ کامیکیان. وەکو لە لەزایکی خارجا بێ وە هیچ پێ وەندیکی بەم جهانی سیاسەتەوە نەبێ. بو غەنەی مسال.
حمەرشیدخان کە دەستی دایە شورش لەسەر داوای چەند کەسیکی شارەزای سیاسەت پروگرامی ئیش کردن وە دەستوراتی شورشم بو نوسی.
ئەویش داوای کردم بو چاو پێ کەوتنی لە شاری سەقزا. لە چوارتاوە ـ چوم بو لای داوای ئەوەم لی کرد کە شورشەکەی لەسەر شیوەیکی مدنی بەڕێوە بەری. و شورشەکەی بخاتە سەر قالبیکی کوردیەت و نیشتمانیکی

سیاسەتەوە وە دەولەتی روس و انكلیس و امریكا لەو پیشهاتەدا ئاگادار بكات وە یاسایكی ناو خوی دادگەرانە بەری بەریوە. بو ئەوەی كە خەلك بە دەنگیەوە بچن. وە ئەو بیروباوەرە بپرستن كە ئەو ئەیبا بە ریوە.

بو وریاكردنەوە خەلك بە دەنگی شورشی زانیاری و شارستانیەتی. خطبەیكی زور دور و دریژ و بە تاسیرم لە شەوی ١٠/١٠/٩٤١ دا لە مزگەوتی سقزا خویندەوە بە ناوی [ سید حسەنی كوردستانی ] ـ وە ئەم خطبە یەم تاسیریكی زۆری كردە سەر دانیشتوانی شاری سقز بەلام آغای حەمەرشیدخان زور گوی نەئەدایە سەر دەنگی مدەنیەت و تشكیلاتی كوردستان. لای وابو كە جاریكی تر ایران زیندو نابی تەوە ئەویش بەبی [ وصایەت شاوانی سقز و بانە و سەردەشتی ] هەر بە دەستەوە ئەمی نی.

دیسان لە ٩٤٣ دا چەند ئەفسەریكی عراقی لەسەر ریوشوینی و بەلین و پەیمانیك من یان نارد بو لای حەمەرشیدخان. ووتیان ـ فەوجەكەمان بەناوی مانور تدریبە وە دینین بو پینجوین ] ئەگەر بەلین مان بداتی كە لە ژیر فەرماندەی ئەوا تشكیلاتیكی مدەنیانەی كوردیەت بكەین. ئەوا لە پینجوینەوە لەگەل چەند ئەفەر و چەكیكەوە ئەچین بو ئەو ناوە.

بەلام آغای حەمەرشیدخان لە وەلاما ووتی ئەگەر [ امین زەكی بەگ وزیری اقتصاد و مواصلات بیت ئەوا باشە. ئەنا باوەر بەم ئەفسەرانە ناكەم.

تەنها لە شوینیكی ئاوا ئەرم و ریكا كوریزی لە سیاسەت ئەكرد كە چی لە كاتیكیشا كە بلاو بونەوەی تووی شیوعیەت زراوی انكلیسی بردبو لشكری ئەكردەسەر مەریوان.

حەمەرشیدخان هەر وەكو هیچ تیكلیكی لەگەل انكلیسەكانا نەبو لەگەل روسەكانیش هیچ رێنە نزیك بونەوەیكی پێك نەهێنابو. لەگەل روسەكانیش هیچ رینە نزیك بونەوەیەكی پیك نەهێنابو حەمەرشیدخان ئەگەر هیچ علاقەیكی لگل روسەكانا ببوایە. ر لە پاش سوتانی بانە ـ ئەچو بو مهاباد وە نەتەگەراوە بو عراق حقیقتا محمود خانی كانی سانان ـ ئیرانی پەرست بو ئەو بوبو بە هوی اعادە كردنەوەی تشكیلاتی ـ رەزاوو ] هەوراماتو مەریوان لە

کاتی خویا (محمود خانو قازی محمد و حمه رشید خان) ریکەوتنیکی سێ قولیان کردبو. بەلام محمود خان زو ئەم ریکەوتنەی شکاند و بایدایەوە لای حکومەتی ئیران.

جا حمەرشیدخان لای وابو ئەگەر محمود خان لەوناوە نەهیلی هەتا مەرزی کرماشان هیچ کەندو کوسپەیک ناهیتە سەر ری حمەرشیدخان. جا بەم هەوایە کەوتە پەلامارداني ئەو ناوچەیە بەلام خیال غەلەت و بی وەخت هەمو ئامالیکي تار و مار کرد وە سەر بەخویەتیەکەی شاری بانەشي لە قیس دا.

**حمەرشیدخان بوچی لەم شورشەدا تاوانبار نیە**

حمەرشیدخان لە بەسەرهاتی بی ریز و نظامی لشکرەکەی زور بەتاوان بار نازانری. چونکە وەکاتەکەی رابەرینیکی کتوپری بو. لەسەر پیالانو پروگرام پیک نەهاتبو.

روسەکان کە گەیشتنە بانە. حمەرشیدخان مخابرەی لەگەلا کردن کە بانە علاقەی بەمەوە هەیە. ئەگەر موافقەت بکەن بە گەورەی بانە خوی ناوزەد ئەکات. وە لە پیناوی ئیوەشا فیداکاری ئەکات.

هەتا نوسراوکەی حمەرشیدخان ئەگاتە بانە روسەکان لە بانە ئەگەرینەوە بو سابلاغ نوسراوەکەی بی نتیجە مابوەوە. حمەرشیدخان کە خەبەری وەرگرت کە انگلیس و امریکا و روس داخلي ئیران بوون. بەپەلە چو بو سلیمانی چاوپی کەوتنی [جونسون] ضابطی ئیرتباطی قواتی هەوانی انگلیس کرد لە سلیمانی داوای چونە ئیران وشەر کردنی لەگەل دەولەتی ئیرانا لی کرد. بەلام جونسون] وەلامی دابووە ئەبی بو ئەو باسە مشاوەرەی مقاماتی بەرزی بریطانیا بکات لە بندا. ناتوانی بی فەرمانی ئەوان هیچ کزنە بیروباوەریکی خوی دەر ببری.

ئەمجا حمەرشیدخان لە ترسی ئەوەی کە انگلیسەکان مەنعی بکەن ئەگریتەوە بو داروخان. بەپەلەپەل چەند تفنگ چیک لە خزمو براو پیاو و کرمانجەکانی پیک دینی. وە رو ئەکاتە بانە ئەک بەم ئومید و تصمیمە لە

بتوانی بانه بگری. بەلکو بەم هیوایە کە دەستیک لە ئیرانیەکان بوەشینی. تالانو رەویک بگری. وە تولەیکی داخداری چەند سالەیان لی بکاتەوە. جا لەبەر ئەوە لەسەر ترتیب و ریزیک نەچوبو ئیرانەوە. وە لە ناکامیشا کە بەسەر ئەو هەمو تالانو گەنجینە و ئەسکناس و تفنگ و فیشکو دەمانچەی برنەو فروشتنی نایابو زۆردا کەوت جەولەی ئەو بەرلایەی بۆ ئەگیرایەوە. وە ئەی توانی عشائرەکان دەم کوت بکات حرەکاتەکەی بخاتە قالبیکی ریکوپیکی نیشتمانیەوە.

چونکە هەر کۆلکە آغا و خانیکو بەگزادەیکی کە ئەتدی. خۆی لە حمەرشیدخان بە زل تر ئەزانی. تفنگی برنەو و فەرشو تالانی ئیرانیەکان بە ئەندازەیک ئەو لاتو لەوارانەی بەرز کردبوەوە هیچ [چەلانگێک] ئەنەگیشتە لوتیان وە بە کەمترین ئاموژگاری و جەلەو و قەدەغەگیری ئەتوران وە تورانەکەشیان ئەبو بە هۆی تێک چونی ریکوپیکی خزمەکانی. جا هەر بەم پی بە ژیانی نظامی لەناو لشکرەکەیا بلاو بو بوەوە.

حمەرشیدخان موچەی ئەبو کە بیدا بەم ١٢ هەزار کەسەی کە بە دوای کەوتبون ئەو کومەلو هیزە هەر بەناوی آغاواتو هێوای تالانو کەلاکی عجمەکان بە دوای حمەرشیدخان کەوتبون.

قضیەی خود پەسندی و لوت بەرزی گەیشتبو ئەندازەیک هەر باسی نەکری.

ئەگەر بگزادەیک هاتبایە دیوانخانەکەی حمەرشیدخان. لەبەر مشغلەت کە حمەرشیدخان پی ئەکرابا لەبەری هەلستی . ئەو ئاغایە خۆی بە سوک ئەهاتە بەرچاو و ئەتورا. هەتا جاریک آغایک ئەچی بو لای حمەرشیدخان بەلام کە ئەچی بو ژورەوە دیوان پر ئەبی لە میر و خان جیگا نابی ئەو ئاغایە لی دابنیشی. تەنها جیگایک لە پایینی هەمویان ماوەتەوە. وە هەرچی لەو مجلسەشا ئەبی خۆی لەو بە زل تر و خان تر ئەزانی کەس جیگای خۆی بۆ ئەو آغایە چۆل ناکا بگزادەکەش تنزل ناکا لەو جیگا خوارەوە دابنیشی.

بگزادەکە بە توڕاوی دیتە دەرەوە بە خویو دەستە و دایرەکەی جبهە چوڵ ئەکاتو ئەگەڕێتەوە بو ئەو دی یەی کە لی وەی هاتوە وە لە عین وەختا حەمەرشیدخان زوری پی ناخوش بوە کە ئەو آغایە جیگای دانیشتنی چنگ نەکەوتوە.

و قرە و ئاژاوەی ناوخوی بەگزادەگان بوبو بە هوی ئەوەی کە حەمەرشیدخان هەر بە دامرکاندنی نیوانی آغاکانەوە مشغول بی نەگ داهینانی یاسایکی دادپەرستانە.

حەمەرشیدخان بوچی پیش نەکەوت

ئەو شتانەی کە هەتا دوایی بو بە هوی پیش نەکەوتنی حەمەرشیدخان ئەو کەند و کوسپانەی خوارەوە بون.

١- دوبەرەکی نفوزی سیاسیانەی روس و انگلیس. لەهەر کامیکیان کە نزیک ببوایەوە ئەوەی تر نەی هاڕی.

٢- ناریکی عشائر و دەرەبەگیەتی لشکرەکەی

٣- دامەزرانی حزبی تودە لە ئازربایجانا لە دژی ئەو بیروباوەڕە بو کە حەمەرشیدخان ئەی ویست پی کی بی نی. تودە و کومەڵەی ـ مهاباد دژی چونە پیشەوەی حەمەرشیدخان بون

٤- روس و انگلیس دەلالیان لەبەر ئیران ئەکرد هیچ کامیکیان لەو کاتەدا نەی ئەویست لە دژی ئیران خوی نیشان بدا نە وەکو ئیران لە ترسان خوی بخاتە باوەشی ئەوەی تر و موازەنەی پی بگوری.

٥- لشکرەکەی حەمەرشیدخان لەو دوایەدا دڵسوزیان بەکار نەئەهینا. چونکە لە هەوەڵەوە حەمەرشیدخان بلاوی کردبووە. هەر تفنگ چیک لەکاتی جەنگا چە وینە تالاتیکی چنگ بکەوی هی خویەتی کەس ناتوانی لی بستینی.

جا ئەو ئومیدە لشکرچیەکانی تشجیع کردبو. کە خەلک زور بە دڵسوزی و فداکاری پەلاماری دوژمن بدا بو چنگ کەوتنی تفنگ و تالان. ئەم دڵسوزیە

بویو بە هۆی ئەوەی کە وەکو [پاشوکە] خۆیان بە لەشکری ئیران دا بدەن.

بەلام ئاغا [شەرەخۆزەکان] ئەو قاعدەیان تیک دا. ئەگەر شتیک چنگ نوکەر و کرمانج و پیاوەکانی آغا بکەوتایە ئەبوایە لەگەل آغا دابەشی بکەن.

ئەگەر ئەو لەشکرچیە برینداز بکرایە وە یا بکوژرایە ئەبو آغا نیوە تالانەکەی هەر لی بستینی

جا ئەو یاسا و رەوشتە تەماع کارانەیە بو بە هۆی ئەوەی کە خەلک نیشتراکی جبهە نەکات. وە خۆی بۆ آغاکەی بە کوشت ئەدا کە دوایشا ژنی کابرای کوژراو مارە بکاتەوە. وە یا ژنەکەی بەشو بداتەوە و خوینەکەی بۆ خۆی وەربگری. و منالەکانیشی چش کە خویری ئەبن.

جا بەرام بەو بەم روداوانە مروف ناتوانی کە بریاری ئەوە بدات کە حەمەرشیدخان پیاویکی ئینقلاب چی و سیاسەت گیر و تی گەیشتو ئەبوە بەلام لەبەر ئەو روداوانە وەکو تایەی ئوتومبیلی گیرخواردوی لی هاتبو کە تەنیا هەر بە دەورەی خۆیا ئەسورایەوە پیشکەوتنی بو ئەنەکرا.

سودی خقمەتی حەمەرشیدخان

حەرەکاتەکەی حەمەرشیدخان لەسەر شیوەیکی عشائری بو ئەنخرابو قالبیکی مدنیەتو نیشتمان پەرستی. بەلام هەنگاویکی بەرز بو لە ریگای کوردایەتی وە ناسینی یان بە وەلاتان.

ئەو هەنگاوە پشتیوانی شورشەکانی کوردی ئەکرد وە بو وەلاتانی رون ئەکردەوە کە کوردەکان هەمیشە حسی ئینتقامیان هەیە وە بو تولە ساندنەوەی خۆیان ئامادەن وە داوای مافی ئەتەوایەتی خۆیان ئەکەن.

دیسان ئەو شورشە بو بە هۆی کە لە هەموی ناوچەی کوردی ئیران ئیستقراری دەولەتی ئیران تیک بچی بو مودەی چەند سال وە ئەخشەی هەمو ئیران بگورەری لەو ماوەیەدا و ئیران دوچاری چەند ملیون زیان بکات.

دیسان بەسەرهاتی حەمەرشیدخان بو بە هوی ئەوەی کە قازی محمد دروست بی و دەوریکی سیاسیانە لەسەر حسابی روسەکان بیک بی ئی. چونکە

ڕوسەکان لە دوای ناهومیدی حەمەڕشیدخان قازی محمدیان دۆزیەوە وە لەگەلیا پێک هاتن.

لە دەوری چوارەما ـ ئەو ئەمارەتە بچکۆلانەی کە حەمەڕشیدخان لەبانە و سەردەشتا پێکی هێنا . زۆر زۆر دەورێکی بالای ئەبی لە مێژوی کوردا. کە لە ژێر ئیحترامی حکومەتی ئێرانا بەم دەستورە سەربەستی و سەربەخۆیەتی بو ئەو کوردانە پێک هاتوە

( لە دەوری دوهەما )

چونی حەمەرشیدخان بو ناوچەی مهاباد و ایران

لەسەر بەلێن و بڕیاری کە حکومەتی عراق لەگەل حەمەڕشیدخانی کردبو کە سالێک لە کرکوک دابنیشی. حکومەتی عراق بە تاریخ ۲/۱۲/ ۹٤٥ حەمەرشیدخانی هینایەوە بو سلیمانی. بەم هیوایە کە لە مەرزی عراقا بیکا بە کوسپەیک لەسەر ریگای شیوعی و بلا بونەوەی نفوزی دیکراتیەتی قازی محمد.

بەلام وا دەرکەوت حکومەت بو ئەم باسە باوەری بە حەمەرشیدخان نەکردبو و نظریەیان دەرحەق بە گورانە بو. بۆیە لە ڕۆژی ۹٤٥/۱۲/۲۳ بە حەمەرشیدخانیان ڕاگەیاند کە بو مەودای ٦ مانگی تر بچێتەوە بۆ کرکوک.

ئەمجا حەمەرشیدخان لە هەمان ڕۆژا ژنو مالەکەی ناردەوە بو پێنجوین وە خوشی لە شەوی ۲۳ /۱۲/ ۹٤٥ دا بە یارمەتی شخیم لطیفی شیخ محمود لەگەل [مامە بلەی برایدا] بە هاوەدەنگي قادر آغای سپیارەی پیاوی شیخ لطیف لە کاتی [۲] شەوا بە ڕیگای شارباژێرا بەرەو دی [گولە و بهی] کەوتنە بزوتن وە لە عین ڕۆژا گەیشتنەوە دی داروخان.

ئەمجا متصرفی سلیمانی [مارف جیاووک] بو دەر دەستی حەمەرشیدخان کەوتە پیلان و داو دانانەوە. وە خۆی شخصیا لەگەل پولیس و سەربازا چو بو پێنجوین بو گرتنەوەی حەمەرشیدخان.

بە هۆی شیخ قادری چوریسە و حمە امین بگی گولی ـ زۆر باری ئالوگوڕ

کرد. بەلام حمەرشیدخان ئیمانی بە بەڵێن و ووتەکانی متصرفی ناو براو نەبو.
ئەمجا متصرف کە لە گەڕانەوەی حمەرشیدخان ناهومێد بو دەستی کرد بە هەڕەشە کردن وە ئەی ووت بە حمەرشیدخان بڵێن کە ئەو پڵینگ بی من شێرم. ئەگەر خوی ئەدا بەدەستەوە حرەکاتی عسکری ئەکەمە سەر و دیهاتەکانی ئەسوتینم.
ئەمجا حمەرشیدخان لە ڕوژی ٩٤٥/١٢/٢٥ دا بە ٢٥٠ نەفر لە کوڕ و برا و خزمو پیاوەکانی خوی بە دەستوریکی پر چەکو نارایش ڕوی کردە مهاباد ڕوژی ٤ کانونی دوهەم ٩٤٦ گەیشتە دی [تورکەمان کەندی] ناو عشیرەتی فیض الله بگی کە سعاتو نیویک لە (بوکان) دورە لەبەر ئەوەی کە منیش هەر دەست زەدەوە برینداری دەست مارف جیاووک متصرفی سلیمانی بوم. بە مرسومی حیانەتی ئەمنی عام ژمارە ٥٦ بو ساڵی ٩٤١ ساڵیک حکمی زیندانی بەسەر دابوم لگل ساڵیک دور خستنەوە لە لوای سلیمانی. وە دەرکرانم لە وەظیفەکەم بەناوی لەسەر دست کاری سیاسەت و تیکدانی خوشی گشتی. جا بە ناچاری ساڵە بەندیەکەم تەواو کرد. وە پیش ئەوەی کە دور بخریەوە لەگەل آغای حمەرشیدخانا ڕێک کەوتین. کە هەر دوکمان بچین بو ئیران. بەلام لەبەر بی وەلاخی ئەم توانی کە لە هەمان شەوا لەگەل حمەرشیدخانا سلیمانی بەجی بیلم.
شەوی ٢٦ مانگی ناوبراو منیش بەریگای [ئورکی. گولی. سیران بەند وە ناوچەی سەرشیوا لە هەمان ڕوژی ٩٤٦/١/٤دا سێ سعات پیش حمەرشیدخان گەیشتمە دی تورکومان کندی.
لشکری ئاغای حمەرشیدخان وەکو خوارەوە بەسەر دیهاتەکانی عشیرەتی فیض الله بگیدا دابەش کرا.
١ - حمەرشیدخان و مجید خان وە انور بگی کوری لەگەل منو قازی عبدالرحیم و هندی لە خزمو پیاوەکانی کە ٣٠ نەفەر ئەبوین لە دی تورکومان کندی ماینەوە هەتا ڕوژی ٩٤٦ /٤/٥ میوانی آغای محمود خانی شجیعی روڵەی خاوەن شەرافەتو هونەرمەند بوین.

٢- حەمە امین خانی قادرخان زادە ـ لەگەل هەندی پیاوی لەدی [ انگیجەی] بوکان میوانی برای بە شهامەت احمد خانی خسرەوی ] بو

٣- علی بگی قادرخان زادە ـ لە دی دوکچی ـ میوانی کریم خان ـ بو

٤- عبدالله بەگی سەرحدی ـ لە دی گزل ـ میوانی بەریز حسام ـ بو

٥- حمو عزت بەگ ـ لە دی یەک شەوە میوانی علی بەگی شیرزاد و حمە امین بگی شکارچی ـ بون.

٦- باقی لشکرەکە بەسەتر دیهاتی خوارەوە دابەش کرا

١- دی البلاغ ـ مالک عزت خان و محمد خان دادخواه

٢- حصار ـ سعید لشکر

٣- بوگەبەسی ـ حسن خان و حبیب الله خانی بداقی

٤- شاری کند ـ محمد امین بەگ و ابراهیم بەگ فیض الله بەگی

٥- دی یاغلوجە ـ محمد بگی بابەخان بەگی فیض الله بگی

٦- بەردەزەرد فیض الله خان و حمە حسین خانی امیری

٧- کلتەکە ـ احمد خانی شجیعی

٨- یاسی کند ـ عزیزخانی ئازاد خواه

جا لەو دیهاتانەدا ئەو ٢٥٠ نەفەرە بو مەودای دو مانگ لەلاین آغاواتی سەرەوە پەزیرایی وە خذمەت کران. بەراستی عشیرەتی فیض الله بگی پەروشتیکی زور شەرافەتمندانەیان بە جی هینا. هونەر و پیاوەتی ئەو عشیرەتە بە هیچ بارێک ناشیرەریتەوە. کردەوە و ریزیان لە هەمو باریکەوە جیگای ستایش و سپاسی بی پایانە. کورد ئەبی شانازی بە عشیرەتە نجیبەیەی بکا کە بەم ئەندازەیە لە ویلی میوانداریدا خاوەنی فەر و سروشتن.

وە بیجگە لەوەش ئەم عشیرەتە خاوەنی گیانیکی پر لە احساساتی کوردایەتی و خویندەوارین. وە لە بارەی رابواردنو عیاشی و زەوقەوە لە هوزیکی ئوروپایی ئەکەن کە دیلی هیچ وینە یاسا و بەرهەڵستیکی قەدەغە و قورغ نەبن.

بەتای بەتی محمود خانی شجیعی ـ کە بە ٣ دانگی دی تورکمان کندی

توانی له مەودای سێ مانگا خواردنو خواردنەوەی سێ جەمی بو حەمەرشیدخانو دەستە و دایرە و میوانەکانی بکات کە بە تیکرایی روژی [ ٧٠ ] کەسی نان ئەدا.

هەر چەندە کە هەندیک لە ئاغایانی فیض الله بەگی دەستی یارمەتی یان بو محمود خان راتەکیشا بەلام مصرەفی ئەو آغایە شەرەفدارە لەوە نەبو کە بە یارمەتی ئەو بگزادانە شتیکی وها لە سەرشانی محمود خان سوک بکات.

بە هەمو مەعنایکەوە خذمەتی ئەو آغایە لە میژوی ئینسانیەتا ریزیکی بەرجەستە و هونەرمەندی هەیە بە نسبەت ئەو روژ و زەمانە.

بەریەرەکانی گەورک و دی بوکری لەگەل آغای حەمەرشیدخان

بە گەیشتنی حەمەرشیدخان بە ئیران. آغایانی گەورک دیبکری کەوتنە راپوردان بو قاضی محمد و وسەکان کە وا حەمەرشیدخان بو تیکدانی حرەکەی کوردستان هاتوە بو تیران وە پولو پارەیکی زوریشی لە لاین انگلیسەکانەوە پی دراوە کە بەسەر عشائرەکانا دابەشی بکات.

هەتا قاسم آغای کوری حاجی بایز آغای ایلخانی زادە لە سەر غرەزکاریکی لەمەوبەریان لە روژی ٩٤٦/١/٣ دا خو کو کردنەوەیکی عشایری و پیشمرگەی لە بوکانا بە ئەنجام هینا ئەگەر حەمەرشیدخان بچیتە بوکان تقەی لی بکەن.

بە چونی حەمەرشیدخان بو ئیران آغایەکانی ئیران غەوغا و جولەجولیکی گەورەیان تی کەوت

چونکە حەمەرشیدخان لە ئیرانا ناو و پایەیکی بلندی هەبو. بە بونی ئەو آغایەکانی تر نفودیکی چەندانیان نەئەبو. جا بو پاراستنی بەقای مەرکز و دەست رویشتنی یان نەیان ئەویست حەمەرشیدخان جی گی بی.

بەتای بەتی [ حاجی بابە شیخی زەمبیل ـ کە لە بەسەرهاتی شهری وەروە [ لەسەر ئیسقاتو راووروتی سقز کە بە دل شکاوی ئیرەرابووە مالی خوی وە بەشی باشی پی نەدرابو. ئەو لە هەمو کەس پتر لاین گیری ئەوە بو کە

حمەرشیدخان نکەویتە بەرچاوی قازی محمد و ڕوسەکان.

وە بەشیکی حزبەکانی عراقیش لەسەر ئەو باوەڕانەی کە لەمەوپیش بە عرضم گەیاندن لە دژی حمەرشیدخان ئەدوان.

هەتا ڕوژنامەی ژینی ژمارە ٨١٦ بلاوی کردەوە ـ حمەرشیدخان بۆ کوێ چو. هەردی دڕی و پیاچو. یا خوا حمەرشیدخان بەتەنافی سیاسەت بە خنکاندن بچی. حمەرشیدخان بو خیانەت چوە بو ئیران ئەوەکو بۆ خذمەت.

جا لە زور لاوە دەرگای پروپاگندە لە دژی حمەرشیدخان کرابوە حمەرشیدخانیش بە گەیشتنی ئیرانی. هینتیک کە بریەتی بون لە ئاغایاتی ـ احمد خانی فاروقی ـ احمد خانی شجیعی ـ قاضی عبدالرحیم ـ ناوانی نارد بو [میاندواوو] ساپلاغ بو لای نوماز علی ئوف و قاضی محمد ـ

بەلام لەبەر ئەوەی کە لەم کاتەدا ئەو ڕاپور و نوسینانە تاسیری کردبوسەر دەماغی سلطانی ناو براو. هەر ئەوەندەیان وەلامی ئەو هەیئتە دابوە. هەتا ئەشعاری ئاخر ـ ئاکامی دوایی ـ ئەبی لە دی تورکومان کەندی دابنیشی حمەرشیدخان بە دلشکاوی و غمگینی وە بە بی هیوا و ئومید هەتا ٥/ ٤/ ٩٤٦ لەو دی یە مایەوە. هەمو سینما و رابواردنی حمەرشیدخان بریەتی بو لە ـ سید عزیز] ناوێک کە وا بلاو بوبوو کە ئەو سید عزیزە شیتە و لە پشیلەش ئەترسی لە ڕاستیدا لە پشیلە ئەترسا کە ناوی پشیلەت هینا بایە وەرت ئەگەڕای بە پیلاقە و چەپۆک.

زۆر جار پشیلەیان نیشان ئەدا. ئەگەر نەیان گرتایە لە خانوی دو نهوم خوی فڕی ئەدایە خوارەوە.

شیتێکی عاقڵ پەسین بو. ڕەووشت ڕابواردنیکی زور خوشی هەبو هەمو لەشی هەر پی کەنین و قسەی قوشمە و جەفەنگ بو ـ

مروڤ بەناچاری بە قسەکانی ئەو پی ئەکەنی. ئەی ووت من دوژمنی خوم ئەناسم بەهەر ناویک ناوی بی نن ئەزانم مەبەست تان دوژمنەکەی منە.

پلێن کلک درێژ ـ گوێ قوت ـ چاو بز ـ توک نەرم ـ پرخ پرخ کەرە ـ بەلام مەلێن پشیلە. بەناوی پشیلە پەست ئەبم چونکە خیلی پشیلە بە تایفەیکی بی

حەمەرشیدخان لە دژی حکومەتی عراقە. وە ئەو بەند و باوەی کە تا ئێستا بڵاو کراوەوە درویە.

ئەمجا حمە حسین خانی سیف بە بەرواری ٩٤٦/١/٢٦ هاتە دی [گول] چاوی بە حەمەرشیدخان کەوت و تامیناتی تەواوی دایی وە لە روژی ٢٤ شباطی ٩٤٦ دا حمە سعید خانی هرمابون ـ کە خوارزای قازی محمد بو بو رەفعی هەندی گومان و نیشکالات هاتە دی [تورکومان کندی ـ وە بە بەرواری ٣ مارتی ٩٤٦ میرزا خلیلی خسرەوی نازر خەرجی هیزی مهاباد موژدەی تەواوبونی کاری بو حەمەرشیدخان هینا.

لە روژی ٥ مارتی ٩٤٦ دا فەرمانی جولان بە حەمەرشیدخان درا کە تورکومان کندی ـ بە جی بیلی بچیت دی سراو سەرچاوە بگری ـ کە ئەو شوینە بە نسبەت ئەو روژە جیگایکی زور پی ویست بو. چونکە خەتیکی فاصل بو لە نیوانی هیز و حکمی قازی محمد و حوکمی تهرانیەکان. بە گیرانی ئەو شوینە ئەستیرەی بەختی حەمەرشیدخان لە ئاسمانی مهابادا کەوتە گەشە و پرشنگ دان دوبارە طبلی قارەمانی و سەرچلی بو آغای حەمەرشیدخان لی درایەوە. تازە بە تازە ناوی فرمایندەیو سەر لشکریەکەی بە گوی نیرانیەکان گەیشتەوە. خوشەویستنی کی زوری لە دلی خەلکی مهابادا پەیدا کردەوە. بەلام آغایەکانی ناحەزی بەم رووداوە خوش وەخت نەبون.

دەست پی کردنی حەرەکات لە ناوچەی سەقزا

حەمەرشیدخان بە تاریخ ٩٤٦/٢/١٣ هیئتیک کە بریەتی بون لەو ناوانەی خوارەوە ناردنی بو لای قازی محمد بو وەرگرتنی دەستوراتی حەرەکەت.

١- حمەامین خانی قادرخان زادە

٢- احمد خانی فاروقی

٣- محمود خانی شجیعی

٤- میرزا محمد امین مەنگوری

قازی محمد تامیناتی تەواوی دا بەم هیئتە کە لە مانگی نیسانی ٩٤٦

ناموس و چەپەڵ ئەزانم هەر چەندە ئیمە ئەو سێ مانگەمان بە سید عزیز رابوارد. بەڵام ئەویش ئەو مجامەلە و هاونشینیەی حەمەرشیدخانی بۆ بو بە خیر و بەرەکەت وای لی هات هیچ شایک وە بوکیک بە بی سید عزیز نەکری هومو بوکیک ئەبو سید عزیزی پیشرەو بی لە هیچ شایو بوکیک لە ٥٠٠ تومان کمتری پارە پی نەنەگەیشت. بەڵام هەر روژیک رابواردن لەگەڵ ئەو سیدە عنتیکەیەدا ٥٠٠ تومانی ئەهینا ئەو بەزمەی لە هەموی خوشتر بو. لای هەر کسیکەوە دانیشتبا ئەگەر باسی پشیلە بکرایە. بە بی تاوان کابرای تەنشتی راست ئەبووە وەری ئەگەرایی بە شەقو پێ لاکە.

ئەی ووت ئەگەر تو پیاوی چاک بای ناگاداری منت ئەکرد ئەت ئەهیشت باسی پشیلە بکەن هەتا من ئەرویشتم.

خیزانی حەمەرشیدخان

لەپاش ئەوەی کە ئاستاندار ] مستصرفی سلیمانی لە گەرانەوەی حەمەرشیدخان ناهومید بو. بو ئەوەی کە دورخرانەوەی ژنو منالەکانی تاسیر بکاتە سەر شعور و فکری. وە لەو فکرە بابداتەوە.

عائلەی حەمەرشیدخانی لەگەل ژنو منالی حمە امین خانی برای وە کور و پیاوەکانی دور ئەخاتەوە بو پینجوین. وە لەوی ئەیانخاتە ژیر چاودیری پولیسەوە. وە بە ٩٤٦/١/١٨ لە لاین قائیمقامی هلبجەوە بیان نامەیک بڵاو کرایەوە. ئەگەر حەمەرشیدخان ئەگەریتەوە بو عراق. خیزانەکەی لە پینجوین دور ئەخریتەوە.

وە سزای لەوە قورس تریش ئەوە بو کە مخفری پولیس یان ناردە [ داروخان ] و دی شیوەگویزان ] وە هەمو ئەساساتیکی حەمەرشیدخانیان خستە ژیر دەستی میری وە حەمەرشیدخان لە وەڵامی قائیمقامی هلبجەدا نوسیەوە کە من شەرافەتی ملیم لە راگواتنی خیزان بەلاوە پیروزترە.

جا گوازتنەوەی ژنو مالی حەمەرشیدخان و هەڵە و غڵەتی معروف جیاوزکی ئاستاندار ـ بو بە هوی ئەوەی کە بو هەمو لایک رون بیتەوە کە چونە ئیرانی

حەرەکات دەست پی ئەکری.

بە تاریخ ٥ نیسانی ٩٤٦ دا [٢٠٠] نەفەری چەکداری بارزانی بەسەرپەرستی میر حاج و مصطفی خوشناو و بکر آغا ـ گەیشتنە سەرا و سەرچاوە و دی احمد آوا

بەرە بەرە لە ناوچەی شنو و لاجان ـ هیزی بارزانی ئەهینرانە سابلاغ وە بە ١٠٠ فیشک و تفنگیکی برنەوی دریژ ئەخرانە ژیر چەکەوە. وە فیشک دانیکی پربیان] لەگەل جوتیک پیلاوی لاستیک ـ ئەدرایی وە ئەنیرەرانە جبهە.

بەم تەرزە لەشکری بارزان لەو ناوە دا گەیشتە ١٢٠٠ نفر وە بە ترتیباتی خوارەوەش لشکری عشائرەکان کو کرایەوە.

١ ـ احمد خانی فاروقی بە ٢٥٠ نفری فیض الله بگی لە دیهاتی یەک شەوە ـ بەردە زەرد ـ سرچاوە ـ لشکربەزیان پی کرا.

٢ ـ حسن خانی بداقی عظام الملک ـ بە ١٠٠ نەفەرەوە لە دی سەرا

٣ ـ حسین ئاغای قاجر و محمد آغای [داربەسەر] بە ١٠٠ نەفەرەوە لە دی منديل بەسەر ـ و کوچک ـ قوچاغ ـ دامەزران

٤ ـ احمد آغای عباسی دیبکری ـ بە ١٥٠ نەفەرەوە لە دی تبت ـ گاریزە ـ لشکر بەزیان پی کرا.

٥ ـ احمدی حاجی بایز آغا و سلیم آغای محمود آغا و قاسم آغا و مارف اغا ناوانی دیبکری بە ٤٠٠ نەفەرەوە لە دیهاتی بوکان کولتەپە کوچکی خوارو ـ دامەزران.

٦ ـ کیوانی ئالتونو سلیمان کندی ـ ملقرەنی ـ بیژینگ بەسەر لە لکی ٤ بارزانی بکر آغای حویزی مسئول کرا.

٧ ـ کیوی بالوقا] و ئەترافی احمد آواش ـ لە فەرماندەی (١) بارزانی ئاغای مصطفی خوشناو ئەناسرا

٨ ـ کەلی سەراش ـ لە فەرماندەی هیزی (٢) بارزانی آغای میر حاج

مسئول کرابو.

بەلام لەبەر ئەوەی کە حمە حسین خانی سیف چوبو بۆ تاران بو ریک کەوتن لەگەل ئیرانیەکانا. لە هەمو لایک حرەکات راوستا بو لەبەر ئەوەی کە لشکری عشائرەکان هەمویان جوتیار و فەلاح و خەلکی کاسب کار بون وە بە زور هینابویانن بو جبهە. لەبەر دریژەی کات لشکرچیەکان بی تاقەت بوبون. وورەیان بەر دابو.

بارزانیەکانیش لەبەری جیگا و ریگای ناهەموار زوریەیان نەخوش کەوتبون. [قورنتینەی] تندروستی یان بو داهینابون.

لشکری حمەرشیدخانیش لەبەر روتوقوتی و ناگوزیری وە سەررای ئەوەش کە هیندیکیان لە عراق مالیان بە دیل برابو بو پینجوین ـ ئەو شتانە زور وەرەزی کردبون. لشکری آغای حمەرشیدخان دەستیان کردبو بە هەلاتن وە گەرانەوەیان بو عراق لە ۲۵۰ نەفەرەوە تەنیا ٤٠ کەسی بە دەورەوە مابو وە لشکری دیکریش بە بهانەی ئەوەی کە حمەرشیدخان فەرماندەی لشکرە وە نایانەوی سەری خذمەتی بو دا بنەوین. بە یەک کەرەت وازیان لە جبهە هینا.

جا ئەو کەم وورەی و برسیایەتی و نەخوشی و بی هیوایەتی یە بو بە هوی کە لشکری ئیران وەکو ماری سر وە خوی بکەویتەوە وە دەست بکات بە بی ئو گرتنو پەلاماردان.

شەری بکر اغا و میر حاج لەگەل لشکری ایرانا

لە روژی ۷ مانگی اوردی بهشت ۳۲٥ کە ریکەوتی ۲۷/ نیسانی ۹٤٦ ئەگرد دەستە و دایرەی ایلخانی زادەکانی دیکری بە ۹۰۰ سوارەوە بوکانیان خستە محاصرەوە وە پردی [میراوای] نیوانی بوکان و میاندوایان سوتان.

فەرماندەی هیزی بوکان ـ آغای اصحابی ـ داوای یارمەتی لە حمەرشیدخان کرد. ئەویش سعیدزادەی فەرماندەی هیزی سابلاغی لەگەل وهاب آغای رەواندزی و هەندی نفراتی بارزانی نارد بو کومەگیان.

بەلام لەبەر ئەوەی کە وەکو ئیتفاقی لە نیوانی ئیرانو دی بوکریەکان کرا بو

که له هەمان ڕۆژدا ئیرانیەکانیش پەلامار بدەن. و لەو ڕۆژەدا ئیرانیەکان هیچ خونیشاندانێک یان نەکرد. دی بکریەکانیش ترسیان لی پەیدا بو لشکرەکەیان بەتاڵ کردبووە.

بەلام له ڕوژی ۲۹ نیسانی ۹٤٦ دا له سعات ۱۱/۱٥ دقیقەی پیش نیوەڕو ۸۰۰ نەفەری سەربازی ئیرانی بە هەمو وەسائیلیکی جەنگیەوە لەژیر فەرماندەی لشکری ٤ سنە سەرتیپ همایونی وه سەرهەنگ خسرەوی ـ له ژیر نومایشی دو فروکی کشافیدا بەناوی مانور ـ رەتل المسیر ـ وە لەناکاو له کیوانی ملقرەنی ـ وبیشرینگ بەسەر ـ وە نوردوگای سەرایان دا بەر توپ. لەبەر ئەوەی کە لە لاین هیزی دیکراتەوە نومیدی حەرەکاتیکی وا دزیو مخنەتانە نەنەکرا. چونکه پەی دەریەی فەرمان بلاو نەکرایەوە کە نومایندەکانمان له تاران ئەورو پەیک بە ئاشتی و ریک کەوتن ئەو ناخوشیه چاک نەکەن. جا خەلکەکە له خوی ئەمین بوبوە. وه پشتیندی بی ترسیان لی کردبووە.

جا له بیستنی دەنگی توپەکان خەلکەکە شەپرزەیکی بەسەرا هات بەلام حەمەرشیدخان بە هەوڵ و تەقە له دیوانخانە دەریەری وه دڵ خوشی لشکرچیەکانی دایەوە

لەگەل احمد خانی فاروقی و عبداللەخانی سرحدی و حسین آغای قاجر و حسن خانی بداقی ـ خەریکی ئەوە بون که بچن بو پیشوازی ئەو جەنگە بەلام له هەمان کاتا فرماندەی هیزی بارزانی لکی [ ۲ ] میر حاج بە چەند نەفەریکی بارزانی وه هاتە لای حەمەرشیدخان و ووتی،

خانی بەڕیز تو فەرماندەی لشکری. لەبەر ئیتصالی هیزەکان نابی مقری بارەگا چۆڵ بکەیت. من لەگەل هەندی له نەفەراتی بارزانی ئەچم بە پیری ئەو شەرەوە. وه بە خوینی سەری خوم بلێنت ئەدەمی هەتا دو سعاتی تر دوژمنت بو بەشکینم. وه بە شەرەفی کوردیش سویندت بۆ ئەخوم هەتا گیانم لەبەردا بی ناهێلم دوژمن پی بنیتە کەلی سەرا ـ

بەڕاستی روحیەی بەرزی میر حاج بو بە هۆی گەشانەوەی وورەی ـ لشکری

حەمەرشیدخانو ئاغایان.

میر حاج بە ٣٠ نەفەرەوە چو بە هاواری ئەو برایانەی کە لەگەل نهروی ئیرانا پشتیندی نەبەردیان بەستبو. وە لە هەمو لایکەوە خۆیان خستبو ناو ئاگری گوللەی سەربازی دەولەتی ئیرانەوە.

لە کاتیکی ئاوا گرنگ و سام ناکا. کە لشکری سەرا بە هیوای کوچ و ڕەو بون. میر حاج نوسراویکی بو حەمەرشیدخان نوسیبو. کە چەند تفریک بنیری بو کەلی سەرا. کە خەوگایەکەوی کەلی سرایان بو گلەبان بکەن بو ئەوەی نیشک چیەکان بو خوشی تیارا بەن. بو تقویەتی گیانی لشکرچیەکان حەمەرشیدخان نوسراوەکەی میر حاجی بو خەلکەکە خویندەوە

لەوە سەیرتر ئەوە بو سێ نەفەری نەخوشی لە لشکری بارزان کە [حجری صحی] یان بو دانابون، یکێک یان ناوی [عدو] بو کە گوی یان لە تەقەی توپەکان ئەبی لە قورینتینەکە دەر ئەپەرن.

هاتن بو لای حەمەرشیدخان وتیان دەستورمان پی بدە ئەچین بو شەڕ حەمەرشیدخان وتی ئیوە نەخوشن نابی بچن. ئەمانیش وتیان ئیمە هەر ئەوەندە نەخوش بوین هەتا گوی مان لە دەنگی توپ بوە. ئیستا [عەلەم] مان لی نەماوە. بە بی دەستوری حەمەرشیدخان چون بو جبهەوە دەفریای شەڕ کەوتبون.

مخابراتی فەرماندەکانی جبهە لەگەل حەمەرشیدخان

بو فەرماندەی هیزی بوکان و منطقەی سەرا آغای حەمەرشیدخان ئەمرو دوژمن لە سعا ١١/١٥ پیش نیوەرو بە هیزیکی ٨٠٠ نەفەریەوە. بەرەو [کەلی سەرا] وە بنکەکانی من لە پیشکەوتن وە حەرەکەت دایە. ئیستا من لەو پەری خەتەرام. بەلام بە پشتیوانی خوا و گیانی هوزی کورد. هەتا دوا تنوکی خوینم ناهیلم دوژمن پی بنیتە کەلی سەرا. کە زەفەر بە مەبەستی کونە پەرستی یەتی خوی بەری وە دەستوراتیش تان چیە بوم ڕون بکەنەوە.

بکر      لە کەلی بیشرینک بەسەر

بو فەرماندەی لکی ٤ بارزانی ئاغای بکر آغای حویزی بەڕیز بەو پەڕی ئامادەی و شادی مەوە سپاسی هەستی پر لە شەرافەتی خۆتو برا بارزانیەکانتان ئەکەم. بە ئازایەتی معجزانەی خۆتو برایەکان پیشمرگەت سەر بەرزم. وە بە شەرافەتی پیشەوای بەرزی کورد و کوردستان پشت ئەستورم کە جاریکی تر دوژمن ئاتلی ئارەزوی چەپەلی خوی نەبیتەوە. خوتان رابگرن بو لە ناوبردنی دوژمن. پی ویستیش تان بە چەکو‌مەگیک هەیە هەتا بوتان بنیرم. سپاسی بی پایانی من بە برا بارزانیەکان رابگەینە. داوای پیشکەوتن تان لە خوا ئەکەم.

قادرخان زادە محمد رشید

فرماندەی هیزی بوکانو ناوچەی

بو فەرماندەی هیزی بوکانو سەرا آغای حەمەرشیدخان بەڕیز

هیزی دوژمن بەرەو ڕوی کیوانی [ ملقرەنی] و بیژینک بەسەر و کەلی سەرا ـ کەوتونەتە جونبوش. وە لەگەل هیزی کاک بکرا کەوتونەتە شەریکی گەرم.

ناوچەی من جاری لە حرەکاتی دوژمن دورە. دەستورم بدەری هەتا وەکو بهاواری کاک بکرەوە بچم. سویندیشت بو ئەخوم جاریکی تر ئالای سی ڕەنگی کوردستانی ئازاد سەری دانانەوی ازنم بدە یا منیش لەو غەزایە پیروزە بی بەش نەبم. وە [دوربینەکەی] خوشتم بو بنیرە

مصطفی خوشناو

لکی (١) بارزانی لە احمد آوا

بو فەرماندەی لکی (١) بارزانی کاک مصطفی خوشناوی بەڕیز

دوژمن ناتوانی ئەو قابلیەتە بەکار بی نی و بیتە ناو وەلاتی کوردستانی ئازاد گراو. لشکری کاک بەکر و میر حاج وەکو شیر بەرام بەری دوژمن راوەستاون. تەکانو تەووژمی دوژمنیان بی تین کردوە. تو هەر لە احمد آوا و کیوی بالوقا] بی نەوە هەتا دەستوری ثانی. زور زور سپاسی گیانی تیشتمان پەرستیت ئەکەم. سلاوی گەرمی من بە هەمو برایانی بارزانی رابگەینە. ئەوا

[ دوربینەکەشم بو ناردی هیوام وایە پی تەماشای لاشەی شکاوی دوژمن بکەیت.                قادرخان زادە حەمەرشید

فەرماندەی هیزی بوکان و سەرا

ئەمجا میر حاج لە ئالتونی خوارو و کیوانی ملقرنی و سید ناوا خۆی گەیاندبو امدادی هیزی بکە آغا. وە بە هەمەتی هەر دو لا لشکری دوژمنیان لە سعات ٦/٣٠ پاش تیوەرو زور بە ناشیرینی شکاندبو بە [ ١٣٠ ] نەفەر سەربازی کوژراو و ٣٩ نەفەر سەربازی دیل لەگەل ٦ رشاش ٢ صندوق دەنەمیتی دەستی دو دەستگای تلفونی هیلی فەرماندە ٤٠ تفنگی برنەو [ ٥ ] دەمانچەی برنەو لەگەل چەند کەلوپەلیکی جەنگی دوایی یان بەم شەرە هینابو.

بارزانیەکان شەریکی زور قارەمانانەیان کردبو. بەتای بەتی کاک محمد امین امیرخان ـ و کاک مامند مسیح ـ و کاک ساکو کە سەرلقی ئەو هیزە جەنگ ناوەرانە بون.

ئەو شەرە بو بە هۆی اثباتی راستی حەمەرشیدخان و ئاشکرا بونی نازایەتی بارزانی وە غرور بونی قازی محمد بە هیز و تەوانای لشکرەکەیەوە.

لشکری دیکریش کە لە [ میراواو حەمایان ] کوبونەوەیان هەبو لە بیستنی شکانی لشکری حکومەتی ئەوانیش بلاوەیان بە لشکرەکەی خویان کرد. حەمەرشیدخان ناکامی ئەو شەرەی بە [ بلاغی ] ژمارە (٣) و راپوری ژمارە [ ١٠٧ ] و روژی ٣٢٥/٢/١٠ ( ٩٤٦/٤/٢٠ ) عەرزی وزارەتی جەنگی کوردستان کرد.

## دابەش کرانی هیزی دیکرات لە ناوچەی سقزا

بە بەرواری ٩٤٦/٥/١ سەرکردەی لشکری بانە ـ عبدالله بگی سرحدی ١ - و مجید خانی حەمەرشیدخان زادە بە لشکرەکەیانەوە چون بو دی مەرخوز و سلسلەی شاخی [ گەرویشکە ] وە گەلی بنەوشە ـ قشلاغ ـ تموغە ـ دەست یان بەسەر ئەو شوینانەدا داگیشا کە بۆ حەرەکات قەدەغە کرابو.

٢- لشکری فیض الله بگی له ژیر فەرماندەی احمد خانی خلیل خان ـ ئەویش لەگەل لشکری بانەی دا ئەو شوینانەیان اشغال کردبو.

٣- حسن خانی بداقی و حسین ئاغای قاجر ـ چونه یازی بلاغ

٤- احمد آغای عباسی ـ چو بو ئاوایی [ سونج

٥- لشکری بکراغاش چو بو پیشەوە کیوەکانی قارەوای داگیر کرد

٦- میر حاجیش چو بو دی ئاخ کند و کیوەکانی

٧- وهاب آغای رەواندزیش ـ نیرەرایه آلتونی سەرو و کیوەکانی

دوژمن لەسەر ئەو شەرە مخنەتانەی منطقەی سقزی بە تەواوی دوراند. ریگای هاتوچوی میری لە نیوانی بانە و سقزا بە تەواوی هەل گیرا. بنکەکانی میری لە هەمو لایکەوە خرانە ژیر گەمارو پیش ئەو شەرە قازی محمد بلاوی کردبووە کە نابی لەکەلی سەرا تی پەر بکری. بەلام بە هوی ئەو شەرەوە لە هەمو لایکەوە ٣٠ و ٤٠ کیلومتر سنوربەزی کرا.

لەمەو پیش عرضم کردن کە ئیرانیەکان ویستیان بی نویک دروست بکەن بو دریژە بە مذاکرات وە نەگەیشتن بە ئاکامی ریک کەوتن لە تارانا بە برواری ٨ مانگی ئوردی بهشت کە نومایندەی آزربایجانو کوردستان بانگ کرابون بو مذاکرە.

ئەمجا دەولەتی ئیران قازی محمدیان ئاگادار کرد هەتا لشکرەکەی نەگەریتەوە بو ئەو شوینانەی کە لەمەوبەر لی بوە. ئیمە ئامادە نابین بو هیچ گونە ووتو ویژیک. چونکە ئیوە بە تاوانبار و خاوەن لاپەرەی رەش تەماشا نەکرین.

لشکری ئیمە بو [ وەرزشی مانوڕ] چویون بو ناوچەی [ ملقرەنی وە ئالتون ـ لشکری بارزانی هەر لە خویانەوە پەلاماریان داون وە خوین ریژیکی گەورەیان لەو ناوە پیک هیناوە.

ئەمجا قازی محمد لە سەر شکایەتی ئیرانیەکان بە تاریخ ٩٤٦/٥/٢ نوسراویکی بو حەمەرشیدخان نوسی کە پی ویستە زور بەپەلە بگەریتەوە بو ئەو شوینانەی کە پیش ئەو شەرە لی بوون.

فەرماندەی میواندواو ـ ئاغای نیسحاقی ـ بو ئەو باسە هاتە سەرا.

حەمەرشیدخان بە دەستوری خوارەوە وەلامی قاضی محمدی دایەوە و بە حاقیدا ـ بوی ناردەوە.

لەبەر ئەوەی ئیمە ئەو شوینانەمان بەشەر گرتوە. بو سەلامەتی ئەروی ردستان ناتوانین ئەو لەشکرە بگیرینە دواوە. چونکە ئەشغالاتی ئەو شوینانە ری ریگا برانی نیوانی هیزەکانی دوژمنە دوژمن بە هەلگرتنی ئەو ریگا و تی ل یەی لەگەل هیزەکانیا ناچاری پیک هاتن ئەبی لەگەل مانا.

ئەمجا بو تقدیر خدەماتی هونەرمەندی حەمەرشیدخان بە فرمانی ژمارە ۲۰. و روژی ۹٤٦/٥/۳ (۳۲٥/۲/۱۳) وزارەتی جەنگ روتبەی جنرال ایوری پی بخشرا. و ناویان لی گوری بە فەرماندەی هیزی بوکان و ناوچەی قز لە سەرا.

حەمەرشیدخان لە هەمان کاتا شکر و تقدیریکی زور بەتامو خوی وە ستایشی ئەفسەرە جنگاوەرەکانی ـ آغای بکراغا و آغای میر حاج و آغای صطفی خوشناو وە وهاب آغای نوسی بو قازی محمدی پیشەوای کوردستان.

اوای روتبە و مدالیای شەرەفی بو کردن بەرامبەر بە خەبات وە تی کوشانی ونەرمەندانەیان هەر یەکەیان بە دەرەجەی ـ پات پولکونیک وە یەک تەماتیر ۲٥۰ تومان دل خوشی کران. بەلام لەبەر ئەوەی کە تەماتیرەکان نوسراوەیان ەگەلا نهاتبو حەمەرشیدخان لەناوی بردن

**قاقەزی آستانداری سلیمانی**

آستانداری سلیمانی ـ حسن طالبانی بە گویرەی خوارەوە نوسراویکی لە حەمەرشیدخان نوسیبو.

ئەگەر حەمەرشیدخان بیتەوە بو عراق حکومەت تعقیباتی قانونی لە حق پیک ناهینی. بە مەرجی بی لاین داهنیشی باری هیمنی و ئاشتی بگری

حسن طالبانی متصرف سلیمانی ۲۸/ ٤/۹٤٦

بەلام حەمەرشیدخان لەو کاتەدا. لە بەرزترین جێگا و بەختیاری داپولە وەلامی نوسراوەکەیا کە شیخ قادری چوبە ـ هینابوی بێ ووت. جاریکی تر ئەو وینە نوسراوانەم بو مەهینە. چونکە من شەرەفی جنرالیەکەم بە دیلی دەست پولیس نادەم

**مەبەستەکانی حەمەرشیدخانو مەلا مصطفی لە ایران**

لە روژی ٢/٥/ ٩٤٦ ملا مصطفی بو سەرکەشی لەشکری بارزان هاتە سەرا وە لە ٦/٥/ ٩٤٦ دا چو بو ناو عشیرەتی دیبکری لە ژیر زەمانەتی عمیا ـ احمد آغای حاجی بایزاغا و قاسم آغا و سلیم حاجی محمود آغا و مارف آغا وئاورحمانی آغای ایلخانی زادەی لەگەل خویا بردبو سابلاغ ١

هەر یەکەیان بە وەزیفەیک لە حکومەتی قازی محمدا دامەزراند و عەلی آغای کولتەپە ـ و کریم آغای قون قەلای ـ بە ئەندامی ئەنجومەنی ئەیالەتی دامەزران. لەگەل دیبکریەکان زۆر بە مروەتانە جولایەوە.

بەلام حەمەرشیدخان ئەو ریکەوتن و قەدر گرتنەی دیبکری یەکانی پێ ناخوش بو. چونکە ئەی زانی هەر کاتی کەلێن وە یەک بیری لە نیوانی ملا مصطفی و دی بکریەکان پەیدا ببی نیوانی حەمەرشیدخانو ملا مصطفی تیک ئەچی. چونکە ئەو ئاغایانە ناهێلین حەمەرشیدخانو مەلا مصطفی بە یەکەوە بژین.

جا بەم وپەوە حەمەرشیدخان نوسراویکی نهێنی دور و دریژی لە ملا مصطفی نوسی بەم ووشانە خوارەوە.

کاک مصطفی

تو وەکو من نیهاد و کردەوەی عشیرەتی دیبکری ناناسی، آغایانی دیبکری بە ناوی دوستایەتیەوە خەراپە لەگەل حکومەتی قازی محمدا ئەکەن.

لە دواروژیشا دلی تو لە من ئەرەنجێنن وە بە تاوانی کۆنەی خۆیان ئەکەن. من وای بەباش ئەزانم هەتا ئەو ئاغایانە تەرکی ئیران پەرستی ئەکەن. ئەخرینە

بەرچاوی عطفەوە.

ئەو ئاغایانە لەناو محوەری علی آغای ئەمیر اسعد دان کە گەورەی هەمو لایکیانە. و علی آغاش ئیستا لە تاران خەریکی نەخشەکیشانیکی خەراپە لە دژی دیکرات

واش مەزانە کە لە غیرەز خذمەتی کوردستانی ئازاد لەو نوسراوەدا هیچ مەبەستیکی ترم ببی. تەنیا ئەوەندە ئەزانم کە ئەو ئاغایانە خراپو ئیش تیک دەرن. ؟

حمەرشیدخان لە هەوەڵەوە زۆر بە عشیرەتی بارزان ئەنازی زۆر بە هیوا بو کە جەبهەیکی یەک چلی لە نیوانی بارزانی وە بانەی دروست بکات. چونکە باوەری وابو کە عشیرەتەکانی ئیران رۆژیک قازی محمد ئیقناع فریو ئەدەن بو شکانی هەر دو لایان. وەیا لە رۆژیکا کە هەستی تی شکان بکری. لەوانەیە قازی محمد لەگەل ئیرانیەکانا ریک بکەویتەوە. حمەرشیدخانو مەلا مصطفی بەسەر گەردانی بمی ئەوە.

جا بو ئەوەی ەک بە هەر دو لایان رۆژیکی ئاوا بتوانن بەر هەڵستی هیزی حکومەتی ئیران بکەن و تەرز و شیوەی تشکیلاتەکە بپاریزن بۆ دوستایەتیکی ئاوا بە هێز بەتەما بو.

بەلام مەلا مصطفی زور باش گوی بو ئەو وینە ئەزەریانەی حمەرشیدخان شل نەنەکرد. پتر بو دوست و هاوری پەیاکردنی آغواتی ئیرانی لە تەلاشا بو.

ئەزەریەی مەلا مصطفی ش را بو کە جبهەیکی بە هیز و تین لە عشیرەتەکانی ئیرانی پیک بی نی. ئەگەر قازی محمەیش بیری ئاشت بونەوەی هەبی لەگەل ئیرانا. ئەو لەگەل عشائرەکانی باسکراوا ری بە حکومەتی ئیران بگرن ئەو شکلو مەرکەزە بپاریزن وە نهیلن کە ئیران تشکیلاتی حکومەتی بکاتەوە.

بەلام بەداخەوە. بیر و باوەری حمەرشیدخان چەسپاوتر بو فعلا قازی محمد لەگەل ئیرانیەکان ریک کەوتەوە. خۆی چو بە پیشوازی لەشکری ئیرانەوە.

وە ئەوەل کەسیکی کە پەلاماری شکستەی بارزانیەکانیشی دا ئەو حاجی

بایز اغای دی بوکری و آغاواتی گەورکو منگورانە بون کە ملا مصطفی پشتی پی بەستبون وە دەرەجاتو مەنسەبی بو وەر نەگرتن. لە هەمان کاتا مەلا مصطفی بە تەنها مایەوە نە قازی محمد وە نە عشائرەکانی دە فریا کەوتن. عشائرەکان ئەوەیان بەسەر هانی کە بەسەری هات.

لشکری شکاک بو دیهاتی دیبکری

حمەرشیدخان دەمیک بو هەستی بەوە کرد بو کە عشیرەتی دیبکری وە گەورک لەگەل حکومەتی ئیران لە ژیرەوە ریک کەوتوون. هەر کە گەیشتە سەرا ـ بو قازی محمد وە وەزیری جەنگی نوسی. لەبەر ئەوەی کە زور باوەڕ بە عشیرەتی گەورکو دیبکری ناکەم. بە پی ویستی ئەزانم کە دەستور بدەن لشکری شکاک بی نە جبهەوە لە دیهاتی ـ ناچیت ـ دوشتەپە ـ حمامیان ـ شیخ لەر ـ تازە قەلا ـ قولقولە ـ کانی دریژ ـ گلولان ـ دابەزن بو ئەوەی کە ئەو دو عشیرەتە لە هیچ کاتیکا نەتوانی بەرامبەر بە هیزی دیکرات هیچ سەرکەشیک بکات.

بەلام لەو کاتەدا نوسراوەکەی حمەرشیدخان بە چاویکی بی غرەزانە تەماشا نەکرا. هەتا حرەکاتی حکومەتی لە [قارەوا] دەستی پی نەکرد. یاداشتەکەی حمەرشیدخان بی نرخ مابووە. ئەمجا لشکری شکاک ـ زەرزە ـ پیران ـ مامەش ـ محالی شارویران ـ نیرەرانە جبهەی سقز و سەردەشت. وە بیر و باوەر بەرامبەری ئەو دو عشیرەتە کز هەلگرا.

شەری ئایچی لە نیوانی میرحاج و مصطفی خوشناو
و هیزی دەولەتی ایران

لە روژی ۱۹٤٦/٥/۲۰ (۱۳۲٥/۲/۳۰) دا حەمەرشیدخان داوا کرا بو سابلاغو سەرپەرشتی فەرمانی لشکر بە ئەمریکی رەسمی بە من سپیرەرا ـ نیرانیەکان ـ بە باوەری دوری حەمەرشیدخان بو هەل گرانی هیلی گەماروی ریگاکان. پەلاماری هیزی کاک میر حاج ئەدەن لە دی ئایچی. و هیزی کاک

مصطفى خوشناويش لە ناوچەی سید ناوا لە ٤ ب ظ و ٥ هەتا کاتی ٧ ی ڕوژآوا ئەو شەڕە گەرم بو. ئیرانیەکان سودیان لە تاریکی شەو وەرگرت وە هیزەکانیان گیرا بو دواوە. وە لەو شەڕەدا [سروان خسرەوی] لەگەل ٣٧ نەفەری سەرباز ئەکوژری

ئەمجا کیوانی نایچی وە مامشا ـ کە هیلیکی زور سەخت بون بەم ناوە وەچنگ لشکری دیکرات کەوتن. وە ناکامی ئەو سەرکەوتنە بە نوسراوی ژمارە ٢٩٥ وە روژی ٩٤٦/٥/٢١ پیشکەش بە وەزارەتی جەنگ کرا.

دابەش کرانی لشکر بو جاری دوهەم

لە روژی ٩٤٦/٥/٢٣ طاهرخانی کوری اسماعیل خانی سمکو وە نوری بەگی هەرکی ـ علي بگي شیرزادی فیض الله بگی چون بو دەورەی سەقز و سلیمان کندي ـ وە لشکری عبدالله بگی سرحدی و مجیدخانی رشید خان و احمد آغای عباسی ـ چون بو دی قباغلو و هیجانان ـ بو برینی ڕیگای گشتی.

محمد اغای اسماعیلی و سید فهیم ناوانی شکاک ـ نیرەرانە دی تموغە بو پاریزگاری ڕیگای لشکر

مینە قارەمان ـ کە یەکیک بو لە سەرپەلە ئازاکانی حمەرشیدخان ـ لە هەمان ڕوژا خەتی تلفونی نیوانی سەقز و بانە ـ ئەبری بە یارمەتی (لقەخانەی) چەتەی بەناوبانگ ـ تەلو [دەستەکو کەلوپەلی تلفونەکە دابەش ئەکەن بەسەر دیهاتی ئەو ناوەدا].

جا ئەو گەمارو دانو خەت برینە بە تەواوی فشاری بە حکومەتی ئیران هینا. ئەمجا دەرگای مخابراتی فیلاویان دامەزراندەوە بو هەلگرتنی ئەو ڕی بەندانیە.

بە هوی سەرەک کوماری ئازربایجان جعفر پیشەوەریەوە. پاڕانەوەی ئیرانیەکان گەیشتە قازی محمد. کە نومایندەی بنیری بو سقز کە لەگەل هیئتی لی کولینەوەی ئیرانیەکان وتوویژ لەبارەی مسببی ئەو پەلاماردانو مەرز شکاندنەیە بکەن.

ڕۆژی ٩٤٦/٥/٢٤ پات پولکونیک عزت عزیز معاونی زاتی ملا مصطفی و آغای جعفری کریمی ـ معاونی حربی وەزارەتی جەنگ و ابراهیم صلاح ـ مایور لەرماندەی هیز بی ناوەندی هاتنە سەرا وە لە پاش چاوپیکەوتنی حمەرشیدخان چون بو سقز.

لە ڕۆژی ٩٤٦/٥/٢٥ ڕاپوریکی دور و دریژیان بە ژمارە (١) سیار گەورک نوسیبو بو حمەرشیدخان. کە لشکری عمرخان چوتە سەر (پوسطی) میرەدی لەگەل سەربازەکانی حکومەتیدا بەشەڕ هاتون. ئەگەر بە پەلە عمرخان لەو فکرە قەدەغە نەکری ئیرانیەکان ئەتورین ناهینە ناو کوری وتوویژەوە.

حمەرشیدخان ناچار بو بە ژمارە ٢٣٦ وە ڕوژی ٢٥ مایس ٩٤٦ وەلامی ئەو هینتەی دایەوە کە بەلینی تەواو بە ئیرانیەکان بدەن کە عمرخان لەمەولا هیچ تی پەڕیک ناکا.

و بە ژمارە ٣٣٧ لە هەمان ڕوژا بو عمر خانیشی نوسی کە بە گورجی مسافەی بە ئەندازەی ٦٠٠ متر لە پوسطی میرەدی دور ئەکەویتەوە هەتا ئاگاداری دوهەم

وە هەمان باسیش بە هیزەکانی تر ڕاگەیاندرا. لە هەمان ڕوژا نوماینەدەکان دوبارە بو حمەرشیدخانیان نوسی بو کە ئەو هینتە داوای تی پەڕاندنی خواربار ئەکەن بو بانە و سەردەشت و داوای ناردنی سەربازی بی چەک ئەکەن بو مرکزە گەمارو دراوەکانیان. هەتا دوایی بەو وتوویژە ئەدری کە لە تاران لە نیوانی حکومەت و دیمکراتا پیک هاتوە.

بەلام لەبەر ئەوەی کە حمەرشیدخان لە فیلی ئیرانیەکان گەیشتبو بە ژمارە ٣٤٣ و ڕوژی ٩٤٦/٥/٢٦ بو قاضی محمدی نوسی کە ئیرانیەکان فیل مان لەگەلا ئەکەن کە داوای تی پەڕبونی خواردەمەنی و سەربازی بی چەک مان لی ئەکەن. من هەرگیز بو ئەو برپارە لە گەلانیم. قازی محمد بە ژمارە ٣٠٤٢ و ڕوژی ٩٤٦/٥/٢٧ (٢٢٥/٣/٦) وەلامی حمەرشیدخانی دایەوە کە منیش لەگەل ئیوە دام بو ئەو مەبەستە. هەتا دوژمن لە جبهەکان نەگەڕیتەوە بو دواوە نابی خوارباریان بو دەرباز بکری.

وورده شەڕیکی طاهرخانی سمکو

بە بڕواری ٩٤٦/٥/٢٧ لشکری طاهرخان و نوری بەگی هەرکی هێڵی هاتوچۆی نیوانی سقز و سنەیان بڕی بو. وە دەولەتی تیرانیش بو ئازادکردنی خەتی ئاوبراو لە ڕوژی ٩٤٦/٥/٢٨دا بە چوارسەت نەفەری سەرباز و ٢ تانک وە چەند توتومو بیلی زرەپوش چوبونە سەر تاهرخان لە ڕیگای ـ لکزی ـ تیزآوا کریم آوا ـ عارەب اوغلو ـ سنتە ـ صاحب ـ بە یارمەتی ٢٠٠ سواری تیلەکو و گلباخی وە.

ئەو لشکرە لەو شوینانەدا لەگەل لشکری طاهرخانا ئەکەونە شەڕەوە ئەو قولە شەڕە بە کوژرانی نەفەریکی شکاک و بریندار بونی نەفەریکی هەرکی وە کوژرانی ئەسپیک وە کوژرانی ٨ نەفەر سەربازی تیرانی و گرتنی دو ماشین باری و یەک شەصت تیر ـ دوایی هاتبو. ئەو ڕوداوە بە ژمارە ٣٦٩ و ڕوژی ٩٤٦/٥/٣٠ پیشکەش بە وزارەتی جەنگی دیکرات کرا.

هیزی دەولەتی تیران بو وەرگرتنەوەی ماشینە بەدیل گیراوەکان لە ڕوژی ٩٤٦/٥/٣٠دا پەلاماری هیزی طاهرخان وە نوری بەگ کە مشهور بو بە عباسی نژاد و حمە حسین خان وە رشید خانی هەرکی ئەدەن لەژیر نومایشی دو تانکدا. دوایی ئەو جەنگە بە کوژرانی ٦ نەفەری سەربازی تیرانی و بریندار بونی نەفەریکی شکاک وە وەرگرتنەوەی ماشینەکان هات.

تانکەکان کە ئەزانن لشکری طاهرخان چەکی دژی تانکیان پێ نیە بە بی ترس هەلئەکوتنە سەر لشکری طاهرخان وە ماشینەکان ڕائەکیشنەوە بو سەر ڕیگای گشتی.

بەلام بی فیشەکی ئەو ڕوژە وورەی شکاکەکانی بەر دابو. لەترسی پەلاماردانەوەی ڕوژی دوایی. لشکری طاهرخان کشابونەوە بو دواوە لە دیهاتی ـ نوبهار ـ قلندر ـ استحکاماتیان کردبو.

حمەرشیدخان بەو کشانەوەیان زور توڕە بو وونوسراوی بە ژمارە ٣٨٩ و٣٩٤ ڕوژی ٩٤٦/٦/١ بو طاهرخان و نوری بەگ نوسی

رونوسی نوسراوەکان

میژوی سەربازی ئەو کردەوەی ئیوەیە زۆر بە ئەنگ ئەزانی. کەوا بە بهانەی بی فیشەکی و نەبونی چەکی دژی فروکو تانک. هەلتان داوە بە دوژمن. وە ریگاکانتان بو ئازاد کردون.

کە ئەو روداوە بە تەواى لەکەیکی ناشیرین بەسەر میژوی کورد و ئالاکەی دا هیناوە.

بەتای بەتی کە عشیرەتی شکاک کە هەتا ئستا میژوی کورد بەمان جوانو نارایشت دوابو. زور جیگای داخە کە ئەو میژو پر شەرافەتەی شکاک بە هوی بی وورەیی تاهرخان بستریتەوە. جا بو ئەوەی کە ئەو لەکەیە ـ بە خوینی سەربازی شەرافەت مەندی شکاک بشوریتەوە. وە ئەو تاریخە پر شەرافەتەی اسماعیل خان هەر وەکو خوی بە جیگای شانازی و ستایشی هوزی کورد بمی نیتەوە.

پی ویستە بە گەیشتنی ئەو نوسراوە بگەرینەوە بو جیگای خوتان وە بە هەرزانو گران ـ پردی صاحب ـ تیک بدەن بو ئەوەی تانکەکان نەتوانن لە چەمی [ جەغەتو] بپرنەوە.

قادرخان زادە محمد

فەرماندەی هیزی بوکانو سەقز

بەراستی ئەو نوسراوانە تاسیریکی زوری کردبو سەر گیانی طاهرخان و نوری بیگ هەر دەست بە جی گەرابونەوە بو جیگای خویان. وەکو پیشو ریگاکانیان ئابلوقە دابووە.

بەلام هەتا دوایی پی ویست نەیان توانی بو پردی صاحب ـ بروخینن وە خویان لە بەلای تانکی ئیرانیەکان دور بخەنەوە.

لە روژی ١٩٤٦/٥/٣٠ دا حاجی بابەشیخ سەرەک وزیرانی کوردستان هاتە سەرا لەگەل منافی کریمی وەزیری خویندەواریدا. چون بو سەقز بو وتوویژی روبەرویی. بەلام لە ١٩٤٦/٦/٢دا بە بی سەرکەوتن گەرانەوە بو سابلاغ.

خیزانی حمەرشیدخان کە بە دیلی براپونە پینجوین ـ بە گویزرانەوەی ناستاندار مارف جیاووک ـ ئەو خیزانە بەرەلا کرابونەوە بو شوین و جیگای خویان. لە ترسی ئەوەی کە ئەوەکو جاریکی تر دیل بکرینەوە. هەلات بون بو ئیران. بە گەیشتنی یان بە وەلاتی ئازاد کراوی کوردستان قازی محمد دی بەکانی حما آغای عباسی پی بەخشین. بەناوی پەزیرایو ریز لی نانەوە.

عبدالله بەگی سەرحدی و سەرهەنگ غفاری

لەبەر ئەوەی کە پوستی میرەدی ـ لەلاین هیزی بانەیەوە فشاریکی زور بە تین درابو لە روژانی ۹و ۱۰و۱۱/۶۷/۹٤٦ چەند تقە و توقیک لە نیوانی دەستەی ئازادی خواهان و دەستەی ئیران پرستەکان روی دابو. و فروکەکانی میری بە زوری ئەهاتنە سەر هیزەکانی دیکرات وە بە رەشاش تیرەبارانیان ئەکردن. وە خواردنی فیشەکیش یان بو مخفرە گەمارو دراوەکان بەر ئەدایەوە.

فەرماندەی هیزی میرەدی سەرهەنگ غفاری ـ ئەفسەریکی زور آزا و لی هاتوی ئیران بو. عبدالله خانی سەرحدی) بە رەوشتی خوارەوە لەگەل سەرهنگ غفاریدا گەوتبو مخابراتەوە. کە داوای تسلیم بونی لە سەرهنگ غفاری کردبو.

۱- هیچ گونە چەکیک لە سەربازان و گروهبانان و فەرماندە و ئەفسەرەکانتان وەرناگیریتەوە

۲- بە دەرجەیک ترفیع ئەفسر و فرماندە و ئەفەراتو گروهبانەکانتان لە لشکری دیکراتا توظیف ئەکرین.

بەلام سەرهنگی ناوبراو لە بەرامبەر بەندەکانی عبدالله بگا بە تەرزی خوارەوە وەلامی دابووە.

اولا ـ روحیەی سەربازی منعم ئەکات کە بە بی کوژران وە گرتن گوللە تسلیم ببم. شەرافەتی مەیهن پەرستی سەربازی لەکەدار ناکەم کە خوم بکەم بە دیلی چەتە. بەلام تو کە خوت بە کەسیکی ئیران نژاد ئەزانی واز لە براکوژی بینە هەتا ئیمەش پی ویستی شا و مەی هەن پەرستی ئیرانی بەکار بی نین.

سەرهەنگ غفاری و ڕاپەڕینی

ڕوژی ۱۳/۶/۹٤٦ (۳۲٥/۳/۲۳) چەند نەفەریک سەربازی دوژمن بە پشتیوانی دو تانک بو بەرەلا کردنی خەتی گەمارودراوی میرەدی ـ لە سەقزەوە هەڵ ئەکوتنە سەر دەستەی میر حاج لە (ئایچی) دا وە لە هەمان کاتا سەرهەنگ غفاریش لەگەل هیزەکەیا لە پوسطەکەیان دینە دەرەوە پەلاماری هیزی بانەی ـ و محمدی جوانمردی ـ ئەدەن لە ناو دی میرەدیدا.

هەتا نزیکی ڕوژئاوا لە نێوانی ئەو دو هێزەدا شەڕ بە گەرمی ئەکری لە ڕوژئاوادا لشکری دەوڵەتی بە بی هیچ سـ ـرکەوتنیک ئەکشیتە دواوە هیزی میرەدی ۲۰ نەفەریان ئەکوژری و هیزی سقزیش بە ۷ نەفەر کوژراو میدان چوڵ ئەکەنەوە.

بەلام لە شەوی ۱٤/٦/۹٤٦ دا باتەیەکان زور بە توندی بو هیزە گەمارودراوەکەی پوسطی دی ئەچن. و مجیدخانی حمەرشیدخان کە لەو کاتەدا وەکیلی فەرماندەی هێزی بانەی ئەبی. دەستورات ئەداتە چەند کەسیک کەلە تاریکی شەوا بە تەماتە خزیان بکەینە بن قولەی مخفرەکە وە لەوی سنگەر هەڵ بقەتن خویان بخەنە کەمینەوە. بە ئەوەی کە ڕوژ بووە میدان ئەدەن سەربازەکانی ئیرانی بچن بو ئاوهێنان وە ئەتوانن لە قەلاتەکە سەر بی نە دەرەوە. بلکو بە هێزی ئەو فشار و تەنگە پی هەڵ چنینە خویان بەدەستەوە بدەن.

پیش ئەوەی کە پیشمرگەکان لە خندق هەڵ کەندن ببنەوە. ڕوژ ڕوناک ئەبی. نەفەرەکان خویان لەو شوینە دا ئەمڵوسکین بەلام لەبەر ئەوەی کە استحکاماتەکانیان تەواو نابی لە قولەکە بەدی ئەکرین.

لولەی ڕەشاشی بی مروەتانەیان بەسەرا شوڕ ئەکەنەوە ئەو پیشمرگە ئازایە جوانانەی خوارەوە شهید ئەکرین.

۱- رشید بەگ ۲- شیخ حسین ۳- مینە بگی سلیم بگ ٤- فقە حسین - ٥- احمدی درویش حمەمرادی بانەی ـ ٦- محمدی فقە عبدالله ـ کندە سورەی ۷- مصطفی بگی محمد بگی بانەی.

محمود آغای کوری مصطفی آغای کیلەشینی کەلی خانیش ـ بریندار

نەکری.

جا بەراستی شهید کرانی ئەو پیشمرگانە بو بە هوی کە مروڤ بیتە سەر ئەو بریارە کە حەمەرشیدخانیش هەر وەکو عمرخانی شکاک وابوبێ تقدیری جێگای سختی دوژمن نەکردبێ کە سەراپا ئەو خطەیە شتیکی ناشیانە و نادانانە بوە.

چونکە لە شرینیکی ناوا [ ڕوتەنو چەپەکا ] لە غیرەز گەمارو دران و برسیایەتی و بی فیشەکی نەبێ هیچ شتیکی تر ناتوانی جیگایکی وا سەفت بەم تەرتیباتە مندالانەیە بگیری کە هیزیکی هەرە زور و جەنگاوەری تیا بوە.

غلطی عمر خانی شکاک و مجید خانی حەمەرشیدخان بو بە هوی ئەوەی کە سەربازەکانی ئەو مخفرە تشجیع بێن وە وورەیان بە هیز ببێ هەتا نهایە لەسەر شەڕ و برگری برون.

بروسکەیکی حمە حسین خانی سیف لە تارانەوە.

لە کاتیکا کە لشکری دیکرات بە تەرزی خوارەوە لە هەمو ناوچەیکی سقز و بانە و سەردەشتەوە نیستحکاماتی خویان کردبو.

١- لشکری عمر خان و سید لهیم و تمر خان و محمد آغای شکاک و شیرو و قوتیاس ـ لە سەرشیو و خورخورە وە تیلکو گلباغی وە ـ بو فرزەبرینی ناغایانی ـ محمود خانی روستمان و رشید دیوانی تازە قەلا ـ و حمە علی فیضە ـ رضا خانی کلهر مظفر خانی علی حبیبی تیلکو ـ علی خانی حمە ویسی تیلکو حمەعلی فیضەی گلباخی ـ محمود خانی ملە ـ و ئاغا صالحی سلطان پەناە ـ دامەزرا بون وە ڕیگای ئەو آغایانەیان بری بو کە لەگەل هیزی دەولەتیدا تی کەلی پیدا بکەن.

٢- حمە امین خان قادر خان زادە و قادر خانی نامرمردە و قادر خانی فرج خان ـ و نصرالله خانی روستمی ـ لە قولی بانەوە هەتا سنوری سردەشت وە کەلی خان و سەبەتلو ـ یان گرتبو ڕی بندانی دەولەتیان لەوناوە داهینابو.

٣- لشکری فیض الله بگی لە (هیجانانو) خیدەرەوە ـ خویان قایم کردبو

٤- لشکری گەورک کە بریەتی بون لە ئاغایانی بایزی عزیزاغا و کاک الله آغای حسن اغا و محمدی حسین آغای سوێناس رسول آغا ـ حما آغای قالوی ـ رسول آغا و امین اغای حاجی ابراهیم اغای گلۆلان. عمر آغای عباسی آغای خرخرە لە دیهاتی [کەس نەزان و] خرمتە] و [سلتە کلتو] دامەزرابون و جێگای خۆیان قایم کردبو.

لە هەمو لایک ناوچەی سقز و بانە و سەردەشت بەم دەستورە ئەمارو درابو هەتا سنە ڕیگا بەندان کرابو. جا بو هەلگرتنی ئەو ڕێ بەندانیە [ڕەزم ئارا رئیسی ستادی لشکری ئیران هاتە سقز. لە هەمان ڕوژا لە هیلی تەوریزەوە بە هۆی جعفر پیشەوەری وە بە ئیمضای حمە حسین خانی سیف لە تارانەوە بروسکەیک بە شیوەی خوارەوە درا بە حمەرشیدخان.

فرماندەی هیزی سقز و بوکان جنرال حمەرشیدخان

پی ویستە بە فەوری ڕیگاکان ئازاد بکەی. بو ئەوەی کە بە پەلە خواردەمەنی بگەینریتە هیزەکانی شاهنشاهی لە مەرکەزەکانیانا.

حمە حسین سیف قاضی

وزیری جەنگی کوردستانی آزاد لە تاران

ئەو تلگرافە روژی ١٤/٦/٩٤٦ (٣٢٥/٣/٢٤) گەیشتە سەرا. بەلام حمەرشیدخان گوی خۆی لەو تلگرافە کەر کرت. چاوەری ئەوەی ئەکرد ئاخوا لەلاین قازی محمدەوە تائید ئەکریتەوە یانا. و قازی محمد چ وێنە بەندیک بو ئەو مەبەستە بلاو ئەکاتەوە. وەکی بارزەنی وە سەرپەرشت کەری ئەو فەرمانە ئەبی.

هێزی دەولەتی لە ئاخر پلەی برسیایەتی و ئاخۆشی دا بون لەوە پتر نەیان ئەتوانی خۆیان لە محاصرەدا ڕابگرن جا حکومەتی ئیران هەراسان بوبو و ئازاد کردنی ڕیگاکان.

ئەمجا ئاکامی کوبونەوەی ئەو دو هینتە کە چوبون بو تاران بو دامەزراندنی ڕیگا و بارێکی ئاشتی. ئەو هیوایە گوڕا بە شەڕ و خوێن ڕیژی. چونکە هیزی

میری ناچاری یا رزگاری یا مردن بو بون جا بویە جەنگی خوارەوەیان پیک هانی.

### جەنگی قارەمانانەی کورد لەگەل هیزی رەزم ئارادا لە
### هیجانان ـ مامەشا ـ آیچی میرەدی و سنتە
### لە روژی ١٥/٦/٩٤٦ (٢٥/٣/٣٢٥)

شەوی ١٥ حزیرانی ٩٤٦ لە کاتی ٧/٤٠ دا هیزی دەولەتی شاهنشاهی لەژیر فرماندەی رەزم ئارای رئیسی ستادی ئارتەشی ئیران بە کومەگی ٣ فروکەی جەنگی و ٦ تانک و ٣هەزار نەفەری پرچەکی سوارە و پیادە لەژیر یارمەتی ٧ توپی کوە ئەفگەنی ـ جەبەلی ـ لە چوار لاوە هیزی دیمکرات خرایە ژیر پەلاماردانو هەلمەتیکی زور بە گور. هەتا کاتی ١١ روژ آوا ئەو جەنگە بە سامو خوینینە دریژەی بەست وە لە دوای سەعات ١١ لشکری ئیران بە بی هیچ سەرکەوتنیک بەناچاری ئەکشیتەوە بو دواوە.

#### قولی (١) شەر لە مامەشادا لەگەل مصطفی خوشناوا

بە ئەوەی کە خەتی گەمارو لە نیوانی سقز و بوکان و میاندواو هەلبگری. هیزی دەولەتی بە ١٥٠٠ نەفەرەوە پەلاماری استحکاماتەکانی مصطفی خوشناو ئەدەن لە مامشاە ـ کە ئەو قایم گایە هەر ١٠ دەدقیقە لە سقز دورە.

لشکری بارزانیش لەوکاتەدا تخمین ئەکران بە ٢٥٠ نەفەر. وە ئەو ٢٥٠ کە سەر بە سەر چەند بنکەدا بە دریژی ئەو شاخە دابەش کرابون خوشەویو مصطفی خوشناو بە دەستەیکی ٥٠ نەفەریەوە گەوتبو بەر هیرشی ئەو ١٥٠٠ سەربازە هەر چەندە کە لە هەمو لایکەوە شەر گەرم بو بەلام مەبەستی تای بەتی لشکری ئیران گەلگرتنی ئەو کوسپەی مصطفی خوشناو و خوشەوی بو کە مشرف بون بەسەر شاری سقزا

بە بی ورچان ئەو هەشت توپە قایم گاکانی مامەشای داهو بەر هیرشی توپ. تانکەکانیش بەبی راوەستان هەلیان ئەکوتایە سەر سەنگەری ئەو ٥٠

کەسەی کە وەکو پولا لەناو سەنگرەکانیان دارژا بون.

بە بی هیچ گونە بەزەی و مروەت سەربازە پرچەکەکانی ئیرانی هەلمەت یان ئەبردە سەر کاک مصطفی خوشناو و کاک [کبتان خوشەوی بو هەل قەندنی هیزی بارزانی لە ملقرەنی ـ آلتون ـ آخ کند ـ هەمو تەوانایکی شاهنشاهی روی کردبو هیلی رتیسی مامشاە ـ بەلام لەبەر ئەوەی کە هیزی قارەمانانەی مصطفی خوشناو و خوشەوی بەرامبەر بە هیزی شاهنشاهی هیچ نەشلژا بون. ئباتو مەردایەتی سەربازی بارزانی ـ هیوا و نەخشەی ئیرانیەکانی گوری بو. ئەو چەکو هیزە جمعەندەمیانەی ـ کە پز لشکری بارزان بەکار هینرا بو هیچ مەبەستیکی ئیرانی پی نەهاتە رو.

ئەو شەرە لە شەرەکانی ستالینگراد ـ خارکوف ـ روستوفی روسی ئەکرد کە بەرمابەر بە ئەلمانیەکان بە ئەنجام ئەگەیندرا.

سەرەرای هیزی دەشت و شاخیش فروکەکانیان بە بی پشودان تیرەبارانی مامەشا و دەوروبەری سەقزیان ئەکرد.

هیزی بکر آغا و نوری شیردل ـ وە هیزەکانی تریشی لەترسی ئەوەی کە لە هەمان روژا توشی شەر و پەلاماردان ببن نەئەویران کومەگی بو مصطفی خوشناو بنیرن. ئەوانیش هەر وا خەریکی خو قایم کردن بون ـ لە قارەوا و ملقرەنی ئالتون ـ آخ کندا هەتا نهایەت ئەو دو هیزە کومگیان بە مصطفی خوشناو نەکرد و هەتا نهایەت کاک مصطفی بەو ٥٠ نفرەی خویەوە برامبر بەو لشکرە زوردارەی ایرانە بربەرەکانی اکات.

***

**

*

<u>تێبینی:</u>

لێرەدا بەرگی یەکەم تەواو بو، درێژەی ئەو رواوانە لە بەرگی دووەمدایە...

# پێرست

**ئەم بەرهەمەی میرزا مەنگوڕی**

کۆمەڵە یادو بیرەوەریی و سەرگوزشتەی مێژوویە کەزیاتر باسەکانی بۆ سەردەمێکی ڕوناك لە مێژوی سیاسیی کورد تەرخان کردووە، مەبەستم سەردەمەکەی جەمهوریەتی کوردستانە (١٩٤٦). لەگەڵیاندا ڕوناکیی خستۆتە سەر گەلێ نهێنی و باسی شاراوەی ئەو ئەزمونە سیاسیە و بەدەرخستنی ڕۆڵی حمە رەشیدخانی بانە، نەك هەر لەمەهابادا بەڵکو لەبزوتنەوە چەکدارییەکانی تری پێش مەهابادیشدا.

خوێندنەوەی باس و خواسەکانی ئەم بەرهەمە بێ بەری نییە لە زۆر سەرچاوەی گرنگ و هەڵهێنجانی زانیارییەکان لێیانەوە. هەرچەندە مەنگوڕی ئەو سەرچاوانەی لە لیستەیەکی تایبەتیدا دەستنیشان کردووە نەك لەم بەرهەمەدا.

Sulaimany
2000